# بارودۆخی سیاسی كوردستان

## لەنێوان ساڵانی

## ١٩٠٥-١٩٣٠

---

نوسینی: عەبدولقادر شكاك

---

٢٠١٣

---

چاپی یەكەم

MARGARET CENTER

لەبڵاوكراوەكانی سەنتەری مارگرێت و

دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان

زنجیرە (٥٨)

ناوی کتێب: بارودۆخی سیاسی کوردستان لەنێوان ساڵانی١٩٠٥-١٩٣٠
نووسینی: عەبدولقادر شکاک
بابەت: مێژوویی
ساڵ و شوێنی چاپ:٢٠١٣-سلێمانی
هەڵەچن و وێنەی بەرگ: گەرمیان شکاک
پیتچنین: خەرمان عەبدولکەریم عەلی
نەخشەساز :سەرکەوت
چاپی: یەکەم
چاپخانەی: کمال-سلێمانی

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە(١٣٩٠)ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێدراوە



**سەرپەرشتیاری کتێب: مژدە عباس**

**لەسەر ئەرکی دکتۆر تەها ڕەسوڵ چاپکراوە**

**سودو سەرمایەی بڵاوکراوەکانی سەنتەری مارگرێت بۆ کەس و کاری شەهید و ئەنفالکراوەکانە**

# پێشکەشە بە:

- ڕۆحی پاک وپیرۆزی دایکم و نازداری خوشکم.
- شەفیقەخانی خوشکم کەهەموو تەمەنی خۆی بۆمن تەرخان کرد.
- خێزان .......و .......نەتەوەکەم.
- گیانی پاکی دکتۆر ئیحسان فوئاد.

# ئەم بەرهەمە

ئەم بەرهەمە زادەی بیری مێژوونوسە گەورەکانی خۆمان و نوسەرانی گەلانی ترن کەدوای سالآنێک شەونخونی و ماندوبونێکی زۆر لەم پێناوەدا بەشێک لەتەمەنی خۆیان بەخشیوە بۆ دەرخستنی ڕاستی ڕووداوە مێژوویەکان و ئاشنابوونی نەوەکانی داهاتوو بەمێژووی کوردودراوسێکانی و پێزانینی ڕەنج و قوربانی دانی کەسانی لەخۆبردوو بۆ بەدەست هێنانی ئازادی و دادپەروەری منیش بەپێی توانای خۆم.ئەو زانیاریانەی کەبەڕاستی یە مێژوویەکانم زانیوە دەیخەمە پێش چاوی نەتەوەکەم.وەک ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتیمانی تاخزمەتێکی بچووک بەمێژووی گەلەکەم بکەم بۆیە لێرەوە سوپاس و خۆشەویستیم بۆ گشت ئەو هاوڕێ ئازیزانەی کەهاندەرم بوون و هاوکاری یان کردم بەتایبەتی مامۆستا کەمال نوری مەعروف و مامۆستا حەسەن هەمزە و ڕەئوف ئەحمەد.

**هیوادارم تەمەنیان درێژبێت و نمونەیان زۆربێت.**

**عەبدولقادر شکاک**

2012/12/13

## ناوەڕۆکی ئەم بەرهەمە

## بەشی دووەم



## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم

## پێشەکی:

ماوەی چەند ساڵێکە کاک عبدولقادر شکاک دەناسم جاروبـاریش کەلـەلای دادەنیشم میوانەکانی لەسەر دۆزی کـوردو مێژووەکـەی بەدرێـژایی چـاخێک قسەو باسیان بەگەرمی دەڕوات .جاروبـار کـاک عبـدولقادریش دەچـێتە نـاو باسەکەوە ڕای خۆی دەگەیەنێت لەبارەی ئەو مێژووەو بەئـەنجام نەگەیانـدنی دۆزی کورد لەناو ئەو هەموو بزوتنەوانەی کە کورد بەدرێژایی ئەو سەدساڵەی بەرامبەر بەداگیر کەرانی کوردستان هەستاون و شۆڕشیانکردووە .زۆرجـاریش من لەو دەمەتەقێیانـەدا دەچـمە نـاو باسـەکانیان و ڕای خـۆم دەگەیـەنم لـەو ماوەیەوە هەتاکو ئەمڕۆش بۆم دەرکەوت کاک عبدولقادر پیاوێکی تێکۆشەری کـوردی نیشـتمانپەرورەو حـەزی بەگـەورەیی نەتەوەکـەیی و سـەربەخۆیی ولأتەکـەی هەیـە. زیـاتر لەمانـەش کـاتێکیش کەباسـی سـمکۆی شـکاک و عەشیرەتەکەی لێدەپرسیت وەکـو کەسـایەتیەکی نـاو ئـەو عەشـرەتە زانیـاری وردت پێدەدات کەهەندێکیان لەناو سەرچاوەکانی مێژووی ئەو بزووتنەوەیەدا دەگمەنەو باسـیان نـەکراوە . هۆکەشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی بـاوکی لـەو عەشیرەتەیەو خزموو کەسوکارەکەشی هەتاکو ئیستاش لەنزیکەوە چاوی پێیان دەکەوێت یان خۆی سەردانیان دەکات و بەسەریان دەکاتەوە لـەو ڕوانگەیـەوە کاتێک کە پێی ڕاگەیانم کە بەتەمایە لەسەر دۆزی کـورد لـەماوەی ئـەم سـەد

ساڵەی ڕابردوودا بنووسێت من لای خۆمەوە پیرۆز بایم لێکردو زیاتریش بوومە هاندەری بۆئەوەی باسەکەی تەواو بکات چونکە نووسین لەسەر مێژووەکەمان پێویستەو ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتیمانی یە کەنووسەران بچنە ناو مێژووەکەو ئەوەی تادوێنێ بەقەڵەمی ناحەزان لەکەدار کراوە ئەمڕۆ ڕاستی مێژووەکە نیشان بدرێت نوسەر لەباسەکەی دا بەپێناسەیەک چووتە ناو باسەکەوە کەزۆر زانیاری ووردی لەبارەی ڕووبەری کوردستان و سنوورەکەی و ئاماریی دانیشتووانەکەی داوە بەشێوەیەکی زانستی . کاتێکیش کە دێتە سەر بزووتنەوەکەی شکاک بەسەرۆکایەتی پێشەوا سمکۆ هەموو ئەو بارودۆخەی کوردستان دەخاتە بەرچاو و دەوری تورک و عەجەمیش بۆ زیاتر نەهامەتیە کانی کورد لەو بەشەی ڕۆژ هەلاتی کوردستاندا کەئامازەی پێداوە لەوەش زیاتر لەجەنگی جیهانی یەکەمیشدا کەکوردستانی گەورە واتە باشوورو ڕۆژهەلات و باکوور کەئاگری شەڕ دەیان گرێتەوە هیوایان بۆ ئەوە تەرخان دەکەن کەبتوانن بەپێی بەندەکانی ویلسنی ئەمەریکایی بە سەربەخۆیی کورد بگەن لەکوردستانی گەورەدا بەئارامی بژین بەلاٚم براوەکانی شەڕ کە هاوپەیمانەکان بوون کوردو پرسەکەیان کردە قوربانی بەرمیلێک نەوت و پارچەبوونیان لەدوای پەیمانی سیڤەر لە لۆزاندا گەیاندە جێ و کوردیان خستە ژێر چەپۆکی تورکی کەمالی و ڕەزاشای ئێران و عێراقی عەرەبی و

ئۆبالّی ئەمەش لە ملی ئەو زلهێزانەدابووەو .کوردیش بەهۆی نەخوێندەواری و نـەبوونی توێـژی ڕۆشـنبیر و دابـەش بـوونی کۆمـەڵگای کـوردی بـە پێی پێکهاتەکـەی دەورێکـی کاریگـەری لـەو ڕووەوە دروسـتکردووە کـە بزووتنەوەکانی بەزوویی بەرەو نەمان بڕوات . ئێمەی کورد لەناو ڕووداوەکانی ئـەو سـەدەیەدا شـتی زۆر سـەیرو سـەمەرە دەخوێنینـەوە لـەناو لاپـەڕەکانی مێژووماندا بۆ ئێستامان پێویستە وانەو عیبرەتیـان لێـوەر بگـرین بـەلأم ئـاخ و هەزار داخ ئەم گەلە قارەمانە ڕۆژگارێـک کەبەخۆشـی دەگـات هـەموو ئـەو ئازارانەی لەبیر دەچێتەوەو لەنێوان دۆسـت و دوژمنـی دا وانەکـەی پێچـەوانە دەکاتەوە مێژوو شایەتە لەقۆناغی بزووتنەوە کـەی سـمکۆی شـکاک و شـێخ مەحموود و شۆڕشی شێخ سـەعیدی پیـران و ڕاپـەڕینی بـەردەرکی سـەرای سلێمانی و شۆڕشی ئاگری داخ و هـەموو ئـەو شۆڕشـانە سـەرکووت کـران چونکە کورد دۆستی ڕاستەقینەی نەبوو بێگانەش بۆ مەرامی خۆی هەوڵی ئەدا وەکو ڕووسەکان لەشۆڕشی ئاگری داخ دا بەرامبەر بە کورد کردیان و ڕێگایان بە تورک دا لەخاکی ئەوانەوە پشت لە شۆڕشگێڕەکان بگرن باسەکانی ناو ئـەم کتێبە هەموو ئەو بابەتانەی لەخۆگرتووە کە بەپێوستی دەزانـم نـەوەی ئـەمڕۆ بەوردی بیان خوێنێتەوە تاوەکو لای خۆیانـەوە هێـز و گـوڕ بـەخۆ بـدەن بـۆ پاراستنی خاک و نەتەوەمان لەمڕۆدا کەداگیرکـەری دوێنـێ جـارێکی تـر بـە

ولأتمان شاد نەبێتەوە لەکۆتایی دا دەستخۆشی لەبرای نووسەر دەکەم کەتوانی بەوردی ئەوزانیاریانەی لەلای تۆمار بوون کۆمەڵێک زانیاری ناوازەمان پێبدات کە بۆ ئەمڕۆی کورد بەسوودن . هیوادارم دوا بەرهەمی نـەبێت و لەنووسـینی تردا بۆ خزمەتی کورد و دۆزەکەی بێبەشمان نەکات .

**کەمال نوری مەعروف**

نیسانی 2013

کوردستان ئەو وڵاتەی ئەمڕۆ ناوێکی گرنگە لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، دوای نکوڵی کردنێکی زۆر بۆتە ڕاستی یەکی حاشا هەڵنەگرو لەدیدی دۆست و دوژمندا خۆی دەسەپێنێ.هەرچەندە بەڕەسمی سنوری ڕاستەقینەی دیاری نەکراوە لەلایەن ئەو دەوڵەتانەی کە دابەشیانکردووە بەسەر خۆیانداو هەرپارچەیەکی بەسەر هەریەکە لەئێران و تورکیا و سوریاو عێراقدا دابەشکراوەو لەلایەن کۆمەڵی نێودەوڵەتیەوە بەبەشێکی فەرمیی ئەو وڵاتانە ئەژمار دەکرێت،ئەمەش لەهزرو بیری خەڵکی کوردستاندا بووەتە مۆتەکەو شۆڕشە یەک لەدوای یەکەکانیش ڕاستیی بێزاری خەڵکی کوردستان دەسەلمێنێت،کارکردنی وڵاتانی هاوسنوری کوردستان بۆ سڕینەوەی ئەو سنورە هەمیشە لەڕێگەی جۆراوجۆرەوە هەوڵی بۆدراوە ، دەرئەنجام ئەگەر باسی سنووری خاکی کوردستان بکرێت زۆر لەخەڵکی کوردستانیش بەچاوێکی گوماناوییەوە لێی دەڕوانن،بەڵام (شەرەفخانی بەدلیسی)لەساڵی (1596)زایینیدا سنوری کوردستان دیاری دەکات،کەلەگەرووی هورمزەوە بەرەو باکوری خۆرئاوا دێتە مەلاتیەوە مەرعەش،ئازەربایجان و ئەرمەنستان دەکەونە لای باکوور . موسڵ و دیاربەکر دەکەونە باشوری ئەو سنورەوە بەهەمانشێوە (ئەولیای چەلەبی)لەساڵی (1665)زاینییدا سنوری کوردستان لەباکورەوە،ئەرزڕۆم و هەکاری و جزیرەو موسڵ و هەریر تادەگاتە بەسرە بەحەفتا قۆناغ دەپێورێ و کە (420)کم لەباشور تێ دەپەڕێنێ،واتە بۆ هەر قۆناغێك (6)کم بووە،هەروەها (شەریف پاشای خەندان)لەساڵی(1919ز) هەمان باس لەکۆنگرەی ئاشتی دەوروژێنێ، کەکوردستان لەباکورەوە بۆ قەوقاز دەست پێ دەکات تائەرزڕۆم و چیاکانی ئارارات،جگە لەنوسەرەکانی کورد گەلێ نووسەری بیانی رای خۆیان لەبارەی کوردستانەوە هەبووە،وەك (شاکر خەسباك و ئەدمۆنس و مینۆرسکی و لازاریف و نیکیتین)،کەئەمانیش بۆچوونەکانیان لەگەڵ نوسەرە کوردەکاندا نزیکە.کەواتە ئەو سنورەی لەهورمزەوە دەستپێدەکات بۆ قەوقاز و ئەرزڕۆم وڵاتی کوردستانەو ئەو نیشتیمانەی کەپێکهاتەیەکی زۆر ئاڵۆزو گەلێ کەمەنەتەوەو گەلێ ئایینی جیاجیای تێدا کۆبووەتەوە،کە بووەتە جێگەی

سەرسورمانی ولأتانی دیکە جگە لەچەند ناکۆکییەکی کاتی و ڕووداتی کارەساتی بچووک کورد وەك نەتـەوە زۆرینـەی دانیشـتوانی کوردسـتان پێکـدەهێنێ لەهەنـدێك جێگـادا ئـەو ڕێژەیـە گۆڕانکاریی بەسەردا دێت،لە شارو شارۆچکەکاندا،ئەو نەتەوانەی لەکوردستاندا بوونیـان هەیـە (فارس و تـورك و عـەرەب و ئەرمەن)ن،ئایینەکانیش(زەردەشـت و جولەکـەو دیـان و سـابیئی و بەهائی).زەردەشتی وەك کۆنترین ئاین لەکوردستاندا دادەنرێت و بۆ چەند سـەدەیەك پـێش زایین دەگەڕێتەوەو ڕابەرەکەشی مرۆڤێکی مەزنی سەردەمەکەی خۆی بـووەو لـەدایك و باوکێك بووە بەناوی دوغزو باورست(گیان لە ئایینی زەردەشتی دا لەناوناچێ و دوای مردن هەسـت بـە خۆشی و ناخۆشـی دەکـات و دوایـی بـەرەوڕووی دادگـای یـەزدانی دەبێتـەوە دا لـەو دادگایـەدا چاکەو خراپەی دەخرێتە تەرازووەوەو بڕیاری لەسەر دەدرێت بۆ ئـەوەی گیـان بەبـەرزترین پلـە بگات دەبێت بەقۆناغی(بیری چاك و وتەی چـاك و کـردەوەی چـاك)دا تێپـەڕێت،ئاییتی جولەکە لەسەدەی (20)پێش زایین لەنێو خاکی ئۆرشەلیم سـەری هەلّداوەو مووسـا پێغەمبـەر ڕێبـەری ڕۆحی ئەم ئایینـە بـوەو پـەرتوکی پیرۆزیـان تەوراتـە،دیان (مەسیحیەت) بەشـێکی کۆمەلّگـەی کوردستانن و ڕابەرەکەیان (عیسای کوڕی مریەمە)،کەلەشاری بەیت لەحم لـەدایك بووە،کـەزیاتر لە دووهەزار سالّ پێش ئێستا بەزۆربەی جیهاندا بلأوبووەتەوەو پەرتوکی پیرۆزی ئەم ئایینـەش ئینجیلـــەو پێگــــەی بلأوبوونـــەوەی شـــاری (ئورفەیـــە) لەلایـــەن حەواریەکانـــەوە بلأوکراوەتەوە،ئینجیلیش بەمانای مزگێنی دێت پاشان ئیسلام ئایینی سەرتاسەری کوردستانەو بەتازەترین ئـاییتی دانیشـتیوانی کوردسـتان دەناسرێ لەسـالّی (637)ز بەرامبـەر بـە (16)ی کۆچیی ئەم ئایینە لەکوردستاندا بلأوبۆتەوەو پێکهاتەی ئایینی ئیسلام بریتی یە لە:"سوننەو شـیعە"،کەئەمەش گـەلێك لقـی لێ دەبێتـەوەو سـوننە لـەئاینزای (شـافیعی و مـالیکی و حەمبەلی)پێکهاتووە،جگـە لـەم ئاینزایانـە لەکوردسـتاندا گـەلێ ڕێبـازی جیـاوازی سـۆفیگەرێتی تێدایـە،وەك ڕێبـازی قـادری ،کەدامەزرێنەرەکـەی (شـێخ عبـدالقادری گەیلانی)یـەوە، هـەروەها (ڕێبـــازی نەقشبەندی)لەســـالّی (1811)زدا لەلایـــەن (مـــەولانا خالید)لەشـــاری ســـلێمانی

سەریهەڵداوە پاشان ڕێبازی (ڕوفاعی و ڕێبازی حەقە)کەداهێنەری ئەم ڕێبازە (شێخ عبدالقادری شەدەڵە)یەو ڕێبازەکەشی ڕێبازی یەکتایی یەو لەسەدەی سیانزەوە سەریهەڵداوە، شیعە،کەلەدوای سوننە لەکوردستاندا پەیڕەوانی زۆری هەیە، ئەمەش چەند لقێکی لێ دەبێتەوە،وەك (علی ئیلاهی)کە چەند بیروباوەڕ لەخۆ دەگرێت:(کاکەیی ، شەبەك ، قەڵەم حاجی ، بلورییەکان ، عەلەوی، قزلباش، ئیسناعەشەری، نیعمەتی) بیروباوەڕی یەزیدی کە دووکتێبی پیرۆزیان هەیە بەناوی (مەسفەحا ڕەش جەلوە)یەکەمیان:باسی حەلاڵ و حەرام دەکات و دووەمیان:باسی سەرگوزەشتەی دروستبوونی گەردوون دەکات ،بەم شێوەیە کوردستان وەك وڵاتێکی تەواو لەهەموو لایەنەکاندا پێکهاتەیەکی پڕو تۆکمەیەو مێژوویەکی دوورودرێژ لەهەموو بوارەکانی ژیانی ئایینی و کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی لەخۆدەگرێت و بەهەموو پێکهاتەکانەوە دەتوانین دانیشتوانەکەشی پۆلێن بکەین هەرچەندە ئامارەکان ئەو ڕاستیە نادەن بەدەستەوە کەجێگەی گومان نەبێت ئەو ئامارانەی لەکوردستاندا کراوە بۆ جاری یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (1831)زایینی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە بەدەستهاتووە. پاشان ساڵی(1876)بۆ جاری دووەم سەرژمێری کراوە،بەڵام ئەم سەرژمێرییانە ژمارەی ڕاستی خەڵکی کوردستان نییە، چونکە هۆکارەکان گەلێك زۆرن بۆ دورکەوتنەوەی خەڵکی لەناونوسکردن، مەبەستی سەرژمێری عوسمانیەکان لەکوردستاندا تەنیا بۆ ئاگاداربوون بوو لەژمارەی ئەو کەسانەی کەدەتوانن چەك هەڵگرن بۆ بەرەکانی شەڕ، کەهەمیشە خەڵکی کوردستان دوورە پەرێزبوون لە شەڕو ژیانی کشتوکاڵیان هەڵبژاردووە ئەمە هۆکارێکی سەرەکیە بۆ وەڵامی ئەوەی ئەو ژمارانە ڕاستیی نین،هەروەها بەشێکی بەرچاوی خەڵکی کوردستان ئاژەڵدارییان کردووەو کۆچەری بوون، بۆیە بەشێکی زۆر لەخەڵکی کوردستان ناونوس نەکراون، وە هەندێك جار بەشێکی خاکی کوردستان لەژێر دەسەڵاتی هیچ لایەکدانەبووە،کەواتە سەرژمێریش ئەمانی نەگرتوەتەوە ئەو سەرژمێرییانەش گۆڕانکاری خێرای بەسەردا هاتووە،دوایین ئامار کەلەکوردستان دەریدەخات تاساڵی (2000)کورد لەکوردستانی گەورەدا

(35247000)کەسە،وە ڕێژەی زیادبونیش(٪2,9) کەڕێژەیەکی باشە بەم پێیە تاسالّی(2009)ژمارەی دانیشتوانی کوردستان(45,497000)کەس بووە، بەلاّم بۆچوونی زۆربەی پسپۆڕانی ئەم بوارە زۆر لەم ژمارە زیاتر دیاری دەکەن،چونکە ڕێژەی لەدایك بوون لەکوردستان(0,047)ڕێژەی مردنیش( 0,026) بۆیە بەبێ دوودلّی ژمارەی دانیشتوانی کوردستانی لەسەرووی(50)ملیۆن دەبێت،کەدابەش بوون بەسەر (30)شاری گەورەو (91)شارۆچکەدا بەهەموویان وولاّتێك پێکدەهێنن،کە وولاّتی کوردستانە.بەلاّم ئەوەی جێی سەرسوڕمانە،نەتەوەیەك ئەوەندەی لەقوولاّیی مێژوودا بێت چەندەها سالّ لەم سەرزەمینە ژیابێت ،ئەبێ نهێنییەکە لەکوێدابێت، کەتائێستا دەولّەتی نەتەوەیی نییە؟؟. ئەم پرسیارە پرسیارێکی سادەیە،بەلاّم وەلاّمەکەی هێندەی پرسیارەکە ئاسان نییە،بۆیە پێویستە شارەزایان بەلێکۆلّینەوەی زانستی و مێژوویی وەلاّمی ئەم پرسیارە بدەنەوە.

# سەرهەڵدانی سمكۆ وەك سەركردەیەك

بەشەهیدكردنی جعفر ئاغای شكاك لە ساڵی 1905 قۆناغی یەكەمی بزوتنەوەی عەشیرەتی شكاك كۆتایی هات . دوای ئەوەی جعفرئاغا وەك سەركردەیەكی بەتواناو دلێر ناوی لەگشت وڵاتدا دەبیسترا و دەسەڵاتی قاجاری هەراسان كردبوو بۆیە بیریان لەوەكردەوە كەچۆن بتوانن هێمنی بكەنەوە تالەناوی بەرن لەسەر داوای والی تەوریز داوەت كرا بۆ دڵنیابوون لەنییەتی پاكی ئێران قورئانی پیرۆزیان بۆ محەمەد پاشای باوكی جعفرئاغا ناردو سوێندیان خوارد جگەلەڕێكەوتن و تێگەیشتن لەیەكتری نیازی خراپیان نیە تالەڕێگەی گفتوگۆو دانوستانەوە كۆتایی بێت بەو خوێن ڕشتنەی لەنێوانیاندا هەبوو. هەرچەندە جاری یەكەم چوونەكەیان بێ گرفت بوو.زۆر بەگەرمی پێشوازی لێ كرا، تەنانەت بەجۆرێ جعفر ئاغایان هێمن كردەوە كەبڕوای وابوو تەنانەت لەمەودوا ڕەنگەپێویستی بەپاسەوان نەبێت و، ژیانی پارێزراودەبێت .

هەرجارێك جعفر ئاغا بەشەقامەكانی شاردا دەڕۆیشت دانیشتوانی شار ئەمبەرو ئەوبەری شەقامەكەیان دەگرت و ڕادەوەستان بۆ بینینی ئاغای جوان و میرخاس و ناودار (1)، هێندە ناوبانگی ئازایەتی و جوامێری هەبوو كە هەموو كەس ئاواتەخوازی بینینی بوون. لەم هاتووچۆكردنەدا ئافرەتێكی ئەرمەنی بەناوی (هاسمیك)ی ئەرمەنی سەرنجی ڕادەكێشێ و بەهەمان شێوە ئافرەتەكەش شەیدای ئاغا دەبێت دوای یەكتر ناسین جعفر ئاغا بڕیاردەدات كە داخوازی بكات و ژیانی هاوسەری لەگەڵ پێكبهێنێ ، بەڵام داب و نەریت و ئایین دەبێتە ڕێگرو خاڵۆ میرزا پەشیمانی دەكاتەوە.

ئەوچەند ڕۆژەی لەتەوریز دەمێنێتەوە ژیانێكی تایبەتی دەبێت لەدواساتەكاندا دەچێتە ناو سەرای دەوڵەت بەمەبەستی گفتوگۆوو دانوستان.بەڵام لەژووری كۆبوونەوەدا زۆر نامەردانە تەقەیان لێ دەكەن و جەعفەر ئاغا شەهید دەكەن بەڵام هاوڕێكانی كە ئەركی پاسەوانی

جەعفەرئاغایان لەئەستۆ بوو زۆر مەردانە لێیـان دێنـە دەس و ژوراو ژوور لێپرسـراوانی دەوڵـەت ڕاودەنێن ئەوەی بەردەست دەکەوت دەیان کوشـت پاشـان سـەربانی یـەکێك لـەژوورەکان کـون دەکەن و یەك یەك ئەوانەی مابوون جگە لە جەعفەر ئاغاو دوو هاوڕێی شـەهیدبوون لاشـەکانیان بەسەر دەرگای (عـالی قـاپو)دا هەڵواسـران و ئـەوانی تـر دەربـازدەبن کەئەمـەش بـووە جێگـەی سەرسوڕمان بەچۆکداهاتنی دوژمن و داستانێکیان تۆمارکرد کە دەماودەم بگێڕدرێتەوە .

ڕۆژی دوایـی ڕۆژنامەناوخۆییـەکانی ئـازەری زۆر بەشـانازی یـەوە باسـی ئازایـەتی و جـوامێری هاوەڵەکانی جەعفەرئاغایان بەسەرکردایەتی خالۆ میرزا بڵاوکردەوە(2).

ڕۆژنامەی (نداو الشعب) ژمارە 294ڕۆژی 3تشرینی دووەم 1930 هەمان بابەتی بڵاوکردۆتەوە ئـەویش لـە گۆڤـاری (نییـەر ئیسـت)ی ئینگلیـزی وەری گرتبـوو، بەهـەمان شـێوە چـۆنیەتی شـەهیدکردنەکەو دەربـازبوونی هاوەڵـەکانی دەگێڕنەوە.بەشـەهیدبوونی جەعفـەرئاغا قۆنـاغی یەکەمی بزوتنەوەی شکاك کۆتایی هات.

# سمکۆی سەرکردە ڕۆڵی لەبزووتنەوەی کورددا

سمکۆ نـاوی تـەواوی (اسماعیـل محمـد علـی اسماعیـل ابـراهیم حـاجی بـگ ابـراهیم همـزه عەبدۆی)لەڕۆژهەلاتی کوردستان لەساڵی 1882 لەچاریَ لەخێزانێکی ناسراوو شۆڕشگێڕ لەدایك بووە(3) کەهەمیشە خێزان و بنەماڵەو عەشیرەتەکەیان ڕۆڵیان هەبووە لەناوچـەکەداو خـاوەنی بڕیارو جێگەی ئومێدی خەڵکی کوردستان بوون، هەندێك لەمێژوونوسان سمکۆ بەلـەدایك بـووی ساڵی 1875و هەنـدێکی تـر بەسـاڵی 1885بەشـێکیش بەلـەدایك بـووی 1895دەزانـن بـەلام هەرکامیان بێت بە کوشتنی جەعفەرئاغای برا گەورەی سمکۆ کۆتایی هات بـە قۆنـاغی یەکـەمی بزوتنەوەکەی شکاك ودەرکەوتنی سمکۆش دوای ئەو کارەساتە دێت کەبەسـەر بـرا گەورەکەیـدا هات .

ابراهیم صفائی دەڵێت کە جەعفەرئاغا کوژرا سمکۆ تەمەنی 16ساڵان بوو ،د جمال نەبەز دەڵێ سمکۆ لەسـاڵی 1875لـەدایك بووە،میسـیۆنێریکی دیکـە لەکوردسـتان بـووە لەیاداشـتەکانیدا بـەناوی(4) (simco Kurdish leder in Iran 1920) نووسـەرەکە نـاوی (HMACKENSEN) کتێبەکەی لە حوزەیرانی 1920چاپکردووە ،دەڵێ ساڵی 1917 داوەتی سمکۆ بووم بۆ نان خواردن ئەو کاتـە تەمـەنی 35سـاڵ بو.هەنـدێکی تـر دەڵێن کاتێـك سمکۆ شەهید بووە لەساڵی 1930 سمکۆ تەمەنی 48ساڵ بووە، بۆیـە بـەپێی ئـەو نوسـراوانە بێت دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە سمکۆی شـکاك لـەدایك بـووی سـاڵی 1882بـووە.دوای ئـەوەی جەعفەرئاغا لەساڵی 1905 بە نامەردانە

شـەهید کـرا، ئـەم کارەسـاتە وای لـەسمکۆ کـرد زۆر ڕق ئەسـتورانە بـیر لـە تۆڵەسـەندنەوە بکات.هەرچەندە محمد پاشای

باوكی لەژیاندا مابوو.سمكۆ چاوەڕوانی باوكی دەكرد تا بڕیاری كۆتایی بدات.محەمەد پاشا مەجلیسێكی پێك هێنا لەزۆربەی پیاو ماقولآنی عەشیرەتی شكاك بۆ ڕاوێژكردن كەچۆن وەلآمی شۆڕشگێڕانەی دوژمن بدەنەوە.لەمەجلیسەكەدا بڕیار درا نامە بنووسرێ بۆ گشت سەرۆك هۆزە كوردەكان(5). محەمەد پاشا لەنامەكەیدا دەلێ (من محەمەد پاشای گەورەی شكاكم هەموو لایەك ئاگادارن كە قاجارەكان بەفێڵ و تەڵەكە داوای دانوستان و گفتوگۆیان كردو جەعفەرئاغایان داوەت كرد هەرچەندە قورئانی پیرۆز لەنێوانمان دابوو كە خیانەتمان پێ نەكەن .ئێمەش لەبەر پیرۆزی قورئان بڕوامان هێنا بەلآم زۆر ناجوامێرانە لەكاتی گفتوگۆدا لەناوسەرای حكومەتدا جەعفەرئاغا و دووان لە هاوڕێكانیان شەهیدكردن و زۆر بێ شەرمانە لاشەكانیان بۆماوەی 3ڕۆژ بە بەر دەرگای سەرای دەوڵەتەوە هەڵواسین بۆ چاوترساندنی خەڵك بۆیە داواتان لێ دەكەم هاوكاریمان بكەن و بابە هەموولایەك دووژمن لەوولآتمان دەربكەین) ،زۆربەی سەرۆك عەشیرەتە كوردەكان بەدەم داواكەی محمد پاشای شكاكەوە هاتن و لەشكریان بۆ كرد،جارێكی تر شەڕو خوێن ڕشتن دەستی پێكردەوە لەچیاكانی(سۆما و برادۆست) بەلآم كەمی چەك و تەقەمەنی و خواردن و زۆری دوژمن شۆڕشگێڕەكانی ناچار كرد تەنها سێ مانگ بتوانن بەرگری بكەن و پاشان بڵاوەیان لێ كرد، محمد پاشا بەناچاری لەسەر سنوری توركیا داوای پەنابەریتی كرد،دەوڵەتی عوسمانیش بەم داوایە ڕازی بوو. بردیانە ئەستەمبوڵ جێ نشینیان كرد، پاشان دوای كوشتنی (ڕەزوان ئەمین پاشا)سەرۆكی پاسەوانی ئەستەمبوڵ كەئۆبالی كوشتنەكەیان خستە ئەستۆی (میر عبدالرزاق بەدرخان) بەم هۆیەوە زۆربەی بەدرخانیەكان ئاوارەی وڵآتان كران و محمد پاشاش گوازرایەوە بۆ دورگەی (ڕۆدس)ی یۆنان دوای ئەشكەنجەو ئازاردانێكی زۆر لەساڵی 1909شەهید بوو .بەشەهیدبوونی محمد پاشای شكاك كۆتایی بەشەڕو خوێن ڕشتن نەهات هەرچەندە بۆشاییەكی سیاسی گەورە لەنێو كوردەكانی ڕۆژهەلآت دروست بوو بەتایبەتی لە نێو عەشیرەتی شكاك دا.سمكۆ لەم كاتەدا وەك سەركردەیەك دەردەكەوێت ئەمەش بەو هۆیەی كە زۆربەی زۆری ئەندامانی عەشیرەتەكەی لە دەوری

کۆبوونەوەو پشتگیریان کرد. سمکۆ دەیویست بە دۆست و دوژمن بسەلمێنێ کە دەتوانێ سەرکردایەتی شۆڕش بکات هەرچەندە تەمەنیشی گەورەنەبوو بەڵام تەمەن نەبووە ڕێگری لە ئامانجە ڕەواکانی.مامۆستا کمال نوری مەعروف لەکتێبەکەیدا(سەدەیەك لەتێکۆشانی کوردی ئێران و بزوتنەوەی سمایل ئاغای شکاك)لاپەڕە 81 دا نوسیویەتی دوای کوشتنی جەعفەرئاغای برا گەورەی. سمکۆ منالێك بوو تەمەنی لە 10ساڵ تێنەپەڕیبوو ، ئەمە بووە هۆی ئەوەی عەشیرەتەکە سەردەمێك بێ سەرۆك بمێنێتەوە لەهەموو دەورو زەمانێکیشدا ئەگەر سەرۆك کەسێکی بەتواناو ئازاو سەرکەوتوو دبلۆماسیەکی لێزان بێت ئەتوانێت ڕۆڵی خۆی ببینێت و مێژوویەکی تازە بۆ گەلەکەی تۆماربکات)بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە نازانین مامۆستا کمال نوری مەعروف ئەم مێژووەی لەچ سەرچاوەیەك وەرگرتووە، لە هیچ کاتێکدا نەبیستراوە منالی 10ساڵان سەرکردایەتی بزوتنەوەیەك بکات کە درێژەپێدەری شۆڕشێکی کۆنتربێت ئەگەر چی ،لەو کاتەدا محمد پاشا لەژیاندابوە هەرچەندە ئەگەر تەماشای مێژووی ئەو عەشیرەتە بکەین پڕە لەسەروەری و قوربانی دان لەسەردەمی سمایل خانی مەزن دوای شەهید بوونی. عەلی خانی کوڕی سەرکردایەتی بزوتنەوەی یاخی بوونەکەی کردووە کاریگەری و بەهێزی عەلی خان وای لە دەسەڵاتی فەرمانڕەوای ئێران کرد کە بیرێك بکەنەوە بۆ لەناوبردنی. بۆیە (موزەفەرەدین)ی جێنشینی نەسەرەدین شا لەتەوریز پیلانێکی ڕێکخست .داوای کرد علی خان سەردانی بکات و بچێتەلای تا بیکات بە سەرکردەی ورمێ و تەوریز ئەویش ڕازی بوو دوای چوونەکە خێرا قۆڵ بەست کراولەبەندیخانە توند کرا تا لەژێر ئەشکەنجەدا مرد و کۆتایی بەژیانی هات .هەرچەندە هەوڵی زۆریش درا بۆ ئازادکردنی بەڵام هیچ سوودی نەبوو. دوای علی خانی شکاك دوو کوڕی لەپاش بەجێما، تەیموورئاغا و محمدئاغا پاشان ئەمانیش دەرئەنجامی ناکۆکی نێوانیان وای کرد دوژمن سوود لە ناکۆکیەکەیان وەرگرێ و دایان بمرکێنێتەوە. بەڵام محمد ئاغا بەهۆی سەرکێشیەکانی جەعفەرئاغای کوڕیەوە ناوبانگ و دەسەڵاتی زیادی کرد،لەساڵی 1889 نیکۆلای دووەمی قەیسەری ڕووسیا. داوەتێك ڕێك دەخات بۆ جەعفەرئاغا

و عبدالرزاق و بەدرخان و سەید تەهای شەمزینی ،ڕێزی زۆریان لێ گیرا هەرچەندە دوای علی خانی شکاک محمد ئاغا بەخۆیی و بنەماڵەو بەشێك لەعەشیرەتەکەی چووە لای تورکەکان لەناوچەی (باق) لەشاری (باشقەلا)نیشتەجێ کران و نازناوی پاشای پێ درا، پاشان گەڕایەوە ناوچەکەی خۆی و زۆرترین دەسەلاتیش لای جەعفەر ئاغای کوڕی بوو .تواناکانی جەعفەر ئاغا لە ڕادەبەدەربووە سەرکردەیەکی خۆشەویست بووە لای تێکڕای خەڵکی ڕۆژهەلاتی کوردستان ، بەتایبەتی لای چینی هەژاران دەڵێن زۆرترین دەستکەوتەکانی شەڕی دابەش دەکرد بەسەر خەڵکی هەژارو نەداردا تەنانەت لای ئەورووپیەکان بە(ڕۆبن هود)ی کوردستان ناوبانگی دەرکرد تالەڕێگەی گفتوگۆوە بۆ دانوستان لە تەوریز شەهیدکرا هەروەك ئامازەمان پێدا. بۆیە دەتواین بڵێین ئەو ڕۆژگارەی کە سمکۆ دەیویست خۆی بەخەڵکی وەك سەرکردەیەك بناسێنێ گەلێك سەخت و گران بووە تەنانەت نەك خەڵکی کوردستان تەواو بێزاربوون لەشەڕو ماڵ وێرانی بگرە خەڵکی ئێران خۆیان ئامادەکردبوو بۆ گۆڕانکاری لەڕژێمی دەسەلاتی ئێران دا.

# شۆڕشی مەشروتەوکاریگەری لەسەر کورد

کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیران و کەسایەتی و بازرگانەکانی ئێران هاوڕابوون لەسەر لابردنی محمد علی شای قاجاری ئەم بزووتنەوەیە لەساڵی 1905 دەستی پێکرد بەسەرکردایەتی سەید محمد تەباتەبائی و سەید عبداللەی بەهبەهانی کەهەردوولا ڕێك کەوتبوون لە دژی (صدری اعظم) خەبات بکەن وئەم ڕاپەڕینە لەمێژووی ئێران دا بە (شۆڕشی مەشروتە) بەناوبانگە کە تێکڕای چین و توێژەکانی گرتەوە و لەئێراندا بووە شۆڕشێکی میللی و لەچوارچێوەی خەباتی نیشتیمانی گشتی دا.یەکانگیربوو دکتۆر سەعدی هەڕوتی لەبزاڤی ڕزگاری نیشتیمانی لەکوردستانی ڕۆژهەلأتدا) لاپەڕە28 دادەنوسێ.

بزاڤی مەشروتە لەساڵی (1905-1911)(6) بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە هاوبەشەکان لەداسەپاندنی دەستوورو سنوردارکردنی دەسەلأتی ڕەهای پاشایەتی. زانیاریەکان ئاماژە بەبەشداری 30هەزار شەڕکەری کورد دەکەن لەهەردوو ناوچەی خۆی و ماکۆ لەدژی ئەو تاقمە چەتە گەرانەی کە دوژمنانی شۆڕش لەوێ دروستیان کردبوو ،هەروەها ئەو کوردانە یارمەتی گەورەیان دابین کرد بۆ ئەو شۆڕشگێڕانە لەناوچەکانی (ورمێ) و(مهاباد) و(سەلماس)کاریان دەکرد هەروەها دەستورخوازان ژمارەیەك ئەنجومەنیان لەشارەکوردیەکانی وەك(کرمانشان ورمێ، سنە،سەقز،بۆکان)دامەزراندلەنێو ئەمانەدا ئەنجومەنی (سەقز) چالاکترینیان بوو لەبواری داواکردنی مافە نەتەوایەتی یەکانی کورد لەئێران .شایەنی باسە ئەنجومەنی (مهاباد)بەسەرکردایەتی(قازی فتاح)ی کەسایەتی کۆمەلأیەتی و ئایینی بوو بەگشتی ئەنجوومەنەکان توانیان پارێزگاری لەهێمنی و سەقامگیری ناوچە کوردی یەکان بکەن).ئەوەی پێویستە لێرەدا هەلۆێستەی لەسەر بکەین ئەوەیە ئەو 30هەزار کوردە شەڕکەرە لەکوێوە هاتووە چونکە دکتۆر سەعدی هەڕوتی هیچ ئاماژەیەکی بەسەرچاوەکە نەداوە

ئەمەلەلایەك لەلایەکی ترەوە. خاڵی لاوازی سمکۆ ئەوە بووە کە بێ ئەوەی کەس داوای لێ بکات یاخود ڕێکەوتنێك نەبووە لەنێوان سمکۆو ئێراندا،ڕاستەوخۆ بە300 سوارەوە چووەبۆماکۆ بۆ پشتگیری (اقبال السلطنه) دژی دەستورخوازان ڕاوەستا پاشان لەئەنجامی ئەم پشتگیری یە دەسەڵاتی ئێران ناوچەی (قوتور)یان پێ بەخشی و کردیانە فەرمانڕەوای ئەوێ...

لێرەدا دەپرسین ئایا سمکۆ بە 300سوارەوە چۆن توانی بەرەنگاری ئەو هەموو کوردە شەڕکەرە ببێتەوە لەکاتێکدا ئەم بەشداری کردنەی سمکۆ ڕەنگە بۆ زیاتر خۆ دەرخستن بێت و تا بەخەڵکی کوردستان بڵێ من دەتوانم سەرکردایەتی عەشیرەتی گەورەی شکاك بکەم،بۆیە کۆکردنەوەی 30هەزار چەکدار لەڕۆژهەلاتی کوردستان کارێکی هەروا ئاسان نیە تەنانەت لەشۆڕشەکەی سمکۆدا زۆرترین شەڕکەری کورد لەدەوری کۆبوونەوە لە 10هەزار تێ پەڕی نەکردووە کە تووشی شکست هاتووە تەنها هەزار کەسی لەدەور ماوەتەوە ئەوەی تری بڵاوەی لێ کردووە.

زۆر لەنووسەران و مێژوونوسان لەسەر شۆڕشی مەشروتە نوسیویانە هەریەك بەجۆرێك مامۆستای کۆچکردوو محمد ڕەسوڵ هاوار لەکتێبەکەیدا سمکۆ (ئیسماعیل ئاغای شکاك و بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد) لاپەڕە 190دا ئاماژەی بەکتێبەکەی ئەحمەدی کیسرەوی داوە بەناوی (تاریخ مشروته) چاپی یەکەم باسێکی دوورودرێژی لەو ڕووەوە نوسیوە کە نوسەری کورد و عەجەم لەلاپەڕەکانی 321-326تەرجومەی ئەو بەشەی ئەحمەد کسرەوی کردووە.)

وەکو دەڵێ بازرگانەکانی ئێران سکاڵایان نارد بۆ (عین الدولة) و(صدری اعظم)ی ئێران. بێزاری خۆیان دەربڕی بوو بەرامبەر بە باجی گومرگ و داوای کەمکردنەوەیان دەکرد لەدانیشتنی هاوبەشی نێوان (عین الدولة)و کاربەدەستانی گومرگ لەگەڵ بازرگانەکاندا لەباتی گوێ بۆداخوازیەکانیان بگرن دەستیان کردبوو بەجنێودان بەبازرگانەکان و سەندنی باج بەشێوەی جاران لەئەنجامی ئەوەدا بازرگانەکان بەئاگاداری ئاخوندەکان دوکان و بازاڕیان داخست و پەنایان بردەبەر (صدری اعظم) لەگێڕاوی ئەو ڕۆژانەدا (مظفرالدین شاه) چووبوو بۆ

ئەوروپاو محمد علی میرزای کوڕی لەتەوریزەوە هاتە تاران بۆئەوەی لەجێی باوکی بێت هەتا کاتێك گەڕانەوەی باوکی کە محمد علی میرزا چووە تاران بەقسەی خۆش توانی مانگرتنەکە بەبازاڕ بشکێنێ لەدوای گەڕانەوەی شا خواستەکانیان جێ بەجێ بکات.

(صدری اعظم) حاکمی تاران زۆر بەداخ بوون لەمەشروتەخوازان و بەتایبەتی لە هەڵێك دەگەڕان تۆڵەیان لێ بکەنەوەو گرانی تووتنیان کردە بیانوو و،چەند بازرگان و دوکانداریکیان گرت و کەوتنە بەر ئەشکەنجەو لێدان ناچار بازرگانەکان پەنایان بردەبەر ئاخوندەکان،ئەوانیش دابەش بوون بەسەر دوولایەندا ئیمام جومعەی تاران بەئاشکرا پشتیوانی لە عین الدولە دەکرد بەشەکەی تری سەید محمدی تەباتەنی و سەید عبداللەی بەهبەهانی کە پشتگیریان لە بازرگانەکان و خەڵکی بازاڕدەکرد ،لەڕێگەی مشیر الدولەوە بەهاوکاری باڵوێزی عوسمانی توانرا داخوازی یەکان بگەیەننە دەست (شا) ساڵی 1906 ڕەزامەندی نیشاندا لەسەر دروستکردنی(عەدالەت خانە) و داواکاریەکانی ڕێکخستنی هەڵبژاردن کە دووهەزارکەس لەئاخوندەکان ئامادەبوون بۆ دانانی ئەنجومەنەکانی کاتی بۆ ئامادەکردنی بەرنامەی هەڵبژاردن وخەڵکەکەش پۆلێن بکەن بۆ شەش بەش

بەشێك بۆ عولەماوقوتابیان بەشێکی تر بۆ بازرگان و خاوەنی زەوی و جوتیار و پیشەوەران ،لە 24ی ژی القعدەی 1324هجری مەجلیسی ئەساسی لە( 50)مادە دەست نیشانکرا شاە (محمد علی میرزا) و وەلیعەهد ئیمزایان کردو ئیتر ئێران لەڕژێمی ئۆتۆکراتیەوە بو بەڕژێمی پاشایەتی دەستووری زۆری پێنەچوو (مضفرالدین شا )مرد و محمد علی مرزا چووە جێگەی.ئەوەی کە جێگای پرسیارە کە محمد ڕەسوڵ هاوار دەڵێ تەنها شاری تاران ئەم ڕووداوانەی بەخۆوە بینی و شارەکانی تر کش و مات، دوای هەڵبژاردن شاری تەوریز ڕاپەڕی و بەسەدان کەس خۆیان خزاندە کونسوڵخانەی بەریتانیاوە داوایان دەکرد مەشروتە ئازربایجانیش بگرێتەوە د.سەعدی هەڕوتی لەلاپەڕە 28-29 دەڵێ بەشداری کردنی کورد لەشۆڕشی مەشروتە تەنها لەشارە کوردیەکاندا نەبوو بەڵکو شارە فارس نشینەکان و تەنانەت مەیدانی

تارانی پایتەختیش دەگرێتەوە بۆ ئەو قورساییە سەربازی یە كەكەساییەتی و هۆزە كوردی یەكان هەیان بوو، ئەوەتا هۆزی كوردی بەختیاری ڕۆڵی دیاری هەبوو لەپاڵپشتی ئەو كێشە نیشتیمانیەو پوچەڵكردنەوەی پلانەكانی كۆنەپەرستان و ئێران و ڕووسیای قەیسەری كە هاوكاری دەكردن دژی دەستورخوازان ئەمەش بەتایبەتی دوای ئەوەی كۆلۆنێلی ڕووسی(لیاخۆف)لە 1908/6/2تەلاری پەرلەمانی ئێرانی مۆمباباران كرد لەدوای ئەمە چەكدارانی هۆزی بەختیاری و شۆڕشگێڕانی ناوچەی گەیلان بەرەو پایتەخت كەوتنەڕێ دەستیان گرت بەسەر ئەوشارانەی كە دەكەوتنە سەر ڕێگاو لە 16تەمووزی 1909چوونە ناوشار لەئەنجامدا محمد علی شا ڕایكرد و پەرلەمانی ئێران بڕیاری دا شای ڕاكردوو لەسەر تەخت لابداو ئەحمەدی كوڕی كە منداڵ بوو بهێنرێتە سەر تەخت.

كەواتە شۆڕشی مەشروتە لەئێران دا بێ فیداكاری و لە خۆبوردوی كورد و هاوبەشی كرنی نەبووە تێكرای مێژوونوسانیش ئاماژە بەڕۆڵی بەرچاوی خەڵكی كوردستان دەدەن كەتوانیان بۆ ئەو سەردەمە هاوكاربن لەكۆتایی هێنان بەبەش مەینەتی خەڵكی ئێران.

ئەگەر بەچاوی واقع بڕوانینە كاتی پێش شۆڕشی مەشروتە و دوای شۆڕش بارودۆخی ڕۆژهەلاتی كوردستان یەك جۆر بووە هیچ جیاوازیەك نەهاتە ئاراوە.چونكە دەسەڵاتی ئەو دەمەی ئێران یەك تێڕوانینیان هەبووە بەرامبەر بە كوردو كەمە نەتەوەكانی تر ئاشكراشە دوای شۆڕشی مەشروتە زۆرترین زیان بەر كورد كەوتووە. ماڵ وێرانی و دەربەدەری زۆری چەشتووە. گرنگی ئەو شۆڕشەو سەركەوتنی خێری بۆ كورد نەبوو ، هەرچەندە نوسەرانی كورد

زۆر بەپەرۆشەوە باسی دەكەن، د.كمال مەزهەر لەلاپەڕە 241ی كتێبەكەیدا (8)(دراسات فی تأریخ ایران الحدیث و المعاصر) باسی كاریگەری و چالاكی خەڵكی بۆكان و سەقز دەكات كە داوای مافی كوردیان كردووە، هەروەها د.عبدالرحمان قاسملو لەكتێبەكەیدا لەلاپەڕە (55) لێكدانەوەیەكی دروستی بۆ شۆڕشی مەشروتە كردووەو دەڵێ دەرئەنجامی شۆڕشی ناوخۆیی ڕووسیابوو.

پریشکی لەسالی 1905پەڕیبۆوە بۆ ئێران و تورکیاش 1908 کە ناسراوە بەشۆڕشی دەستووری بەسەرکردایەتی تەلعەت پاشا و ئەنوەر پاشا و جمال پاشا دژی سوڵتان داوای کەم کردنەوەی دەسەلأتەکانی سوڵتان و سنوردانان بۆ زیادەڕەویەکانی بنەماڵەی دەسەلأتداری سوڵتان عبدالحمید ئەتوانین بڵێین کورد لەو بەشەدا جێگا دەستی دیارە پاشانیش بەدەستی بەتاڵ گەڕانەوە بەهەمان شێوەش د.عبدالرحمان قاسملۆ دەڵێ عەشیرەتی شکاك دروشمی داخوازی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردیان بەرزکردبۆوە،د.سەعدی هەروتی دەڵێ سەرەڕای ئەمە دوژمنانی شۆڕشی دەستوری،توانیان ژمارەیەك کەسایەتی دەسەلأتدارانی کورد بەلای خۆیاندا ڕابکێشن ئەوەتا(سالار الدوله)* برای جێنشینی تەختی محمد علی شای لەتەخت لادراو توانی ژمارەیەك لەسەرانی هۆزەکانی (جاف ،زەنگەنە، موکری) لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە لەو کاتەدا لەسالأنی 1907–1912 چالاکی دژی ئەم شۆڕشە لەناوچە کوردییەکان دەنواند،ئەمەش بەیارمەتی وپاڵپشتی بەریتانیاو دەوڵەتی عوسمانی بوو.بەلأم زۆری نەبرد بەشی زۆری پیاوانی ئەم هۆزانە لەڕیزی هێزەکانی سالار الدوله کشانەوەکاتێك بەرەو تاران هەنگاویان دەنا لەئەنجام دا ناویراو سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا لەدوای ئەوە بزوتنەوەکانی سالار الدوله کۆتایی هات.(10) دەوڵەتی عوسمانیش ئەم دۆخە ئالۆزەی ئێرانی بەهەل دەزانی هێرشی دەست پێکرد بۆسەر ناوچە کوردییەکانی نزیك سنوری خۆی و توانی دەست بەسەر (مهابادو بانەو بۆکان و سەردەشت و دەشتی ورمێ دا بگرێت هەولیشی دا دەسەلأتەکانی لەم ناوچانەدا بەردەوام بێت و بۆئەم مەبەستەش سیاسەتی جۆراوجۆرو ترساندن و تۆقاندنی بەرامبەر بەخەڵکی کوردستان پەیڕەو دەکرد،ئەمەش بووە هۆی زیاتر ئالۆزبوونی بارودۆخی ناوچە کوردییەکان گەندەڵی و باج و خەراجی زیاترو کوشتن

و گرتن کارێکی وای کرد دانیشتوان زیاتر بێزاربکەن کێشەی ئابوری و ڕامیاری ئەرکی ڕزگاری خوازەکانی گران تر کرد، بۆیە وردە وردە بزاڤی نەتەوەیی کوردی بەدیارکەوت و تێکڕای چین و توێژەکانی لەخۆگرت لەژێر یەك ئالأدا.

..........................................

*سالار الدوله:لەدایکەوە کوردبووە بۆیە کاریگەری لەسەر کوردەکان هەبووە.

# دەرکەوتنی ڕێکخراوی سیاسی کورد

دەرکەوتنی یەکەم ڕێکخراوی سیاسی نەتەوەیی لەڕۆژهەڵاتی کوردستان بەهاوکاری کەسایەتی دیاری باکوری کوردستان عبدالرزاق بەدرخان وەکو لەپێشتر باسمان کرد هاتنی عبدالرزاق بۆ ڕۆژهەڵات گرنگ بوو ئەویش هاتە لای بەهێزترین کەسایەتیە کوردیەکانی ئەو کاتە کە خاوەنی هێزێکی تایبەتی و دەست ڕۆشتووی ناوچەکە بوو کە ئەویش سمکۆی شکاك بوو،بەهەمان شێوە سمکۆش بەم هاتنەمەیدانەی میر عبدالرزاق بەدرخان خۆشحاڵ بوو لەم کاتەدا هەوڵیان یەك خست بۆ دروست کردنی ڕێکخراوێك کە ئومێد بەخش بێت بۆ خەڵکی کوردستان. بۆیە لە کۆتایی ساڵی 1912و سەرەتای ساڵی 1913 توانیان کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری دروست بکەن بەناوی (جیهانزانی)یاخود هەندێك ڕایان وایە ئەم کۆمەڵەیە ناوی (گیهاندن)(11) بووە.گوایە جیهانزانی بە واتا ناسینی جیهان دێت. گیهاندن بەواتای گەیاندن . یاخود پەروەردەو گەیاندن بەڵام هەر ناوێکیان بێت گرنگ بوونی ڕێکخراوێکی کوردی یە کە بۆ ئەو ڕۆژگارە زۆر کاریگەری هەبووە ، بۆ ساڵی دامەزراندنیشی ڕەنگە لەناوەڕاستی ساڵی 1912دا بێت چونکە سەرچاوەکان ئاماژە بەبوونی گۆڤاری کوردی دەکەن لەساڵی 1912بەناوی کوردستان،ئەمەش بەچالاکیەکی گەورەی کۆمەڵەی (جیهانزانی یاخود(گیهاندن)دەزانرێ. پێش دەستپێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم ئەم گۆڤارە ناوی نەما و چاپی تری بەدوادا نەهات ،هەرچەندە ئەم کۆمەڵەیە پشتگیری زۆری خەڵکی بەدەست هێنابوو بەتایبەتی کەسانی خاوەن سامان و کەسایەتی یە باڵا دەستەکان چونکە ئامانجەکانی کۆمەڵە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بوو کە زۆربەی دانیشتوانی کوردستان نەخوێندەواربوون ئەمەش بەکردنەوەی قوتابخانە کە دەتوانین بڵێین ئەو قوتابخانەیەی کەلەشاری (خۆی)کرایەوە یەکێکی تربوو لەچالاکیەکانی کۆمەڵەو

دەنگێکی باشی هەبوو. هاتنی عبدالرزاق بەدرخان بۆ ڕۆژهەلآت و مانەوەو هاوکاری کردن لەگەڵ سمکۆدا کاریگەری تەواوی هەبوو

لەناوچە کوردنشینەکاندا پرۆگرامی کۆمەڵەی جیهانزانی یاخود(جیهانـدان) جگە لەکردنـەوەی قوتابخانە دانانی الف وبێ ی کوردی و ناردنی لاوەکان بۆ ئەوروپا بۆ خوێنـدن بوو،هـەروەها عبدالرزاق بەناوی کۆمەڵەوە نامەیەکی نارد بۆ نوێنەری ڕووس لە (خۆی) کە بۆی نوسیوە ئەو کوردانـەی تـورك و ئێران ئابلۆقـەیان داوە ڕێگـەی ئەوەیان لێ گرتـوون خۆیـان لەشارستانێتی ئەورووپا نزیك بکەنەوە ،هەربۆیەش ئاستی خوێنـەواری لەناوچـە کوردیـەکان زۆر نزمـە .گەرچی سمکۆو عبـدالرزاق توانیـان خۆیـان لەگـەڵ کونسـڵی ڕووس (چـێرکۆف)لەخۆی نزیـك بکەنـەوە داواشـیان لێ کـرد ئـەو کۆمەڵەیـە بخاتـە ژێـر چـاودێری خۆیەوە,جـەلیلی جـەلیل دەڵـێ ئـەو کۆمەڵەیەی دروست کرا هەر بایەخی بەڕۆشـنبیری نەئـەدا بـەڵکو تەقـەلای ئەوەشـی دا کـەنزیك بوونەوە لەنێوان کوردو ڕووسدا دروست بکات.

ئەمەش بەمەبەستی دوو هۆ یەکـەم عبـدالرزاق دەیزانـی پیتـەکانی عـەرەبی بەشـی دەنگـەکانی زمانی کوردی ناکات بۆیە هـەوڵی دا چارەسـەری ئەمـە بکـرێ. دووهـەمیش بـەکارهێنانی پیتـی ڕووسی(12) ئەمەش دەبێت بەهۆی فێربوونی زمانی ڕووسـی ئەوسا منـدالآنی کـورد مێشـکیان فراوان دەبێت بۆ خوێندەواری و فێربوونی زانست و زانیاری ڕووسی.

جەلیلی جەلیل دەڵێ ئـەو پرۆگرامـەی کـە لـە(خۆی) بۆخوێنـدن دانرابـوو بڕیـاردرا ئـەو زەکاتـە سالآنەیەی کە ئیسلام دیاری کردبوو، کۆبکریتـەوە بـۆ کڕینـی چاپخانەیەك کـەبتوانن ڕۆژنامـەو گۆڤاری کوردی دەربکەن، سمکۆ داوای لێ کرا ئەرکی کۆکۆدنەوەی ئەو زەکاتە بگرێتە ئەسـتۆی خۆی ،تادەست بکرێت بە ئامادەکردنی قوتابخانەکە بەلآم پێشـتر باسمـان کـرد کەمێژوونوسـان ئاماژە بەبوونی گۆڤارێك ئـەدەن کەلەسـاڵی 1912کۆتـایی هـاتبوو. وەچاوەڕوانی کردنـەوەی قوتابخانەکـەیان دەکـرد بـەڕووی خوێندکارانـدا ڕەنگـە دەرکردنـی گۆڤارەکـە هـیچ زەکـات کۆکردنەوەی نەویستبێت ،بەڵکو بۆدروستکردنی قوتابخانەکە پێویستی بە کۆکردنەوەی زەکات

و هەندێك باج هەبووبێت، چونكە كردنەوەی قوتابخانە پێویستی بەهێنانی مامۆستابوو لە(باكۆ) وەو جێگە دابین كردن و خواردن ،ئەمانە هەمووی پێویستی ڕۆژانەبوون. جگە لەو كێشە هەنوكەییانەی ڕۆژانە پڕوپاگەندەیان بۆ دەكرا.ئەمەش جاری یەكەم بوو كە قوتابخانە بوونی هەبێت لەكوردستاندا جگە لە حوجرەی مەلاكان . ئینگلیزەكان و عوسمانیەكان وئێرانیش ڕێگربوون لەدروست كردنی قوتابخانە بەتایبەتی عوسمانیەكان وایان بلاودەكردەوە كە گوایە سمكۆو عبدالرزاق لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام لایان داوەو داوایان دەكرد كە كەس منالی خۆی ناونوسی خوێندن نەكات .بەلام سولتان عبدالحمید لەیادەوەریە سیاسیەكانیدا لاپەڕە 141 نوسیویەتی: قوتابخانە تایبەتیەكان مەترسیەكی گەورەن لەسەر وولاتەكەمان هەلەیەكی زۆر گەورەبوو كە ڕێگەمان دا هەر دەولەتێك و لەهەر كات و شوێنێكدا. ئەو جۆرە قوتابخانانەبكەنەوە كە ئارەزوویان دەكرد، ئێمە ئێستا زیانی ئەوە دەچنینەوە كە خۆمان چاندمان ئەوانیش دەستیان كرد بەووتنەوەی چەند هزرێكی دژ بە وولاتەكەمان لەناو قوتابیەكاندا، لەوەتەی من هاتوومەتە سەر تەخت ژمارەی قوتابخانەكان دە هێندەی جاران بەرزبۆتەوە بۆ (200,000)قوتابخانە * لەگەل ئەوەشدا هەر بەش ناكات، قوتابخانە ناوەندیەكانمان ئاستی خوێندن و پرۆگرامیان بەرزە ، ناوەندە زانستیەكان پەسەندیان كردوون ، ئێمە پێویستمان بە كردنەوەی قوتابخانەی ئامادەییە. بۆ ئەوەی قوتابیەكان ئامادە بكات تابچنە ناو دامەزراوە زانستیەكانەوە و ببن بە ئەندازیارو بیناسازو هونەری(13) . سەیر ئەوەیە لەوولاتێكی وەك توركیا كەچەند میلێك لە كوردستانەوە دوورە. 200000 قوتابخانەی تیایە هێشتا بەش ناكات و پێویستیان بەقوتابخانەی ترە كە زۆرێك لەو قوتابخانانە لەلایەن میسیۆنێرەكانی ئەوروپاوە دروستكراون ئەگەر هەر بەریەستێكیان دروست بكردایە ئەوا بالۆێزی

* بروانەیاداشتە سیاسیەكانی سولتان عەبدولحەمیدی دووەم ل141 (رەنگەمەبەستی ناوچەكانی زیردەسەلاتی دەولەتی‌عوسمانی بیت)

ئەو وولاتانە ڕاست دەبوونەوە. کەچی بەکردنەوەی تەنها قوتابخانەیەك لەکوردستان هەرچی پێیان کرا کردیان و تەنانەت فەڕەنسیەکانیش لە دوووەوە ناڕازی بوون. قوتابخانەیەك کە دوو تا سێ پۆل زیاترنەبووە ،ژمارەی قوتابیەکانیشی
تەنها 29 قوتابی بوون.تەنانەت ناوناتۆرەیان دەخستە پاڵ قوتابیەکان لە 21 تشرین 1913 دا قوتابخانەکە ئامادەی کردنەوە بوو. بەلام هاتنی کونسولی ڕووس لەخۆی(چێرکۆف) دواکەوت بۆیە قوتابخانەکەش لە 1913/10/27 بەئامادەبوونی کونسولی ڕووسیا چێرکۆف و عبدالرزاق بەدرخان و سمکۆ و تەیموور ئاغای حاکمی (خۆی )و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی ناوچەکە قوتابخانەکە لەلایەن چێرکۆفەوە کرایەوەو وتاری بەخێرهاتن لەلایەن سمکۆوە بووە پاشانیش عبدالرزاق بەردخان ووتاری پێشکەش کرد.
بەشێك لەناحەزانی کورد پروپاگەندەیان بلاودەکردەوە لەبارەی کردنەوەی قوتابخانەکەو گۆڤارەکەوە دەیان وت ئەو پارانەی کە کۆدەکرانەوە بەتالان دەبران.کە بۆ دروستکردنی قوتابخانەکەو دەرکردنی گۆڤارەکە بووە سمکۆش پاڵپشتی عبدالرزاقی کردووە .کەمانگی جارێك گۆڤارەکە دەربکات هەر ئەمەش بوو کاری کرد بوە سەردەسەلاتی عوسمانی و ئێرانی کەوتنە پیلان گێڕان بۆ ئەوەی کارەکەیان سەرنەگرێت. لەگەڵ دەست پێکردنی جەنگی جیهانی یەکەمدا قوتابخانەکەش داخرا (14)
لەشوباتی ساڵی 1913 لەڕێی چێرکۆفەوە جێگری کونسولی ڕووسیا لە (خۆی) داوای لە حکومەتی ئەو وولاتە کرا کە کوردناسی ناسراوی ڕووسی (ن،مار) و (ئۆربیللی) بنێرن بۆکوردستان بۆ کردنەوەی بەشی کوردی لەدەزگای ڕۆژهەلاتناسی (بترسبۆرگ) بەو بروایەی کردنەوەی ئەم بەشە دەبێتە هۆی دانانی ئەلف بێ ی تایبەت بەزمانی کوردی بە یارمەتی ئەلف بای ڕووسی (15)
گرنگترین کاری کۆمەڵەکە کردنەوەی قوتابخانەکە بووە لەشاری(خۆی) لە 1913/10/27بەم بۆنەیەشەوە ئاهەنگێکی مەزن سازدرا کە فەرماندەی هێزەکانی ڕووسیا لەناوچەکە(جەنەڕاڵ

فسیۆلۆفسکی)و سەرداری شارەکە لەگەلٚ ژمارەیەکی زۆر لە بازرگان و سەرانی کورد ئامادەبوون. عبدالرزاق و سمکۆ وتەیەکیان پێشکەش کرد تیایدا سوپاس و ستایشی ڕۆلٚی ڕووسیایان کرد بۆبەدەست هێنانی ئەم دەستکەوتە . ئەم قوتابخانەیە بە هەردوو زمانی کوردی و ڕووسی تێدا دەخوێنرا لە خولی یەکەمدا(29) قوتابی بەپێی قسەی عبدالرزاق . ئەم قوتابیانە کە تەمەنیان لەنێوان 8–10 سالٚیدابوون بەگیانی نیشتیمان پەروەرانە پەروەردەکران لەپالٚ بابەتەکانی وەك مێژوو جوگرافیا و ماتماتیك(16).

دەسەلاٚتدارانی ڕووسیا لەناوچەکانی کوردستانی ڕۆژهەلاٚتدا بەلێنیان دا بەخەلٚکی ناوچەکان تا لە ئایندەدا هەولٚ بدەن قوتابخانەی تر بکەنەوە بەشێوەی قوتابخانەکەی (خۆی) بەلاٚم ئەمە نەچووە بواری کارەوە. بەلٚکو لەنیسانی 1914گۆڤارێکیان بەناوی کوردستان دەرکرد بە یارمەتی ڕێکخراوە ئەلٚمانیەکان لەشاری مهاباد

پاشان کۆمەلٚەی (جیهاندانی) دوای ئەوەی کەزۆر کۆسپ و تەگەرەیان بۆ دروست بوو ئەمەش بووە هۆی سستی و لاوازی کۆمەلٚەکە .بەتایبەتی لەنێوان سەرانی کۆمەلٚە واتەلەنێوان عبدالرزاق وسمکۆدا ،دواتریش نزیك بوونەوە لە جەنگی جیهانی یەکەم بەتەواوی کۆتایی هات بەتەمەنی هەریەك لە کۆمەلٚەکەو قوتابخانەکەش.

دوای بەدواداچوون بۆمان دەردەکەوێ پێش کردنەوەی ئەو قوتابخانەیە لە کوردستانی گەورەدا هیچ ئاماژەیەك بەبوونی قوتابخانە بەو شێوەیە نەکراوە جگە لە حوجرەو شوێنە ئاینیەکان، ئەگەر وابێ دەتوانین بلٚێین یەکەم قوتابخانەیە لەسەر ئاستی کوردستان. ڕۆژی کردنەوەکەی 1913/10/27 یە کە دەبوایە لەکۆنگرەی پەروەردەی دا لەهەرێمی کوردستان ئاماژە بەیەکەم قوتابخانەی کوردی لەشاری (خۆی) لە ڕۆژهەلاٚتی کوردستان بکرایەو هەموو سالٚێك لەو ڕۆژەدا ببوایە بە ڕۆژی پەروەردەیی و ڕۆلٚی عبدالرزاق و سمکۆش ستایش بکرایە. چیرکۆف لەنوسینەکانی دا دەلٚێ لە دواڕۆژێکی نزیکدا بەهۆی ئەو زەوی یانەی کەبۆ باخ تەرخان کرابوو قوتابیەکان تیدا فێری کشتوکالٚ دەبن فێری ئەوەش دەبن کە چۆن بایەخ بە پەروەردەکردن و

پێگەیانـدنی میـوەو دارودرەخـت سـەوزەوات بدەن.هـەروەها یارمەتیـەکی پزیشـکی باشـیش ئامـادەکرا لـەناو قوتابخانەکـەداو خەسـتەخانەیەکی بچـووك و ئەجزاخانەیـەکی لـەپاڵ دا کرایەوەکەبرین پێچێك و مامـانێکی رووس سەرپەرشـتیان دەکرد کـە هـەردووکیان کوردییـەکی باشیان دەزانی ئەوکاتەمردن لەناو منالانی کوردا بەهۆی نەخۆشی و نەشارەزایی لەکاتی مندالْ بووندا زۆر بوو.بۆیە بایەخ دان بەدۆزینەوەی چارەسەریتەندروستی شـتێکی زۆر پێویسـت بـوو بـەهۆی ئـەو دەرامەتـەی کـە بۆقوتابخانەکـە دابـین کرابـوو. لەئـەنجامی سـەرکەوتن لـەو قوتابخانەیـەدا (چـێرکۆف) هـەولْی دا قوتابخانـەی تـر لـە چـەهریق و سـوماو برادۆسـت لـە نـاو کوردەکانی (ماکۆ)شدا بکرێتەوە.

بۆ ئامادەکردنی مامۆستا بۆ ئەو قوتابخانەیە بریـاردرا لـەناو کوردەکـانی (یـەریڤان)دا مامۆسـتا ئامادە بکرێت

لەگەڵ ئەوەشدا مەبەست لەکردنەوەی قوتابخانەکەی (خۆی)بەگەلێك جۆر لێك ئەدرایەوە. بەلاْم رۆژنامـە تـورکی یـەکان و ئەرمەنیـەکان هـەوالْی کردنـەوەی ئـەو قوتابخانـەیان بلاْوکـردەوە تورکەکان بۆ بەربەست دروست کردن لە بلاْوبوونەوەی دەسەلاْتی رووسیا لەناو کوردەکانـدا کـە بەتەواوی سەرو دلْی گرتبوون.

بەپەلە کەوتنە ئەوەی پارەیان تەرخان کرد بۆ کردنەوی قوتابخانەی کوردی و بلاْویـان کـردەوە کـە(17500) لـیرەی تـورکی تـەرخانکراوە بـۆ کردنـەوەی قوتابخانەیـەك لەگونـدی (ئەرتامید)لـەنزیکی (وان )کـە بـۆ هـەزار قوتـابی دەسـتی ئـەدا لەگـەڵ تـەرخانکردنی (25000)لیرەی تورکی تر بۆ دروست کردنی چەند قوتابخانەیەکی بچووکی سەرەتایی لەچەند ناوچەیەکی تردا.

ئەلْمانەکانیش لەلای خۆیانەوە کەوتنە چالاکی جێگری کونسولْی ئـەلْمانیا لە(موسـلْ )کـە نـاوی (گۆلْدشتین)بوو گەشتێکی بە کوردستاندا کردو بلاْوی کردەوە. کە حکومـەتی ئـەلْمانیا هەرچـی لەتوانایـدابێت دەیکـات .بۆپەرەسـەندن و بلاْوبوونـەوەی خوێنـدەواری و رۆشـنبیری لـەناو

کوردەکاندا لە(موسڵ )(گۆڵدشتین) توانی ئیحسان بەدرخان برای عبدالرزاق بەدرخان ڕازی بکات لەوە دڵنیا بێت کە ئەڵمانەکان لەو تەقەلایەدا نیازیان پاکە و پڕ بەدڵ ئەیانەوێ گەشەبدرێ بەبڵاوبوونەوەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری لەناوکوردەکاندا و بڵاویان کردەوە کە پارە بۆ (10) قوتابی کورد تەرخانکراوە کە بچن بخوێنن لەدوای کردنەوەی کونسولیەتی ئەڵمان لە(وان) لەوێش قوتابخانەیەك دەکرێتەوە بۆ منالانی کورد بۆ ئەو مەبەستە قسەی لەگەڵ پارێزگاری (وان)تەحسین بەگ کردبوو، بەلام بەڵێنەکانی ئەڵمان و تورك تەنها هەر قسەبووە چونکە هیچ هەنگاوێکیان نەنا بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئەوبەڵێنانە لە ڕاستیدا ئەو کارەشیان بەدڵ نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا حاڵی قوتابیانی قوتابخانەی (خۆی)باش نەبوو چونکە بە جۆرێك پڕوپاگەندەیان بەرامبەر دەکرا کەکەس منالی خۆی نەنێرێ بۆ قوتابخانە کە وایان لەخەڵکی دەگەیاند کە ئەوەی منالی لە قوتابخانەدا بێت ئەوا بێ ئیمان دەبێت و لەدین لادەدات، بە منالەکانیشیان دەووت بەچکە گورگەکان . سمکۆ بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو پڕوپاگەندانە ناوی نابوون بەچکە شێرەکان یەك جۆر جل و بەرگیان لەبەردا بووە کلاوی خورییان لەسەر دەکردن هەرچەندە ژمارەیان تەنها 29 قوتابی بوون بەلام سمکۆ 40 چەکداری خۆی ئامادەکردبووکەڕۆژانە پاسەوانیان دەکردن ،نەك لەلایەن نەیارەکانەوە زیان بەقوتابیەکان بگەیەنن.

نزیك بوونەوە لەجەنگی جیهانی یەکەم و جیاوازی بیروڕای نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی (جیهاندان) بەتایبەتی لەنێوان سەرکردەکانی کۆمەڵەکەدا کارێکی وای کرد کە تەمەنی گۆڤاری کوردستان و هەم قوتابخانەکەش بەرەو کۆتایی

بروات سمکۆ بەردەوام بەدوای هاوپەیماندا دەگەڕا هەر بۆیە لەگەڵ سەید تە ها ی شەمزینی ڕێکخراوێکی نەتەوەییان دروست کرد بەناوی (جمعیتی ئیستیخلاسی کوردستان )ئامانج لەدروست کردنی ئەم ڕێکخراوە نەتەوەییە تەنها سەربەخۆیی کوردستان بووە هەوڵیان ئەدا لاوان بەبیری نەتەوەیی پەروەردەبکەن و بوار بۆ سەربەخۆیی کوردستان سازبکەن.

ئەم کۆمەڵەیە لەساڵی 1914 لەڕۆژهەلاتی کوردستان لەشاری (ورمیە) لەلایەن سمکۆی شکاك و سەید تەهای شەمزینی دامەزرا داوایان لەڕووسیای قەیسەری کرد بۆ ووتوێژ دەربارەی هاوکاری کوردو ڕووس دژی دەوڵەتی عوسمانی کار بکەن بەو مەرجەی ڕووسیا پشتیوانی لە ئامانجی نەتەوەیی کورد بکات .شێخ عبدالسلام بارزانی رابەری شۆڕشی 1907–1914 پەیوەندی یەکی پتەوی هەبوو.لەگەڵ ئەم کۆمەڵەیەداو هیوایەکی زۆری پێی هەبوو چونکە ئەم کۆمەڵەیە هەلگری بیری نەتەوەیی و داوای سەربەخۆیی کوردستانی دەکرد و لەو پێناوەشدا تێدەکۆشا.

وورده وورده جیهان خۆی بۆشەرێکی خوێناوی ئامادە دەکرد .دابەش بوون بەسەر دوو لایەندا لایەنی سوێندخۆرەکان کەبریتی بوون لە ئەڵمان و دەوڵەتی عوسمانی تا ئەو کاتەش دەوڵەتی عوسمانی باکوری ئەفەریقاو میسرو ولآتانی کەنداو و عێراق و شام ی لەژێر دەسەلآتدابوو.

ولآتانی هاوپەیمان بریتیبوون لەبەریتانیاو فەرەنساو ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانیان ئامانجیش لەمەدا تەنها دابەش کردنی وولآتانی ژێر دەسەلآتی دەوڵەتی عوسمانی بووە.لەمانگی تشرینی 1914عوسمانیەکان لەرێگەی هێزەکانیانەوە سنوریان لەڕۆژهەلاتی کوردستان بەزاندو ڕووەو ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئێران. هەر لەسەرەتاوە ناوچەیەکی فراوانیان داگیرکرد کە بریتی بوون لەشارەکانی (خۆی)و(ورمێ)و(مهاباد)(17). هێزەکانی ڕووسیا پاشەکشەیان کرد بەرەو ناوچەکانی باکور. عوسمانیەکان لەرێگەی بانگەشەی ئاینیەوە توانیان پالپشتی کوردەکان بەدەست بهێنن تەنانەت شاری (تەورێز)داگیربکەن.ئێرانیش ئەیویست بە هەرچی شێوەیەك بێت خۆی لەو شەرە بە دوور بگرێ چونکە بارودۆخی ناوخۆی ئێران کەڵکی شەڕی دەرەوەی نەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا دەسەلآتی پاراستنی سنورەکانیان بەگران بۆ دەکرا و باری ئابوریش تەنگی بەخەڵکی ئێران هەلچنیبوو.بۆیە خۆی بەبێ لایەن حساب دەکردوخۆی گۆشەگیرکردبوو.

# جەنگی جیهانی یەکەم وکاریگەری لەسەر کورد

پریشکی ئەو شـەڕە مـاڵ وێرانکـەرە کـە جیهـانی گرتـەوە بـە ملیۆنـەها مرۆڤـی بێتـاوان بوونـە سووتەمەنی و چەندین وولآتان تێوەگلان و باری ئابووری بەجۆرێك دابەزی کەلـەزۆر جێگـا نـەك گیاندارەکان بەڵکو مرۆڤەکانیش لەدەسـت خـەڵکانی برسـی ڕزگارنـەبوون و نەخۆشـی و قـات و قـڕی بـاڵی بەسـەر جیهانـدا کێشـا ئەمـەش سـەرەتاکەی لـە کوشـتنی ولی عەهـدی نەمسـاو خێزانەکەیەوە لە(سرایڤۆ)وە دەستی پێکرد(18). هەرچەندە فتیلی هەڵگیرسـاندنی ئـەو شـەڕە پێشتر ئامادەکرابوو ،ئەمەش بەهۆی ناهاوسەنگی باری ئابووری وولآتە خـاوەن پیشەسـازی یـە گەورەکانەوەبوو.هەریەك لەو زلهێزانـە دەیانویسـت بـەپێی تـەرازووی هێزەکـان جیهـان دابـەش بکرێتەوە نەمساش ئەمەی کردبو بەبیانوو تا شەڕی دژی (سربیا) ڕاگەیاند،ڕووسیا بۆ پشتیوانی سربەکان شەڕیان دژی نەمسا ڕاگەیاندو هێزەکانی ئامادەکرد.ئـەڵمانیاش بـۆ پشـتیوانی نەمسـا شـەڕی دژی ڕووسـیا ڕاگەیانـد هـەروەها ئـەڵمانیا دژی فەڕەنسـا و بـەلجیکا و ژاپـۆنیش دژی ئـەڵمانیا. بـەو پـێ یـە وولآتـە سـوێندخۆرەکان ئـەڵمانیاو نەمسـاو دەوڵـەتی عوسمـانی بـوون. دەوڵـەتانی هاوپـەیمانیش بریتانیـاو ڕووسـیاو فەڕەنسـاو لـەکۆتایی شەڕیشـدا ئەمەریکاهاتـە شەرەکەوە.ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئامـانجی سـەرەکی لایەنـە بەشـەڕهاتووەکان بوو.بۆیـە لایەنـە براوەکانی شەڕەکە لەدوایدا کەوتنە دابەشکردنی وولآتانی ناوچەکە و کـوردی بـەش مەینـەتیش لەم شەڕەدا پشکی بەرکەوت سەرەتای پارچە بوونی لێرەوە دەستی پێکرد.

لازاریـف دەڵـێ یەکـەم دەنگـی تەقـەی شـەڕ لەناوچـەکانی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕەسـتدا لـەناوخاکی کوردستانەوە دەستی پێکرد .لەو شەڕەدا میللەتی کورد بەخۆڕایی بەکێش کرا بـۆ ئـەو شـەڕەو ژمارەیەکی زۆری لێ کوژراو بەبێ ئەوەی هیچ مەبەست و سودێکی هەبووبێت(19). لەشەڕەکەدا دەوڵەتی عوسمانی بەدرۆ خۆی بەنوێنەری خەلافـەتی ئیسـلامی دەزانـی بـەهاوکاری ئـەڵمانیای

دۆستی توانیان هەستی ئاینی ئیسلام لەدڵ و مێشکی کوردی ساویلکەدا ببزوێنن.بەخۆڕایی کورد کرا بەسووتەمەنی ئەو شەڕە هەتا دواساتەکانی شەڕ کوردی ناو خاکی دەوڵەتی عوسمانی ئاڵای ئیسلامیان دانەنواند. سولْتانی عوسمانی کە خۆی بەخەلیفەی ئیسلام و پارێزەری ئایینەکە ئەژماردەکرد کەچی (شەریف حسین)شەریفی مەککە نەوەی پێغەمبەر بەئاشکرا چووە پاڵ بەریتانیاو دژی ئەو خەلافەتە شەڕی کرد لەئەنجامدا شەریفی مەککە توانی سوود لە بەڵێنەکانی ئینگلیز وەربگرێ فەیسەڵی کوڕی لەحیجازەوە بەکێش کراو کردیان بەمەلیکی عێراق و بەزەبری فرۆکەی ئینگلیز توانیان خواروی کوردستان بلکێنن بە عێراقەوە .میللەتی کوردیش بووە قۆچی قوربانی بۆ سوودی خاوەن کۆمپانیاکانی نەوت.ئەمین زەکی بەگ لەکتێبەکەیدا بەناوی (مێژووی کوردستان) لەلاپەرە 259دەربارەی ئەو زیانانەی لەکورد کەوتووە بەهۆی شەڕی جیهانیەوە ووتویەتی شەڕی یەکەمی جیهانی هەر وەکو ئەو شەڕانەی پێشووتر کەلەنێوان عوسمانی و ڕووس دا ڕوویدا لەم شەڕەدا میللەتی کورد تووشی گەلێك زیان و ماڵ وێرانی بوو(20).

لەکاتی هەڵگیرساندنی جەنگدا دیبلۆماتەکانی (ئەڵمان،ئینگلیز،ڕووس) چ ڕاستەوخۆ خۆیان یان لەلایەن دۆست و لایەنگرە ئێرانیەکانەوە.هەوڵێکی زۆریان دا بۆ ئەوەی ئێران لەو شەڕەوە بگلێنن بەڵام حکومەتی ئێران بەسەرۆکایەتی (علاء الدولە)بەڕەسمی بێ لایەنی ئێرانی ڕاگەیاند. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ دەوڵەتێکی بەشداربووی ئەو شەڕە ڕێزی ئەم بێ لایەنیەی ئێرانیان نەگرت.(علاء الدولە) باش دەیزانی ئێران کەڵکی شەڕی پێوە نیەو بەدەست کێشەکانی ناوخۆوە دەیناڵاند تەنانەت بێ لایەنیەکەی خۆشی پێ نەدەپارێزرا.

چوونکە قاجارەکان لەوپەڕی فەسادی و بێ ئەخلاقی و لاوازیدا بوون گسکیان لەخەزێنەی دەوڵەت دابوویەس بەدوای ڕابواردن و چەوساندنەوەی خەڵکی ئێرانەوە بوون .کەشەڕدەستی پێکرد ڕۆژئاوای ئێران بووە مەیدانی گەرمی ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ڕووسەکان کاتێك سوڵتان جیهادی ڕاگەیاند داوای لە موسڵمانانی جیهان کرد دژی هاوپەیمانەکان بجەنگن،

كوردو موسڵمانەكانی ناو ئێران بەم بانگەوازە بەهەڵەیەكی مێژوویدا چوون ئاڵان لەشەڕێكی خوێناوییەوە. بێ ئەوەی كورد دەستی لەهەڵگیرسانی یان لەدەستكەوتیدا هەبێت ئەوەی تائێستا جێگەی سەرسوڕمانە گەلی كورد هەمیشە یاخی و لە حاڵەتی شەڕدابووە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی،بۆیەرگری لەخۆ هەر لەو سەرو بەندەدا شۆڕشی حەوت ساڵەی شێخ عبدالسلام بارزانی 1907–1914بەزەبری هێزو لەرێگەی پیاوەكانیانەوە شێخ عبدالسلام دەستگیركراو تەسلیم بەعوسمانیەكان كرایەوە ئەوانیش لەموسڵ لەساڵی 1915لەسێدارەیان داو شۆڕشەكەیان كۆتایی پێ هێنا ،بەمەرجێ شێخ عبدالسلام لەرێگەی بروسكەوە ئاگاداری(بابی عالی) كرد لەئەستەمبوڵ بۆ دابینكردنی مافەكانی كورد .داواكاریەكانیش بریتی بوون لەكردنەوەی دەزگاكانی حكومەت لەناوچە كوردنشینەكاندا و زمانی كوردی بكرێت بەزمانی پەروەردەو فێركردن لەكوردستاندا هەروەها لەداواكاریەكانیاندا هاتووە كە پێویستیان بەدانانی بەرێوبەرو قائیمقام و لێپرسراوانی تری كورد زمانە باجەكانیش كەحكومەت وەری دەگرێت.خەرج بكرێ بۆ رێگاوبان و كردنەوەی قوتابخانەو دادپەروەری كۆمەلایەتی جێ بەجێ بكرێ و قازی و مفتی دەبێت سەر بەمەزهەبی شافعی بن و وەرگرتنی باجەكانیش بەپێی یاساو شەرع بێت بەهەمان شێوە باكوری كوردستانیش حاڵی باشتر نەبوو یەكێك لە پیاوە ناسراوو دیارەكانی ناوچەی (بەدلیس)بەناوی مەلا سەلیمی بەدلیسی جگە لەوەی وەك كەسایەتیەكی گەورەو شێخێكی تەریقەت لەهەمان كاتیشدا پیاوێكی نیشتیمان پەروەرو بنەماڵەیەكی دیاری ناوچەی (خێزان) بوون هەمیشە لەتێكۆشاندا بوون دژی دەوڵەتی عوسمانی و ئەو ناهەقیانەی كەبەرامبەر بەگەلی كورد دەكرا بۆیە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم بەمەترسی دەزانی و دووریان خستەوە بۆ شاری مەدینە لەسعودیە.بەلام شێخ سەلیم لەوەرزی حەجدا گەڕا بەدوای كەسایەتیە كوردیەكاندا كە بۆ زیارەتی ماڵی خوا چوو بوون و چاوی كەوت بەكۆمەڵێك شێخ و پیاوە ئاینیەكانی كوردی ناوچە جیاجیاكانی كوردستان و هەر لەوشوێنەپیرۆزەدا سوێندیان خواردوو بەڵێنیان دا بەیەكتری كە خیانەت نەكەن و كاربكەن بۆ دروست كردن و دامەزراندنی

دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان .دوای گەڕانەوەی شێخ سەلیم بۆ کوردستان و بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی خۆی گەیاندە ناوچەکانی(قارس – ئەرزڕۆم – ئازربایجان – وان – بەدلیس– دیاربەکر)خەڵکێکی زۆرلە موریدو نیشتیمان پەروەران بەدەم داواکەیەوە هاتن و لەوکاتەشدا کۆمەڵەی (ئیتحاد و تەرەقی)سیاسەتی بەتورک کردنیان گرتبووە بەر لەهەوڵ دابوون بۆ تواندنەوەی گەلانی غەیرە تورك کاتێك ئیتیحادیەکان بەهەوڵەکانی مەلا سەلیمیان زانی لەساڵی 1910دا هێزێکی زۆریان ڕەوانەی سەر شێخ سەلیم کرد و لەڕێگەی (وان و بەدلیس)شێخ سەلیمیان دەستگیر کردو بەڵام شەڕێکی توند ڕوویداو بەیارمەتی شێخ شەهابەدین توانرا ڕزگاری بکەن و لەشەڕەکەشدا کوردەکان چەك و تەقەمەنیەکی زۆریان دەستکەوت بوو نزیکەی (320)سەربازی تورکیش بەدیل گیران و (50)جەنگاوەری کوردیش شەهید بوون و لەکۆتایی ساڵی 1913 تەواوی ویلایەتی بەدلیس کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی شێخ سەلیمەوە تەنها شاری (بەدلیس)* نەبێت دوای شەڕێکی پێنج سەعاتی شێخ سەلیم و هاوڕێکانی شاری بەدلیس یان گرت. ژمارەیەکی زۆریش سەربازی تورکیان کوشت کاتێك ڕۆژ بۆوەوە تورکەکان لەچەندین قۆڵەوە هێرشیان هێنا بۆسەر شارو شێخ سەلیم لەگەڵ دە کەس لەهاوڕێکانی پەنایان بردە بەر کونسولخانەی ڕووس لەبەدلیس .بەدەست پێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم تورکەکان پەلاماری کونسولخانەکەیان داو شێخ سەلیم و هاوڕێکانیان دەستگیرکردو لەبەردەم کونسولخانەکەدا لەسێداره.

دران. ئەمە لە کاتێکدابوو شێخ سەلیم داواکاریەکانی بۆسەربەخۆیی کوردستان بوو.

بەڵام شێخ عبدالسلام لەم داواکارییە سەرەتاییانە زیاتری نەبوو. ئەو داواکاریانە هەمان ئەو بانگەشەو پروپاگەندانە بوو کە خەلافەتی دەوڵەتی عوسمانی گوێی دونیای پێ پڕکردبوو، دوای دەستگیرکردنی شێخ عبدالسلام کە لەلایەن دەروێش عبداللەی شکاکەوە بەخیانەت

* ڕێبەری مێژووی نوێ هاوچەرخ لاپەڕە 83 ئامادەکردنی مامۆستا جمال مجید.

گیراو تەسلیم بەسوڵتەی دەوڵەتی عوسمانی کرا.ئەوانیش لەشاری موسڵ لە داریان دا،شێخ سەلیم و هاورێکانیشی بەهەمان شێوە لەسێدارە دران و سەرەڕای ئەمەش کورد لەکاتی شەڕدا زۆر تا کەم چوونە بەرەکانی شەڕو خۆیان لەپێناوی مانەوەی پیاوە نەخۆشەکەدا بەکوشت دەدا.دەوڵەتی عوسمانی پەیتا پەیتا هێزی دەنارد بۆ باکوری ئێران و ناوچە کوردیەکان حەسەن ئەرفەع لەکتێبەکەیدا دەڵێ لەسەرەتای شەڕەکەدا تیپێکی سەربازی تورك بەیارمەتی چەند هەزارکەسێك لەسوارەی کورد هێرشیان بردە سەر سنوری ئێران و سابڵاخیان (مهاباد)داگیرکرد.ئەمە مانای ئەوەیە کەیەکەمجار هێرشەکە بۆسەر سابڵاخ کرابێت(22).

حەسەن ئەرفەع درێژە بەباسەکە دەدات و دەڵێت خێڵەکانی کوردی ئێران لەبانە و مەرگەوەرو مامش و دیبوکری ئەوانەی کە پەیوەندیان پێوەکردن و سەرکەوتن بەسەر ئەو سوپایەی رووسیا کەلەمیاندواو بوو دوایش ئەو هێزە کوردییە بەرەو تەوریز رۆیشت ودوای گرتنی.رووسەکانیش لێی چوونە دەرەوە حاکمی ئێرانیش کە لەوێ بوو لەکانوونی یەکەمی 1914دا رای کرد(23).

لەبەرئەوە رووسەکانیش رای باشیان بەرامبەر بەکوردەکان نەمابوو.لازاریف لەزمانی(ڤێدێنسکی) سەرکونسوڵی رووسی لە ورمێ دەڵێ: (نابێ لە ورمێ پشت بە یارمەتی کوردەکان ببەستین و هیوامان پێ یان هەبێت. چونکە تورکەکان بەناوی شەڕی پیرۆزەوە شەڕیان پێ دەکەن.بێجگە لەمەش سەربەستی تەواویان داونەتێ بۆ تالآن کردن و داگیرکردنی هەموو شوێنێکی خاکی ورمێ)(24).

هەرچەندە سمکۆ لەسەرەتای ئەیلولی 1914دەیویست دەست لەرووسەکان بەرنەدا حەزی بەدۆستایەتی رووسەکان دەکرد بۆ ئەوەی پشتگیری بکەن بۆیە دەڵێ:(کە رووسیای دۆستم لەشەڕدایە من و هاوکارەکانم ئامادەین دژی دوژمنانی رووسیا خەبات بکەین و ژیان و ماڵمان لەپێناوی خاوەن شکۆی ئیمپراتۆری رووسیادا بەخت بکەین)(25).

ـە20ی ئەیلوولدا پاش سالێك زیاتر بـەهێمنی كاربەدەسـتانی توركیـا دەسـتیان كـرد بـەناردنی كوردەكانی باكور بۆ ڕۆژئاوای ئێران ئەو كوردانەی كەلەژێر سەركردایەتی تورك و ئەلْماندا بـوون ئەمەش بێ ئەوەی لازاریف ڕوونكردنەوەی زیاتر بـدات كـە ئایـا ئـەو كوردانـە لـەكام عەشـیرەت بوون؟سەركردەیان كێ بووە؟ ڕەنگە هەندێك جار كەباسی هاوكاری كورد و تـورك دەكرێ ئـیتر پەنجە بۆ سمكۆ درێژ دەكرێ بێ ئەوەی هیچ لێكدانەوەو لێكۆڵینەوەیەكیان هەبێت یاخود پشت بەسەرچاوەیەكی ڕاست و دروست ببەستن.چوونكە سمكۆ لەهەموو كەس باشتر توركی دەناسی و ئەیزانی چەندە دوژمنی سەرسـەختی كـوردو شۆڕشـەكەیەتی ،هـەر بـە فیتـی توركـەكان بـوو كوردەكانی توركیا پرچەك دەكران و ڕەوانـەی ناوچـەی ورمـێ یـان دەكـردن بـۆ ئـاژاوە نانـەوە .ڕووسەكان بەشەڕی ئەلْمانەكانەوە خەریك بوون توركیـاش دەیزانـی ڕووسـیا بـەهۆی شـەڕەوە نایەرژێتە سەر ئەو ناوچانەی ئێران كە داگیری كردبـوو بـۆ ئـەم مەبەسـتەبوو كوردەكـانی نـاو توركیا هان ئـەداران بـۆ دروسـتكردنی پشـێوی لەناوچـەكانی خـوارووی گـۆمی ورمـێ .تەنانـەت كارگەیشتە ئەوەی لەناوچەكانی (خۆی)بەفەرمانی جـەودەت بـەگی والی وان عبداللـە و تـەیموور جانگۆی پێشەوای كوردەكانی ئەو ناوە هەوڵیان دا بزوتنەوەیەك دژی سمكۆ بەرپابكـەن و هـەر لە توركیـاوە فیـدایی نێردرابـو بـۆ كوشـتنی عبـدالرزاق بـەدرخان و ئـەو پێشـەوا كوردانـەی كـە دۆستی ڕووسیابوون بەلأم هەوڵەكەیان سەری نەگرت بەهۆی ئاگاداری ڕووسەكانەوە لـە نیـوەی تشرینی یەكەمی 1914بەفەرمانی كاربەدەستانی توركیاو ئـەلْمانیا بزوتنەوەیـەك دژی سـوپای ڕووسیا پەیدابوو هەروەها ناوبەناو شەڕی تێدا دەكرا

هەندێك دەڵێن كەشەڕی جیهانی یەكەم ڕوویدا لەناوچەی دەریـای ڕەشـەوە دەسـتی پـێ نـەكرد بـەڵكو لەكوردسـتانی ئێرانـەوە یەكـەم تەقـە كـرا لازاریفـیش هـەمان ڕای هەیـە كـە دەڵـێ شـەڕ لەكوردستانی ئێرانەوە دەستی پێكرد هەر وەكو لەمەوبەر باسمان كرد

كوردستانی ڕۆژهەلأت بەهۆی شوێنگەی جوگرافیی و هۆكاری دیموگرافیەوە بووە. گۆڕەپـانێكی سەرەكی ململانێی لایەنە شەڕكەرەكان بەتایبەتی ڕووسیاو دەوڵەتی عوسمانی لەسالأنی جەنگدا

کــوردانی ڕۆژهــەلآت لەلایــەن هــەموو دەولــەتانی ناوچــەکەوە دەچەوســانەوە و هــەولی چەواشەکردنیان دەدرا بۆئەوەی لەپێناوی بەرژەوەندی یەکانی خۆیاندا بەکاریان بهێنن ئەوەتا دوای بەرپابوونی جەنگ پڕوپاگەندەکانی (جامیعەی ئیسلامی) بۆ پشتگیری دەولەتی عوسمانی لەئێراندا بەتایبەتی لەناوچەکوردییەکاندا بەشێوەیەکی فراوانتر بلآودەکرایەوە.ئەم پڕوپاگەندانە لەڕێگەی هەوالگرو سیخوڕەکانی ئەلمانی و عوسمانیەوە لەو ناوچانە کاری لەسەر دەکرا لەنێو هــەوالگرانی ئــەلمانی (شــیونمان)(تێدەر مایــەر) (زۆگمایــەر) چــالاکی گرنگیــان لەنێوەنــدە کوردییەکانــدا دەنــوان و توانیــان لــەناوەوە دەســتکەوتی گــەورە بەدەســت بهێــنن لەبەرئــەوەی کوردەکــان بــەهۆی هۆکــاری مەزهەبیــەوە لەهــەموو موســلمانانی ئێــران زیــاتر هەســتیان بــۆلای دەولەتی عوسمانی دەبزوا(27).

لە 29ی تشرینی یەکەمی 1914ژێر ئاوەکانی ئەلمانیا کە مولکی تورکیابوو لەدەریای ڕەشدا پەلاماری ژێر ئاوی ڕووسیای دا.ڕووسیاش بەدوای ئەمەدا لەڕۆژی 2ی تشرینی دووەمی 1914 جەنگی دژی تورکیا ڕاگەیاند بەدوای ڕووسیادا فەڕەنساو بەریتانیاش لەڕۆژی پێنجەمی هەمان مانگدا جەنگیان دژی تورکیا ڕاگەیاند .تورکیاش بەتەواوی تێکەلآوی جەنگی جیهانی بوو.لەمەشدا مەبەستی ئەلمان هاتە دی. چونکە بەلای ئەلمانەوە گرنگ نەبوو ئامانجی تورك لەجەنگ دا چی یە؟ یان چیان بەسەردێ؟ گرنگ ئەوە بوو تورك گوشارلەسەر ئەو کەم بکاتەوە تا بەشێکی هێزەکانی ڕووس و ئینگلیز لەمەیدانی سەرەکی ئەوروپا دەربهێنێ و بەناوچەیەکی لاوەکی یەوە لە ئاسیا خەریکیان بکاو ئاسایشی ڕێگای هاتووچۆی ئیمپراتۆریی بەریتانی لەگەل هندستان بخاتە مەترسیەوە(28).ئەلمان بۆ ئەوەی کەلکی تەواو لە هاوکاری تورك وەربگرێ داوای لێ کرد بوغازەکان لە ڕووی کەشتیوانی هەموو دەولەتانی تردا دابخات ڕێگای ئاوی قەناتی سوێس و عەدەن ببڕێ و پەلاماری قەفقاس بداو بەشێکی هێزی ڕووس خەریك بکا(خەلیفە)ش جیهاد دژی دەولەتانی هاوپەیمان ڕابگەیەنێ.ئەستەمبول و بەرلین ئومێدێکی زۆریان بەست بوو بە کوردەکانەوە .پڕوپاگەندەیان بلآودەکردەوە لەنێو دانیشتوانی کورد سەبارەت بەبەخشینی

کارگێڕی و خۆجێ یەتی لە داهاتوودا بەلأم دەرکەوت گرەو کردنیان لەسەر کورد گرەوێکی تەواو دۆڕاوبووە ئەمەش یەکێك بوو لەهۆکارەکانی شکستی خێرای ستراتیژیەتی سیاسی و سەربازی یەکێتی پێنج قۆلّی(ئەلّمانیا،نەمسا،مەجەڕ،تورکیا،بولگاریا)لەسەر شانۆی جەنگی جیهانی یەکەم لەڕۆژهەلأتی ناوەڕاست تەنانەت پێش ئەوەی تورکیا بچێتە شەڕەوە هەموو خێلّە کوردەکان نارەزایی و بێزاری خۆیان دەربڕی لەو نەخشەو پلانانەی کە دەسەلأتی تورکی گرتبویەبەر.سەبارەت بەو ئامادەکارییە گشتی یە لە کاتێکدا کوردەکانی دەرسیم و کوردستانی باشور بەرهەلّستی نەتەوەیی یان دەربڕی بۆ
ئەم خۆ ئامادەکردنە(التعبئە) (29).لەبەهاری (1914) راپەڕینی بەدلیس لەلایەن عبدالرزاق و بەهاوکاری کامیل بەگ و سەید تەها و سمکۆ رێك خرا گوایە بەپشتیوانی دەولّەتی ڕوسیا بەلأم هەروەکو لەبەلّگەکاندا هاتووە ڕووسەکان ئەو چەك وپێداویستیانەیان پێ نادەن کەپێشتر بەلّێنیان دابوو لەبەر کێشەو کۆسپ دروستکردنی ئەرمەنەکان لەبەرئەوە ئەم راپەڕینەش سەرناگرێ عبدالرزاق سالّی 1914 جارێکی تر دەگەڕێتەوە ڕووسیاو لە (پیتربرۆنگ )لەگەلّ کاربەدەستانی بەرزی ڕووسیا لەسەر جێ بەجێ نەکردنی بەلّێنەکان و هەروەها ئەو گرفتانەی هاتونەتە سەرڕێی ووتوێژ دەکات بەو هیوایەی ئەم جارەیان راپەڕینەکە بەڕێکوپێکی و بەیارمەتی دارایی و (مادی)و چەکی ڕووسیا سەرکەوتن بەدەست بێنێ کەچی پێی رادەگەیەنن کەخۆ لە تێکهەلّچوون لەگەلّ تورکیا بپارێزێ. پێشنیاری پێدەکەن بچێتە تەورێز لەوێ لەژێر چاودێری کۆنسولّی ڕووسیاو حاکمی تەورێز کە دۆستی ڕوسیایە ژیان بەسەر ببات.ڕووسەکان لەو دەمەدا هەلّگیرساندنی شۆڕشی کورد بەتێکدانی ئەو بەلّێنانە دادەنێن کە تورکیا بە مەسیحیەکانی کوردستانی باکووری دابوو هەندێ لە دبلۆماسیەکانی ڕووسیا راپەڕینەکانی کورد بە دەستکردی
کاربەدەستانی تورکی دەزانن تا تورکیا هیچ مافێك نەدا بەعیسایییەکان(30).کە شەڕ لەکوردستاندا پەرەی سەند کوردەکان هیچ گرنگیەکی ئەوتۆیان نەدا بە ڕاگەیەنراوەکەی

خەلیفەی موسڵمانان کە جیهادی ڕاگەیاند بوو بەڵکو ژمارەیەك پیاوی باڵادەستی کوردستان بە ئاشکرا دژایەتی خۆیان دەربڕی بۆ ئەم جیهادە زۆربەی زۆری خێڵەکان لەسەر بناغەی ئایینی هەڵوێستیان وەرنەگرت بەڵکو لەسەر بناغەی سیاسی نەتەوەیی بوو.

لەبەر ئەم هۆیەش هەروەك چاوەڕوان دەکرا هاوکاری و بەشداری کورد ئەوەندە زۆر نەبوو لەو هەوڵە سەربازی یانەی کە ئیمپراتۆریەت ئەنجامی دا.چونکە کوردەکان ڕازی نەبوون بچنە شەڕێکەوە کە ئامانجەکەی نامۆبێت و توانا سەربازییەکانی سوارە کوردەکان لە ئاستێکی زۆر نزم دابوە سەرکردایەتی سەربازی تورك تا ئاستێکی زۆر متمانەی بە کورد نەبوو.بۆیە بە پێی پێویست چەك و تەقەمەنی و ئەسپ و زەخیرەی بۆ دابین نەدەکردن وە یەکە چەکدارەکانی کورد بێ بەش بوون لە تۆپ و ڕەشاش هەروەها کەموکوڕی زۆر بوو لەژمارەی ئەسپەکان و هەڵهاتن لە خزمەتی سەربازی مۆرکێکی بەکۆمەڵی وەرگرتبوو. تەنانەت لەچەند مانگی یەکەمی شەڕەکە ژمارەی فەوجە کوردەکان لە( 800)وە دابەزی بۆ(300 )بۆیە سەرکردایەتی سەربازی تورکی یەکە

سەربازییە کوردەکانی لەهێڵی پێشەوەی بەرەی شەڕ کشانەوە و گواستی یەوە بۆ ڕیزەکانی دواوە(31).ئۆردوی تورکی بێ ئەوەی گوێ بداتە بێ لایەنی ئێران یەکلایەنە لەشکرکێشی بۆسەر قەفقاز دەست پێکردو ڕژایە ناو ئەرزی ئازەربایجانەوە.لەلایەکی ترەوە کەوتە هاندان و یارمەتی ئێڵەکانی کوردو ئەو ئێرانیانەی لەدەست زوڵم و زۆری دەسەلاتدارانی ڕووس هەلاتبوون بۆ ناوخاکی عوسمانی بەناوی جیهادو غەزاوە بەرەنگاری هێزەکانی ڕووس لەناو خاکی ئێراندا بکەن.بەو بۆنەیەوە حکومەتی ئێرانی کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ کاربەدەستانی ڕووسی و عوسمانی داوای لەڕووسیا کرد سوپاکەی لەشارەکانی ئێران بکێشێتەوە بۆ ئەوەی لایەنەکانی جەنگ بیانویان بەدەستەوە نەمێنێ تا لەشکر بهێنە ناو ئێرانەوە داواشی لەعوسمانیەکان کرد ڕێگا لە ئاژاوەگێڕی کوردەکان بگرن لەسنورەکانی ئەوداو ئۆردو کۆنەکەنەوە .تورك ئەیوت ئەگەر ڕووس سوپاکەی خۆی لە ئازەربایجان بکێشێتەوە. ئەویش خواستەکەی ئێران بەجێ ئەهێنێ

هیچ لایەکیان قازانجی لەوەدا نەبوو گوێ لەخواستەکانی ئێران بگرێ بەڵکو هەریەکەیان بەشێوەی خۆی هەوڵی جێگیرکردنی خۆی دەدا (32).
کاربەدەستانی رووسیا بۆ ئەوەی باری کوردستانی ئێران سەختر نەبێت بەتایبەتی کە سمکۆ دەستی کرد بەپەلاماردانی هەندێ ناوچەلەناو خاکی تورکیاداو هەوڵیاندا جڵەوی پێشەوا کوردەکان بەتایبەتی سمکۆ بگرن لە11ی ئەیلوولی 1914 مینۆرسکی نوسیویەتی کەکردەوەکانی سمکۆ لەوانەیە ببنەهۆی بچڕانی تەواوی
پەیوەندییەکانمان(33).دوورکەوتنەوی سمکۆ لەرووسیا شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو. لەکانوونی دووەمی 1915دا کە سوپای سەڵماس و قوتوری جێهێشت بەئاشکرا چووە پاڵ تورکیا دڕندانە کەوتە قەلاچۆکۆدنی عیسایییەکان نزیکەی هەزار کەسی لێ کوشتن بەلآم هەر کە سوپای رووس هێرشی هێنایەوە هەوڵی دا خۆی لەبەرچاوی کاربەدەستانی رووس شیرین بکاتەوە.ئەوە بوو چەند نامەیەکی بۆ کونسوڵی رووسیا لە (خۆی)نارد کەچی لەهەمان کاتیشدا پەیوەندی نهێنی لەگەڵ کاربەدەستانی تورکیا بەست بوو ئەمەش کارێکی خراپ بوو بۆرووسەکان چونکە بەئاشکرا رووسەکان پشتیوانیان لە حکومەتی ئێران دەکرد.کە سوپای رووس کەوتە خۆی سمکۆیان گرت و رەوانەی (تفلیس)کرا پاشان ناوچەی قوتور و (خۆی) هێمن بووەوە لەمایسی سالی 1915دا عبدالرزاق بەدرخان و سەرۆکی (خۆی)تەیموورخان و هاوکارانیان گیران و رەوانەی بەشی رووسی جولفە کران ژمارەی هەموو گیراوەکان 20کەس بوون12 کەس لەهاوکارانی عبدالرزاق و 8کەس لەهاوکارانی سمکۆ بوون تاوانی ئەوەیان خستەپاڵیان کە لەکاتی شکانی سووپای رووسی لە دیلمان وویستویانە لە پشتەوە پەلاماریان بدەن مامۆستا ئەحمەدی شەریفی لەم رووەوە دەڵێ لەدوورخراوەکاندا سەید تەهاشیان لەگەڵدا بووە.لەوێشەوە بۆ سیبریا رەوانە کران ئەوانیش لەزینداندا پەیوەندیان بە (ئەتاربیکۆفی)گەورە پیاوی بەلشەویکەوە کرد (34).

# لە سەروبەندی جەنگی جیهانی یەکەمدا
# (ڕاپەڕینی جەنگەڵیەکان)

لەکوردستانی ڕۆژهەلاتدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ باردودۆخی ژیانی خەڵکی کوردستان لەخراپیدا بوو باج و خەراج و زۆرەملیێ وای لەکوردەکان کردبوو بیر لە ڕاپەڕینێکی تر بکەنەوە ئەو ڕاپەڕینە لەمێژوودا بە(بزاڤی جەنگەڵی)ناسراوە لەهەرێمی گەیلان و ڕەشت و خوارووی دەریای قەزووین ئەم بزافە لەئاستی پێگەو فەرماندەوە نەتەوەو ڕەگەزی جیای لەخۆگرتبوو بەجۆرێك جگە لە گەیلانیەکان خەڵکانێکی زۆری ناوچەکانی تری ئێرانیش بەشداریان تێداکرد.بەلام ڕێبەرانی بزاڤەکە ئامانجە نیشتیمانیەکانیان تێکەڵی دروشمی دینی کردبوو بەجۆرێك ئەنجومەنێکی شۆڕشیان پێك هێنا بەناوی (یەکێتی ئیسلامی)بۆیە ئەڵمانەکان و عوسمانیەکان لەسەر پەتی ئاینی یاری یان دەکرد. هەوڵیاندا سوود لەو بزوتنەوەیە ببینن بۆ ئاراستەکردنی تواناکانی لەدژی دوژمنەکانیان لەو وولاتەدا کە خۆیان لەڕووسیاو بەریتانیادا دەبینیەوە لەڕاستیدا توانیان تارادەیەکی باش خۆیان لەسەرانی ڕاپەڕینەکە نزیك بکەنەوە تەنانەت ئەفسەرانی ئەڵمانی و عوسمانی بەناوی ڕاهێنانەوە لەڕیزی هێزەکانی شۆڕشدا جێگای خۆیان کردبوەوە ئەفسەری ئەڵمانی کە ناوی (فۆن پاشن)بوو ببوە نزیکترین ڕاوێژکاری کوچك خانی سەرۆکی شۆڕشەکە خەڵکانێکی زۆری جوتیاری کوردیش ڕوویان کردە (گەیلان)ی مەڵبەندی شۆڕشەکە، لەناو ئەو کوردانەی کەزیاتر ناوبانگی پەرەی سەند خالۆ قوربان بوو جگە لەچەند کەسایەتیەکی گەورەش بەدەرکەوتن وەك(کەریم خان)(قەنبەر خان)(خالۆ حشمەت)(باباخان) کەخزمی خالۆ قوربان بوون.

بەلآم لەهەموویان بەناوبانگ تر خالۆ قوربان بوو کە بووە(قۆمسێر)(35). ئەم پلەیە لەئاستی وەزیری جەنگ دابووە پاشان جیا بۆوەو تەنانەت خیانەتی کرد لەمیرزا کوچك لەهەلێکدا میرزا کوچکی کوشت و سەرەکەشی بردەوە بۆ ڕەزاشای گەورە.پاشان خالۆ قوربان لەیەکێك لەشەڕەکانی دژبە شۆڕشی سمکۆ کوژرا(36).

لەهاوینی 1916باری سوپای ڕووسیا لە ڕۆژئاوای ئێران دا سەخت بوو دوویارە سەرکردە سوپای یەکان سمکۆیان بیرکەوتەوە ئەگەرچی ڕادەی گوناهباری لەوەو پێشی سمکۆ هەرچەندبوویێ بەلآم ڕۆڵی کەم کەس هەبوو لەکوردستانی ئێران وەك ئەو سەنگی هەبێ و بتوانێ ژمارەیەکی زۆر کورد دوای خۆی بخات . کەسی تریش نەبوو کە ڕووسیا پشتی پێ ببەستێ بۆیە هەوڵ درا بەهەر جۆرێك بێ وای لێ بکرێ پشتی ڕووسیا بگرێ لەئەنجامدا لەسەرەتای سالی 1916سمکۆ ئازادکراو گەیشتەوە سەلماس ڕووسەکان سیاسەتێکی نەرمیان لەگەڵ سمکۆ نواند.بەلآم لەسەرەتادا لەبەرنەبوونی متمانەی هاوبەش لەنێوانیاندا پەیوەندی یەکان لەگەڵ کاربەدەستانی ڕووسیادا دۆستانە نەبوو چەند جارێکیش جەنەڕاڵ(چێرنۆبۆف) داوای کرد کە بچێت بۆ(خۆی) بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ سمکۆدا بەلآم سمکۆ لەترسی گرتن نەچوو بەلآم ڕوونی کردەوە کە ئامادەیە دژی تورك بجەنگێ بەو مەرجەی قەفقاس و بەتایبەتی سەر لەشکری ئازربایجان بەلێنی ئەوەی پێ بدات کە نایگرن(36).

بەپێی قسەی (ئەکیمۆفیچ)جێگری کۆنسوڵی دیلمان دەڵێ سمکۆ تەنها بەو مەرجەی بەلێنی سەربەستی و ئازادی پێ ئەدرێ کەهەرچی چەکێکی لەبەردەستدایە دایینێ.بەلآم سمکۆ ئەمەی قبوڵ نەکرد زۆری نەخایەند بەرەو سنوری ئێران و تورکیا کشا لەبەرئەوەی (چێرنۆبۆف)نەیدەویست سمکۆ لەنزیکی لەشکرەکەیەوە بێت هەڕەشەی لێکرد کە ئەگەر نەگەڕێتەوە شوێنی خۆی لەشکرەکەی قەلآچۆ دەکا لەکۆتایی حوزەیرانی 1916سمکۆ گەیشتە (خۆی)لەگەڵ(کیرسانۆف)ی سەر کونسوڵ دا گفتوگۆی دەست پێکرد. لەئەنجامدا سمکۆ داوای لێ کرد بۆ ئەوەی پشتگیری ڕوسیا بکات دەبێ ناوچەی سۆماو

برادۆستی بدەنێ(کیرسانۆف) ڕەزامەندی خۆی بۆ ئەم پێشنیارە بەکاربەدەستان ڕاگەیاند کەگوایە دەتوانرێ بەمە بڕواو متمانە بگەڕێنرێتەوە بۆ سمکۆ.زۆربەی نوێنەرانی سیاسی ڕووسیا لە ئێران ئەم هەنگاوەی (کیرسانۆف)یان بەدڵ نەبوو.بۆ وێنە(نیکیتین)زۆر بە گەرمی دژی ئەوە وەستا کە برادۆست و سۆما بدرێ بەسمکۆ ئەوەی هێنایەوە یاد کە کاتی خۆی هەمان هەڵوێست وای لە سمکۆ کرد کە چەکدارەکانی لە ورمێ هێرش بکەنە سەر لەشکری ڕووس.(نیکیتین)لەم بارەیەوە دەڵێ من ڕام وایە کە خولقاندنی بارێکی تایبەتی بۆ سمکۆ کاری دوولایەنی و دووڕووەکانی سمکۆ ناسڕێتەوە(37). لەگەڵ ئەوەشدا (کیرسانۆف) پێشنیاری کرد ئەگەر سمکۆ واز لەتالانی بهێنێ یارمەتیەکی مانگانەی پێنج هەزار ڕوپێی ئالتونی بۆ دابین دەکەن.

ئیگلتن لە کتێبەکەی( جمهوریەتی مهاباد)دەربارەی سمکۆ ووتویەتی سمکۆ گەنجێکی شۆخی لێهاتوو بوو هەر لە منداڵیەوە شارەزاو ڕاهاتووی ژیانی سەخت و پڕلە شەڕەشەق بووە ئەو بۆشایەی بە کشانەوەی ڕووس لە ناوچەکانی باکوری ئێران دا پەیدا بوو بوو.سمکۆ توانی ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە. لەناوچەکانی ئازەربایجاندا ئەو میسۆنێرانە لەو ناوچانەدا کە هەبوون گوردون پادۆك(GORDON.PADOCK)ی کونسولی ئەمەریکا لەتەورێز لەگەڵ سمکۆدا ڕێکەوتن کە مانگی پێنج هەزار دۆلار بدرێ بە سمکۆ بۆئەوەی ماوە بدرێ بەو میسۆنێرانە کە لەو ناوچانەدا بوون بەبێ گێچەڵ ئەو شوێنانەی کە تیایدا بوون بەجێ ی بێڵن بەمەرجێك هیچ شتێکی خۆیان لەگەڵ خۆیان نەبەن هەموو بەجێبێڵن حکومەتی ئێرانیش ناچار بوو دان بەدەسەلاتی سمکۆدا بنێت و کردیان بەحاکمی ئەو ناوچە شاخاوییانەی ئەکەونە ڕۆژئاوای گۆلی ورمێ وە(38).

سەیر ئەوەیە قۆزاقەکانی ڕووسیای تیزاری کەپاش شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917لەئێران دەمێننەوە دژی ڕژێمی بەلشەفیکی بەسەرۆکایەتی(فیلیپۆف)دەبن بەبەشێك لەهێزەکانی ئێران و دژی سمکۆ دەجەنگن لەولاشەوە سۆڤیەتیەکان بەتایبەتی کونسوڵەکانیان لەورمێ و تەورێز و

ماكۆ بەدەستوری دەوڵەتەكەیان یارمەتی ڕژێمی ئێران دەدەن و داوای لێدەكەن بۆ لەناوبردنی سمكۆو شۆڕشەكەی هێزی زۆرتر بنێرێتە ناوچەكە.لەلایەكی ترەوە دەڵێن هاوڕێ(ئارالۆڤ) .
باڵوێزی سۆڤیەت لەئەنقەرە پرۆتیستی داوەتە توركیا كە بۆچی سمكۆیان دەسگیرنەكردووەو تەسلیمی ئێرانیان
نەكردۆتەوە.ڕووسەكان دەڵێن دەبێ ئێمە لەناو ئەو كوردانەی هێشتا پروپاگەندەی ئینگلیزو محموود(مەبەست شێخ مەحموودە)و سمكۆیان پێ ڕانەگەیشتووە كاربكەین و دەوڵەتێكی لەمپەر لەنێوان ئەرمینیاو كوردستانی ئینگلیز دروست بكەین .هەبوونی كوردستانێكی ئینگلیز لەتەنیشتمان بۆ ئێمە زۆر گران تەواو دەبێت.بۆئەوەی ئەو شتە ڕوونەدات پێویستە دەست بەكاربین.بەڵام بیروڕای كونسوڵی سۆڤیەت لەئەرزڕۆم بەپێچەوانەی كونسوڵی بایەزیدە. جێی سەرسوڕمان نی یە هەندێ بەڵگە باسی هاوكاری كونسوڵەكانی ڕووسیاو توركیا دەكەن لەكوردستانی ئێران دژی چالاكیەكانی شێخ مەحموود و سمكۆو كوردەكان.زوڵم و زۆری عەجەم و جێگیركردنیان لەناوچەی ماكۆ و دەست بەسەراگرتنی زەوی و زاریان و سەرجەم دەركردنیان بابەتێكی تری بەڵگەكانە.......(39).

# هاوپەیمانەکان و هەوڵدان بۆدابەش کردنی ناوچەکە لە ڕێکەوتنی سایکس بیکۆی ساڵی1916دا

بەریتانیاو فەرەنسا لە مانگی کانوونی 1915کەوتنە تەگبیر بۆ دابەش کردنی سەرزەمینی ئاسیای تورکیا لەلایەن بەریتانیاوە(سیرمارك سایكس )و لەلایەن فەرەنسەوە( جۆرج بیکۆ). بۆ سەوداو گفتوگۆ دانران پاش ئەوەی چەندین نامەیان لەگەڵ یەکتری گۆڕییەوە لەبەینی خۆیاندا ڕێکەوتن بۆ ئەوەی ڕەزامەندی ڕووسیاش بەدەست بهێنن لەبەهاری 1916چوون بۆ گفتوگۆ لەگەڵ سازانۆف وەزیری دەرەوەی ڕووسیاو باڵیۆزیفەرەنسی.لەنیسانی 1916دا لەسەر خواستەکانی ڕووسیا ڕێکەوتن.بەم جۆرە پێك هاتنی گشتی بەریتانی و فەرەنسی و ڕووسی لەسەر جۆری دابەشکردنی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و بەشی هەریەکەیان تەواو بوو کەتێکڕا بریتی بوون لە11 مادە و لەمێژوودا بەڕێکەوتنی سایکس بیکۆ ناسراوە بەپێی ئەم ڕێکەوتنە:

أ–ئەم ناوچانە بخرێنە سەر ڕووسیا (ئەرزڕۆم.تەرابزۆن.وان .بتلیس لەڕۆژئاوای تەرابزۆن تاسەر دەریای ڕەش).

ب–ئەم ناوچانەش ببن بەبەشی ڕووسیا ناوچەی کوردستان لەباشوری وان و بتلیس لەنێوان مووش.سیرت ئاوەڕێی دیجلە. جزیرەی ئیبن عومەر ئەوزنجیرە چیایەی بەسەر ئامێدی دا ئەڕوانێ تا ناوچەکانی مەرگەوەڕ.

2–ئەو ناوچانە ببنە بەشی فەرەنسا ناوچەی کەنار دەریاکانی سوریا ولایەتی ئەدەنە ئەو سەرزەمینەی لەجنوبەوە بەخەتێك لەعەنتاب و ماردینەوە تاسنوری ڕووسیا لە شیمالاوە بەخەتێك لە ئالاداخەوە بەناو قەیسەری(ئاك داخ جیلوداخ–زارابۆئیجن–خەربوت) دا تێ ئەپەڕێ.

3-ئەوناوچانەش ببنە بەشی بەریتانیا ناوچەکانی میزۆپۆتامیا و بەغداد هەروەها میناکانی حەیفاو عەککا لەفەلەستین.

4-ئەو ناوچانەی ئەکەونە بەینی ناوچەکانی ژێردەسەلآتی فەرەنسی و بەریتانی کۆنفیدراسیۆنی چەند دەولەتێکی عەرەبی یا دەولەتێکی عەرەبی تێدا دروست بکرێ ئەویش دابەش بکرێ بەناوچەی نفوزی فەرەنسی و نفووزی بەریتانی.بەم پێیە سوریاو ویلایەتی موسلّ ئەبوونە ناوچەی نفوزی فەرەنسی و ئەو سەرزەمینەش کەلەفەلەستینەوە درێژئەبێتەوە بۆ سنوری ئێران ئەبووە ناوچەی نفووزی بەریتانی.

5-ئەسکەندەروونە ببێتە میناکەی ئازاد.

6-فەلەستین(بەدەولەت)بکرێ.

دواتر لەنیسان-ئابی 1917دا ئەم رێکەوتنامەیە بەهەندێ دەستکاری کەمەوە لەلایەن بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیاوە سەرلەنوێ لە (سان جین دەمورین) دووبارەکرایەوە(40).

لەم رێکەوتنەدا بەلّێنە ئاشکراکانی کاربەدەستانی ئەم دەولەتانە بەگەلانی ناوچەکە بەتەواوی خرابوونە پشتگوێ و ئاواتە نەتەوایەتی یەکانی گەلانیش لەرۆژهەلآتی ناوەراست پێ شێل کران. کاتێکیش پەیمانی سایکس بیکۆ چووە بواری جێ بەجێ کردنەوە هەر لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیان جارێکی تر دەستکاری هەندێك لەبرگەکانیان کردەوە .ئیتر خەلّکی کوردستان کەوتنە قۆناغێکی گەلێك ترسناك تر لەپێشوو . جاری یەکەم لەسەردەمی سەفەوی و عوسمانیەکان لەسالّی 1514ز کوردستان دابەش کرا بەسەر نفوزی دەسەلآتی سەفەوی و ئەویەشەی تری عوسمانی بەلآم ئەم جارە دابەش کرا بۆچوار بەش .مەترسیەکە زیاتر بوو لەجاران هیچ کام لەکوردەکانی بەشەکانی تر نەیان دەتوانی پشتگیری یاخود بەشداری راستەوخۆ بکەن لەبەرگری کردن بەوپێیەش دووجار تاوانبار دەکرا جاری یەکەم بەبیانووی ئەوەی لەوولآتێکی ترەوە هاتووە و سنوری پێشێل کردووە جارێکی تر بەدەرچوو لەیاساو بەچەتەو رێگرو ئاژاوەچی تۆمەتباردەبوو بۆیە ئەو هەموو خوێن رشتن و دەربەدەری و کۆمەلّکوژی و

ڕاگواستنەی کە تووشی خەڵکی کوردستان بوو تۆباڵی لەئەستۆی دەوڵەتی بەریتانیاو دەوڵەتی فەڕەنسایە. دوای تێپەڕبوونی 97ساڵ بەسەر ئەم دابەش کردنەدا هێشتا خەڵکی کوردستان باجی ئەو پەیماننامە شومە ئەدەن کە دەکرێت هەڵمەتێکی نەتەوەیی و نیشتیمانی دەست پێ بکرێ و کەمپینێك ڕابگەیەنرێ لەکوردستان و ئەورووپا بەپێی جارنامەی جیهانی مافی مرۆڤی گەلان بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیماننامەیەو دەوڵەتی بەریتانیاو فەرەنسا داوای لێبوردن لەتێکڕای خەڵکی کوردستان بکەن و کاریۆ ئاوەدانکردنەوە و قەرەبووی زۆرترین زیانە ماددیەکان بکرێتەوەو پشتگیری خەڵکی کوردستان بکەن تازیاتر لەسەر پێ ڕابوەستێ هەر لەم سەروبەندەدا ڕووسەکان لەکۆتایی تشرینی یەکەمی ساڵی 1916زدا حکومەتی ئێرانی ناچارکرد دەستوور بداو سمکۆ بکرێت بە پارێزگاری سۆماو برادۆست و چارێ سمکۆش بەڵێنی دا ئاسایش لەناوچەکەدا بچەسپێنێ.هەرواش بوو بەچوونی سمکۆ بۆ ئەو ناوچانە ئارامی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا تەنانەت ئێرانیەکان تێگەیشتن کە بوونی سمکۆ گرنگە هەربۆیە ئەحمەد شا بەفەرمی فەرمانی دا سمکۆ بکرێتە حاکمی سۆماو برادۆست(41). کاتێك ڕووسەکان لەئەنجامی شۆڕشی ئۆکتۆبەردا هێزەکانیان کێشایەوە لەشکرەکەی جەنەڕاڵی ڕووس(باراتۆف) ئەو ناوەی بەجێهێشت سمکۆ ئەوەی بەهەل زانی توانی ژمارەیەکی زۆر لەچەکەکانی ئەولەشکرەی دەست بکەوێت کەلەناو ئەوانەدا هەندێ چەکی قورسی تێدابووە بەمەش سمکۆ بەهێزتربوو ناوبانگی زیاتر بڵاوبوەوە.ئەوەی شایەنی باسکردنە جگە لەو چەکانەی کە (مارتن ڤان برۆنسون)باسی کردن کە بۆ کورد مابوونەوە ڕووسەکان ژمارەیەکی زۆرتر لەو چەکانەیان دابوو بەئاسووریەکان کەلەو ڕۆژەدا بەئاوارەیی و لەدوای ڕاونان و دەرکردنیان لەتورکیاوە بۆ ئەو ناوچە کوردیانە ئەوانیش زۆریان لەو چەکانە دەست کەوت کە ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆیانەی کەترسی خستبوە دڵی سمکۆوە بەرامبەر بە ئاسوریەکان- ئەمەش وای لە ئاسوریەکان کردزیاتر لەقەوارەی خۆیان پێ ڕابکێشن و زیاتر یاری بە ئاگریکەن کەئەم بابەتە لەدوای دا زیاتر باسی دەکەین و دەرئەنجامەکەشی ڕوون دەکەینەوە.

شۆرشـی ئۆکتۆبــەری سۆسیالیسـتی سـاڵی 1917کاریگـەری چارەنوسـازی هـەبوو لەسـەر بـارودۆخی ئێـران لـەدوای سـاڵەکانی جـەنگ و دوای برانـەوەی جـەنگیش بەشـێوەیەکی دیـارتر لەبەرئـەوەی بەلشـەفیەکان دوای ئـەوەی گەیشـتنە دەسـەلآت لەڕووسـیا یـەکێتی کۆمارەکـانی سـۆڤیەتی سۆشیالیسـتیان پێك هێنـا هێزەکانیـان کـە لـەئێران کشـاندەوە بریاریانـدا دەسـت لەکاروباری ناوخۆی ئەو وولآتە دراوسێ یە وەرنەدەن(42). دوای وەستانی شەڕ لەگەڵ تورکیـا وڵاتـانی ئەمـەریکاو ئـەورووپا بەشـێوەیەکی زۆر سـەیر هاوسـۆزیان لەگـەڵ ئەرمەنـەکان دەربـڕی کاتێك کە لەسـەرەتای نیـوەی دووەمـی سـەدەی نۆزدەهەمـدا ئەرمەنـەکان هـەوڵی دابینکردنـی سەربەخۆیی یان دا سەرەتا پارتێکیان دامەزراند سەرۆکی وولآتە گەورەکان لەکۆنگرەی ئاشـتی پاریس و لیژنەی پـەیمانی سـیڤەردا بریاریانـدا وولآتێکـی سـەربەخۆ بـۆ ئەرمەنـەکان لەناوچـەی ئەرزیرۆم .ترابزۆن،وان.بـەتلیس پێك بێنن سیاسـەتمەدارانی تورکیـا دژی ئـەم بریـارە وەسـتان وتیان ئەرمەنەکان کەمایەتیـەکی 47,000کەسـێن لەوناوچـانەدا و موسـڵمانەکان واتـە تـورك و کوردەکان پتر لەسێ ملیۆنن و پێك هێنانی دەوڵەتی ئەرمەنسـتان لـەو دۆخـەدا نـاڕازی کـورد و تورکەکان لێ دەکەوێتەوە بەتایبەتی کوردەکان کە هاومێژوون لەگەڵ ئەرمەنەکان لەو ناوچـانەدا ژیاون و بەتەواوی پڕ چەکن و ناوچە ستراتیژیە سەربازیەکانیان بەدەستەوەیە(43). ئەگەرچـی کورد تەنها نەتەوەی گەورە بوو کەلەسالآنی جەنگ دا بەدڵسۆزی ئیمپراتۆری عوسمانی مایـەوە بەڵام لەچاو هەموو نەتەوەکانی تردا جگە لەئەرمەن .کورد ئـازارو کـوێرەوەری زۆری بەدەست تورکەوە بینی سەرباری ئەوەی کوردستان بوو بەکەلاوەیەکی گەورەو جگە لەوانـەی لەمەیـدانی شـەڕدا یـان بـەهۆی شـەڕەوە کوژران.کاربەدەسـتانی تـورك (700)هـەزار کوردیـان بـەبیانووی ئـەوەی ناوچـەکانیان بۆتـە مەیـدانی شـەڕ بـەزۆر لەکوردسـتانەوە بـۆ نـاوەوەی ئـەنادۆڵ ڕاگوێزرایـەوەو مـاڵ و داراییـان زەوت کـردن بەشـێکیان لـەڕێگادا مـردن و ئـەوانی تـر هـەژارو دەربەدەر بوون شتێکی ئەوتۆی لە کوێرەوەری گەلی ئەرمەن کەمتر نیـە لەکاتێکدا کـوێرەوەری ئەرمەن لەسەرانسەری دنیـادا دەنگـی دایـەوە کەچـی کەسـێ لەسـەر کـوێرەوەری کـورد هـەڵی

نەدایە(44). هەلوێستی کورد بەرامبەر بەئاسوورییەکان بەپێی بیرەوەری ڕۆژانەی مێجەرنوئێل دەلێ کورد وەکو خۆیان تەماشای ئاسوریەکان دەکەن بۆیە دەلێن تاکە موویەك ئێمەو ئاسوریەکان جیادەکاتەوە.بەلام نێوان ئێمەو ئەرمەن شاخێك لێکمان
جیادەکاتەوە(45).سمکۆو سەید تەها لەکوردستانی ئێران و هەم لەبەشە کوردییەکەی تورکیا سەرکەوتنەکانیان زۆر بەرچاو بوو سمکۆ دەیویست تا تەوریزهەموو ناوچەکە بخاتە ژێردەستی خۆی و پەیوەندی بەسەرۆك هۆزو عەشایەرەکانەوە دەکرد کە بۆ بەهاری داهاتوو ئامادەبن بۆ ئەم مەبەستە سمکۆ لە هەوڵ دابوو کەلەڕێگەی دۆستەکانیەوە کەبتوانێ هاوکاری ڕووسەکان بەدەست بهێنێ.نامەیەك ئاراستەی کونسولی ڕووسیادەکات ئەمەش لەدیکۆمێنتەکانی ڕووسەکان دا وەرگیراوە کەد.ئەفراسیاو هەورامی وەریگێڕاوەبۆکوردی بەناوی(کورد لەئەرشیفی ڕووسیاو سۆڤیەتدا) هاتووە کە سمکۆ دەلێ( من بایەخێکی زۆر دەدەم بەگەورەیی دەولەتی سۆڤیەت کە بۆ ڕزگاری مرۆڤایەتی کەوتۆتە خزمەت یەکێك لەمەبەستە ڕاگەیەنراوەکانی دەولەتی مەزنی بەڕێزتان ئەوەیە دەیەوێ گەلانی چەوساوە ئازادبن ئەگەر لەدنیادا گەلێکی بەشەرەف و مێرخاس هەبێت کە تائێستا سەربەخۆیی و شانازی خۆی بەدەست نەهێناوەو دراوسێی لەمێژینەی ئێوەیە و بەڕاستی پێویستی بەیارمەتی یە ئەوا گەلی کوردە کەمنیش یەکێکم لەو گەلە.من و تەواوی گەلی کورد لەو باوەڕەداین تەنها دەولەتی مەزنی یەکێتی سۆڤیەت دەستی یارمەتی ڕاستەقینەو هاوکاریمان بۆ درێژ دەکات.نەك تەنها ئێمە دەخاتە ژێربالی خۆی بەلکو لەباوەشیشمان دەگرێ من لەناخی دلەوە ڕایدەگەیەنم کەئامادەم هەموو دەستورەکانی دەولەتی بەشەرەف و مرۆڤ دۆستی ئێوە جێ بەجێ بکەم) ئەم هەولەی سمکۆ وەك جاری
پێشوو بێ ئەنجام بوو.سمکۆ هەمیشە سیاسەتێکی تارادەیەك نێوەندگیری دەکرد لەبەینی تورکەکان و ڕووسەکاندا.حسابێکی زۆریشی بۆ بەریتانیاو فەرەنسادەکرد بەتایبەتی بەریتانیەکان. بەلام لەم بارودۆخەی کە سمکۆو تێکرای ناوچەکەی پێدا تێ دەپەڕی .دەبوایە

لەو شێوە نامانە بنووسێ و بتوانێ پشتیوانییەك لەلایەن ڕووسەکانەوە مسۆگەربکات.ئەگەر یارمەتیش نەبێ خۆ دەیانتوانی یارمەتی بێ سنوری ئاسوریەکان نەدەن بەو شێوەیە لەگەڵ پاشەکشەی ڕووسەکان لەناوچەی ئازەربایجان و بەجێهێشتنی ئەو هەموو چەك و تەقەمەنی و کەل و پەلی سەربازی یەی کەخۆی لەخۆیدا پشتیوانی ماددی و مەعنەوی بوو.سمکۆ باش دەیزانی چی دەنوسێ .بەچ مەرامێك ئەو نامەیە ئاراستەی ڕووسەکان دەکات.لەپاشان کۆمەڵێك نامەی تری هاوشێوەی ئاڕاستەی ئینگلیزەکان کرد.هەوڵێکی زۆری دا بۆ بەدەست هێنانی پشتیوانی. کەلەداهاتوودا زیاتر باسی دەکەین ئەوەی کە گورزێ کاریگەر بوو بۆخەڵکی کوردستان (پەیمانی سایکس بیکۆ) بوو .کە وورده وورده بەعەمەلی کاری پێ دەکرا.ڕۆژلەدوای ڕۆژیش بارودۆخی کوردستان لەڕووی ئابوری و کشتوکاڵیەوە بەرەو خراپ بوون دەچوو تەنانەت خەڵکانی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی سمکۆ پەنایان بۆ ناوچە ئارامەکان دەبرد برسێتی و بێ کاری زۆری بۆخەڵکی ئەو ناوچانە هێنابوو.ئاسووریەکانیش هەمیشە لەکەمینەدابوون بۆهەرجموجۆڵێك.سمکۆ جگە لەحکومەتەکانی ئێران و تورکیا تووشی بەلایەکی تریش بوو بوو کاتێك ئاسوریەکان لەناوچەکانی خۆیان قەتڵ و عام کران لەلایەن سوارەی حەمیدی و بەفەرمانی ڕاستەوخۆی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم و فەرماندە سەربازی یەکانی تورك. ئەوەی ڕەوی کرد.لەناوچەکانی پڕکێشەی کوردەکاندا گیرسانەوە ئەمانەش ئەوەیان بەهەل زانی کەکورد بەشەڕی تورك و ئێرانەوە سەر قاڵە گرەوی خۆیان لەسەر مەسەلەی شکستی کوردەکان دەکرد.بوونی هێزی مرۆیی و چەك و تەقەمەنی زۆری بەجێ ماوی ڕووسەکان وای لەسەرانی ئاسوری کردبوو .چۆن بتوانن کوردەکان لەو ناوچانە دەرپەڕێنن وە هیچ کاتێك مەرامەکانیان نەدەشاردەوە.ئەمانە وای لەسمکۆ کرد بیر لەحاڵی خۆی و خەڵك و وڵاتەکەی بکاتەوە.بەمەرجێ هیچ نەتەوەیەك وەك خەڵکی کوردستان هاوسۆزی بۆ ئاسوریەکان و ئەرمەنیەکان نەبوو.تەنانەت خواردن و جێگای خۆیانیان لەگەڵ دابەش کردن.سوڵتان عبدالحمیدی دووەم لەیادەوەرییە سیاسیەکانیدا دەڵێ(تۆمەتبارکردنی ئێمە بەوەی کە

لێبوردەنین ئەگەر مانایەکی هەبێت ئەوە ئاماژەیە بۆ نەزانینی خاوەن تۆمەتەکە،ئەگەر ئێمە لەو لێبوردەیەی ئێستا هەمانە کەمترمان هەبوایە .ئەوا ڕۆژمان بەم ڕۆژە نەدەگەیشت و لەحاڵەتێکی پتەوترو بەهێزتردا دەبووین ئەگەر گروپە ناموسڵمانەکانی ناو وولآتەکەمان ناچار بکرانایە ببنە موسڵمان ئەوا ئەمڕۆ داخی ئەو دووبەرەکیەمان نەدەخوارد کەلە جیاوازی ئاینەوە سەری هەڵداوە)(46).خوێنەری بەڕێز ئەگەر تۆزێك شیکردنەوە بۆ ئەم رایەی سوڵتانی عوسمانی بکەین. ئەوسا چ گەلی کوردو ئاسوری و ئەرمەنەکانیش زیاتر لەمەرامی تورکەکان شارەزاتر دەبوون کە بە چ ڕۆحێتێکەوە سەیری غەیرە ناموسڵمانەکانیان کردووە.چۆنیش مامەڵەیان لەتەك کردوون کەچی برا ئاسووریەکان دەبوایە لەسەنگەری دژایەتی تورکەکاندا بوونایە بەلآم بەداخەوە دەیانویست بەهەر شێوەیەك بوە ئەوەی بەسەر خۆیانیان هێنا ئەوانیش بەسەر کوردیدا بهێنن.ئەمانە وای لە سمکۆ کرد.هەمیشە بەگومان بێت لەبەهێزبوون و پەیوەندی یە فراوانەکانیان.لەهاوین و پاییزی 1917چەند جموجوڵێ چەکداری بە ئاشکرا بەرپابوو. لەهەندێك ناوچەی کوردستانی تورکیا وەك(دەرسیم.خەرپوت. وان و دیاربەکرو بەتلیس)بەو جۆرەش بارودۆخی باشورو باشوری ڕۆژئاوا لەوپەڕی دژواری دا بوو .بزافە ئازادیخوازەکانی کورد یەکیان گرت لەگەڵ بزاڤە عەرەبیەکاندا لەبەردەم مەترسیەکانی ئینگلیز لەباشورەوە رووسەکانیش لەباکورەوە.دوای ئەوەی هێزێکیان پێك هێنا لە دواوەی هێزە تورکیەکان کە وەك بەرەی دووەم وا بوو.تورکەکان و ئەڵمانەکان نەیانتوانی بەو هۆکارانەی کەبەردەوام بەکاریان دەهێنا کاریگەری بکەنە سەر کوردەکان و هەوڵەکانیان بێ ئاکام بوو.لەئێرانیشدا پشێوی دەستی کێشابوو بەسەر کوردەکانی ئێراندا و لەسەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمدا ئەمەش ئەو هەلەی ڕەخساند لەبەردەم سەرکردەی خێڵەکوردیەکان کەبەشێوەیەکی سەربەخۆ کاریکەن مناوەرەش بکەن لەنێوان تورکە هاندەرەکان لەلایەن ئەڵمانیاوە لەگەڵ رووسەکان کەدەیانویست دەسەلآتی تەواوی خۆیان بسەپێنن بەسەر باکورو ڕۆژئاوای ئێراندا(47).

دوای مۆرکردنی رێکەوتنی ئازربایجان لەبەرەی قەوقاس لە 18کانونی یەکەمی 1917 راستەوخۆ تورکەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ شکاندنی ئەو رێکەوتنە.وەرۆڵێکی گرنگیان دانابوو بۆ کوردەکان لەنەخشەو پلانە فراوانخوازەکەیان لەقوڵی رۆژهەلات و باکوری رۆژهەلات دەستیان کرد بەبلاوکردنەوەی پروپاگەندەی هاندەرانە لەنێو کوردەکان لەدژی ئەرمەنەکان وچەند یەکەیەکی تێکدەر پێك هێنرا سوپای سێی تورکی لەبەرەی قەوقاس وە لە12ی شوباتی 1918ئەو هێڵە سنوری یەی بەزاند کە رێکەوتنەکەی (ئازربایجان) دیاری کردبوو.وە هێرشەکەیان بەرفراوان کرد لەرۆژهەلاتدا .ئەوە بوو هێزەکانی تورکیا توانیان دەست بگرن بەسەر هەموو ئەو ناوچەو زەوی وزارانەی کەرووسەکان داگیریان کردبوو.تا سالی 1915کە ئەمە ساتەوەختی مۆرکردنی پەیماننامەیەکی ئاشتی(بریست–لیتۆفسك) بوو لەنێوان رووسیای سۆڤیەت و دەولەتە گەورەکانی یەکێتی چوارقۆلی (1ی ئازاری 1918.پەیماننامەی (بریست–لیتۆفسك)بوو بەبنەمایەك بۆ گەرانەوە بۆ رێکەوتنامەی بەرلین سالی1878کە بەپێی ئەم رێکەوتنامەیە بەشێك لەئەرمینیای رۆژئاواو کوردستانی باکور بوونە پشکی رووسیا.تورکەکانیش پەلەیان کرد لەبەرجەستەبوون. ئەو هەلانەی کە هاتە پێشەوە لەئاسیای رۆژئاوا و ناوچەی قەوقاس لەدوای بەرپابوونی هەردوو شۆرشی شوبات و ئۆکتۆبەری 1917کەبریتی بوو لەداروخانی بەرەی قەوقاس و سوپای رووسیا هاتنە ناوەوەی چالاکانەی ئەلمانیاو ئینگلیزە بۆ ناو رووداوەکان(48).

ئەو بارودۆخە تازەیەی بەهۆی ئەو گۆرانەی بەسەر ناوچەکەدا هات جارێکی تر نەستۆریەکانی خستە ترسەوە وای لێ کردن بکەونە خۆیان بۆ ئەوەی ئەمجارەش نەکەونە ناوقەسابخانەی تورکەکان وەکو سالی 1915کە تێی کەوتن ئەوەبوو لەپاییزی ئەو سالەدا هۆزە سەربەخۆ ئاسوری یەکانی باشوری تورکیا بەسەرۆکایەتی رابەری ئایینی و نەتەوەیی خۆیان مارشەمعون هاتنە ئێران و شان بەشانی عیساییەکان لە رێگەی سەلماس و ورمێ نیشتەجێ بوون.بەم جۆرە دانیشتوانی نەستۆری ئەم ناوچەیە گەیشتنە دووبەرامبەر سالی 1917مارشەمعون گەورەی

پێنج هەزار چەکداری ئاسوری بوو کەبەهۆی بارودۆخی ناوخۆی حکومەتی ڕووسیاوە چەکەکانیان دەست کەوتبوو.نوێنەرە هاوپەیمانەکانی ناوچەکەش کۆششیان دەکرد هێزێکی تازە بدەنە ئەوان پێ یان خۆش بوو کە هێزی ڕووسەکان هەر بمێنێتەوە تا بەرامبەر تورکەکان ڕاوەستن و پێشیان لێ بگرن بەلام پێویستیان بەشەش هەزار پیاوی چەکداری عیسایی هەبوو.چونکە هێزێکی وا گەورە هەم لەلایەن موسڵمانەکانی ورمێ و هەم لەلایەن سەرۆکە کوردەکان هەڕەشەی لێ دەکرا بەتایبەتی لەلایەن سمایل ئاغای سمکۆی گەورەی شکاک(49).
ئەمە ڕاو بۆچوونی (ئیگلتن)ە سەبارەت بەترسی عیسایی یەکان بەرامبەر هەڕەشەکانی سمکۆ.بەلام ئەگەر پرسیاریکەین ئەو ناوچانەی دەوری گۆمی وورمێ وسەڵماس کە مەڵبەندی سەرەکی سمکۆو عەشیرەتەکەی بوو جگە لەشکاک کۆمەڵێ عەشیرەتی گەورەی تری کوردیش هەبوون لەو ناوچانەی کە عیسایی یەکان پێنج هەزار چەکداریان دروست کردبوو.
لەهەمان کاتدا پێویستیان بەشەش هەزاری تر هەبوو ئایا ئەم هەموو چەکدارەیان بۆ بەرگری کردن لەناوچە پێشووەکانی خۆیان بوو؟ یاخود بۆ بەرگری بوو لەو ناوچە نوێیانەی کەلێی نیشتەجێ بووبوون؟یان بۆ ئەوە بوو وا لەکوردەکان بکەن کە شوێنەکانیان پێ چۆڵ بکەن؟ئەمەش کارێکی لەسەرخۆو وردبینانەبوو کە گوند بەگوند کورد ناچار بەڕەوکردن بکەن بەرەو خوارەوە دەنا سمکۆ بۆ لەسەرەتاوە هاوکاری کردن و پاشان نارازی بوو لەکارەکانیان و لەفراوان بوونی دەسەڵاتیان .سمکۆ باش لەئامانجەکانیان تێگەیشتبوو.نەیدەشاردەوە کەبەمەترسی گەورەی دەزانین خۆ سمکۆ هێندەی ئەوان چەکداری نەبوو هەموو حکومەتەکانی تورك و ئێران هەندێ جار ڕووسەکانیشی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو بەواتایەکی تر سمکۆ بووبوە کۆسپ لە ڕێگایانداو خۆی کردبوە ئەو کەسەی حسابی بۆبکەن.ئەی نابێ بزانرێ عیساییەکان ئەم هەموو چەکدارەیان بۆچی یە؟لەکاتێکدا هەموو شوێنەکانی خۆیانیان لەتورکیا بەجێ هێشتبوو.هاتبوونە سەر خانەخوێ و هێشتا ئەوانیش بەگلەیی بوون لەکوردەکان.لەگەڵ

ئەوەشدا چ ئینگلیزەکان و چ ڕووسەکان و فەرەنسیەکانیش دڵی عیسایيەکانیان لا مەبەست بوو .ئەمەش بێ هۆ نەبوو کە لەداهاتوودا باسی دەکەین.

# کۆبوونەوەی نێوان و کوشتنی مارشەمعون

سمکۆ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گومانی زیاتر دەبوو بەرامبەر ئاسوری یەکان بۆ ڕاستی ئەم باسەش کە سمکۆ هەیبوو یەکێك لەکەسە دیارو ناسراوەکانی ئاسووری لەلێدوانێکدا دەڵێ( کە مافێکمان دەست بکەوێت ئەوا ئێمە ئەتوانین ئەو وڵاتەی خۆمان لەکوردەکان بپارێزین)مەبەست لە وولآتی خۆیان کوردستانە ئەمەش قسەی ئاغا بترۆس بوو لەگەڵ ئەوەشدا مارشەمعون زوو زوو داوای کۆبوونەوەی ئەکرد لەگەڵ سمکۆ هەرچەندە سمکۆ نەیدەویست ئەو کۆبونەوەیە ئەنجام بدات بەڵام زۆر بە ناچاری بۆ دواجار داوایان لێ کرد کەبچێتە کۆبوونەوەی چارەنوسساز لەگەڵ ئاسووریەکان بەسەرکردایەتی مارشەمعون چونکە مارشەمعون کەسایەتیەکی زۆر وریاو سیاسی و لێزان بوو بۆ ئەو مەبەستە داوای گفتوگۆو ڕێکەوتنی لەسمکۆ کرد تەنانەت شوێنی کۆبوونەوەکە ئەو دیاری کردبوو کە ماڵی تەیموور ئاغای کۆنەشار بوو تەیموور ئاغا جگە لەوەی کە کەسێکی کۆمەلآیەتی و پیاوێکی دەست ڕۆیشتوو ی سەر بەعەشیرەتی شکاك بوو بۆ ئەم مەبەستە مارشەمعون بەسمکۆ دەڵێت ئێوە چەند کەس دێن سمکۆ دەڵێ تۆ دەیزانی مارشەمعون دەڵێ ئێمە 150کەسین سمکۆش دەڵێ ئێمەش ڕازین ڕۆژی کۆبوونەوە دیاری ئەکەن بۆ ئەوەی بتوانن ڕێکەون لەسەر دروستکردنی ئیدارەیەکی کاتی بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکە کاتێك سمکۆ دەڕوات لەڕێگادا بە علی ئاغای برای دەڵێ ئەمڕۆ مارشەمعون دەکوژم ئێوەش ئاگاداربن کە گوێتان لەدەنگی تەقە بوو ئیتر ئێوەش پەلاماری ئاسورییەکان بدەن بەم تەکبیرەوە دەڕۆن و دەچنەکۆنە شار بۆ ماڵی تەیموورئاغا.ئەم کۆبوونەوەیە لەڕۆژی 1918/3/28دابووە، کاتێك سمکۆ دەچێتە ماڵەکە ئیتر مارشەمعونیش پەیدا ئەبێت بەجۆرێك دێت واخۆی پیشان ئەدا کەوەك پاشا خۆی بنوێنێ بەسواری گالیسکەیەك کەچەند ئەسپێك

ڕایدەکێشێ و پاسەوانەکان لەتەنیشتی ئەملاو ئەولای گالیسکەکەوە دەڕۆیشتن ئەویش دائەبەزێ و ئەچێتە مالّی تەیموورئاغا هەرچەندە تەیموور ئاغا جگە لەمیوانداری هیچی تر نازانێ لەمەبەستی دانیشتنەکە.پاشان دوای نان خواردن دێنە سەر باسی دروستکردنی حکومەتێکی هاوبەش .مارشەمعون هەرچی قسە دەکات سمکۆ هیچی پێ نابڕێت سەری ڕازی بوون دەلەقێنێ و بەردەوام دەبێ دەڵێ(ئەم سەر زەمینەی ئێمە کە دابەشە لەنێوان کوردستان و ئازەربایجان دا.ئێمەی لەسەرین لەکۆنەوە جێگای باب و باپیرمان بووە.جیابوونەوەمان لەیەکتری دەبێتە مایەی ناخۆشی بۆهەردوولامان و دوورخستنەوەمان لەو مەبەستە پیرۆزەی کە بۆی هاتووین .ئێستاش پێویستە هەردوولامان بێینە پێشەوەو زمان و ئاینمان بخەینە لاوە و دەستی برایەتی بۆیەکتری درێژبکەین دەست بخەینە ناو دەستی یەکترو ژیانێکی خۆش دروست بکەین لەناڕەحەتی یدا ڕزگارمان بێت .هەروەها ووتی ئێمە لەشکرێکی زۆرمان هەیە.بەلأم پێویستمان بەمەشق و خۆ ئامادەکردنی سەربازی هەیە لەناو ئێوەشدا سوارچاك زۆرە بەهۆی ئەوەی شەڕیان زۆر کردووە یان دیویانە.ئیتر ئەمەوێ ئێمەو ئێوە یەکێتی دروست بکەین و خۆمان لەچنگی دوژمن ڕزگاربکەین.دواجار مارشەمعون هاتە سەر ئەوەی باسی شەهیدەکانی کوردستان بکاو بڵێ لەبیرت چونەوە چۆن خوێنی باوك و براکەتیان ڕژاند لەپێناوی بەفیڕۆنەچوونی خوێنیان پێویستە بێینە براو تۆڵەی شەهیدانی کوردستان بسێنین و بەمافی خۆمان بگەین) دوای ئەوەی گفتوگۆ تەواو ئەبێت هەڵئەستن بڕۆن مارشەمعون دەیەوێ سمکۆ پێش بکەوێ بەلأم سمکۆ دەگەڕێتەوە دەمانچەکەی دەرئەکات چەند گوللەیەك لەمارشەمعوون دەدات کە پاسەوانەکان دەنگی تەقە دەبیستن ئیتر شکاکەکان ئامادەن و لەوەوپێش تەکبیر کراون و ئەوانیش بێ پرس پەلامار ئەدەن و ئیتر ئاسوورییەکان ڕەشە کوژ دەکرێن لەو کاتەدا علی ئاغا دێتە ژوورەوە مارشەمعون کەوتووەو علی ئاغا گوللەیەکی تری لێ دەدات .ئەوەی لەم کارەساتە ڕزگاری بوو تەنها کەسێك بووە کە ئەویش برای مارشەمعون بوو وەك دەڵێن لەناو باخەکانەوە دەرچووە کاتێك هەواڵ دەبەنەوە بۆ ئاسووریەکان ئەوانیش خۆیان ئامادە دەکەن

بۆ تۆڵەسەندنەوە لەرۆژی1918/4/2هێزێکی گەورەوتۆکمەی ئاسورییەکان هێرش دێنن بۆ سەر شکاکەکان ئیتر ئەوەی پێیان کرا کردیان دێ بە دێ بەهەرچی بگەشتنایە دەیان کوشت و گوندەکانیان دەسوتاند بەتایبەتی گوندی عەبدویی نشینەکان کەسانی وایان دەکوشت هیچ ئاگادارنەبوو لەوەزعی دنیا ژن منداڵ پیری پەککەوتە.ئەمانە لەژێر رەحمەتی تفەنگەکانیاندا بوون رەحمیان بەکەس نەدەکرد گوندی عەبدۆی یەکانیش لەو ناوچانەدا زۆربوون ئەو بنەماڵانە بوون کەسەر بەهۆزەکەی سمکۆ بوون چونکە عەشیرەتی شکاک لەدوو بەش پێك هاتووە(عەبدۆی.کاردار)بەهەمموویان 25تایەفەن.عەبدۆییەکان بریتین لە (پس ئاغا،ئیوەری،عـــــــــــــــەتمانی ،کەچــــــــــــــــــــەلی،نیعمەتی،مامەدی عەبدۆیی،شەکری،کزنی،مەندۆلەکی،قاچکی،بۆتان،چەرکۆیی،پاچـك)کارداریش بریتین لەم تایەفانە (پس ئاغا،دەلی،فەنەکی،خدری،نیسـانی،مامەدی،خەلوفی،گەورکی،موقری ،دری ، هەنارە،حەسەنی) جگە لەچەند عەشیرەتێکی تر هەمیشە شکاك وەك فیدرا سیۆن چەندان عەشیرەتی تری لەگەڵ بووەو تائێستاش ئەو نەریتە پەیرەو دەکرێ بەتایبەتی عەشیرەتی (مامش و مەنگورو هەرکی و خەیلانی)لەماوەی 1918/4/2 تا 1918/4/4زیاتر لە 450 کەسیان لەژن و منداڵ وپیریان کوشت یەکێك لەقوربانیەکان دایکی سمکۆبوو کە گرتیان هەرقاچێکی بەستراپەوە بەئەسپێکەوە بەو شێوەیە دایکی سمکۆ کوژرا سمکۆ لەم کاتەدا دەگەرێتەوە ناوچیاکان بەڵام عەشیرەتی هەرکی دێن بەهاوارەوەو سمکۆش لەگەڵ هێزی هەرکی دا دەگەرێتەوە پەلاماری ئاسورییەکان دەدەن دەیانشکێنن. ئەم کارەساتە دڵ تەزێنە گەلێك قسەو باسی لێ کەوتەوە هەندێك بەدەستی ئێرانیەکانی دەزانن و هەندێکی تر بەدەستی تورکەکان .بەڵام ناکرێ بڵێین کارێکی سەرپێی و بێ بەرنامە بووە بەپێی دیکۆمێنتی بەریتانیا ئەو بەڵگەنامانەی کەپارێزراوە دەڵێت سمکۆ زۆر راشکاوانە مەبەستی ئاشکرا دەکات دەڵێ(وای بۆچووم مارشەمعون بکوژم لەبەرئەوەی لەپشتی ئێمەوە پیلانی دائەنا دەست بەسەر باکوری کوردستاندا بگرێ)دەقی بەڵگەنامەی بەریتانیا ژمارە{F.037117781}بەرواری 12ی

کـانوونی یەکـەمی سـالّی 1921نوسـینەکانی د.ئـازاد گـەرمیانی و مسـتەفا پاشـایش لەنوسینەکانیدا ئاماژەی پێداوە.یەکێکی تر لەنووسەرە ئاسوریەکان کە (ئیشـومالیك)ە دەڵێ لەکۆبوونـەوەی تـەفلیس بریـاردرا دەوڵـەتێك بـۆ ئاسـووریەکان دروسـت بکـرێ لەسـەر خـاکی کوردستان بەسەرکردایەتی مارشەمعون بەپاڵپشتی ئینگلیزو فەرەنسی و تەنانەت رووسەکانیش ئەمەیان پێ چاك بوو.بۆیە بریار درا کـابتن (گراسی)ئەفسـەری هـەوالگری ئینگلیزەکـان بنێرنـە ورمێ و لەوێوە چاودێری و سەروکاری کارەکان بکات.ئەو چەك وتەقەمەنی ویارمەتی یە مـاددی یەی دەهات لەلایەن کاپتن گراسی یـەوە بـدرێت بەئاسـووریەکان ئـەرکی رێکخسـتنی هێزەکـانی ئاسـووری لەئەسـتۆگرت و راسـتەوخۆ سەرپەرشـتی دەکـردن .زۆری لەشـکری ئاسـووری و چەکداری کردنیان بەو خێراییە ئەمەش هۆیەکی گرنگە بۆئەوەی هەرچی زووتـرە سمکۆ فریـای خۆی بکەوێ و ئەو دوژمنە گەورەیە لەکۆڵ

بکاتـەوە(50).جگـە لـەم هـەموو کێشـە لابەلایـەی رووبـەرووی سمکۆ دەبـوەوە بـەڵام سمکۆ لەهەوڵی بەدەست هێنانی پاڵپشـتی کـوردی پارچـەکانی تردابـوە بـۆ درێـژەدان بەشۆرشـەکەی بۆئەم مەبەستە پەیوەنـدی کـرد بەشـێخ مەحمودەوە.بۆدروسـتکردنی پەیوەنـدی تونـدوتۆڵو تۆکمـە ئەمـەش لەبەڵگەنامـەکانی ژمـارە(355)رۆژی 1919/5/30نامەیـەکی کونسـوڵی فەرەنسابۆ وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا نوسینەکانی نـەجاتی عەبدوڵلا لاپـەرە 62 بـەڕوونی دەردەکەوێ.جگـە لەمـەش ئاسـوریەکان هەرچـەندە لەسـەرەوە لەگـەڵ سمکـۆ رێـك بـوون لەژێرەوەش رۆژانە چەند گوندی کوردەکانیان تالأن دەکردو دەیان سوتاند ئەمـەش وەك جـۆرە تاکتیکێك بوو

بەرامبـەر بەکوردەکان.مامۆسـتا حسـێن حـوزنی موکریـانی لەیاداشـتەکانیدا کەلـەم دواییـەدا بەخـەتی خـۆی بلاوکرایـەوە(51). دەنوسـێ(جارێك کچـێکی 16سـالأنەی شـکاك بەرێگایەکـدا دەڕوات چەند گەنجێکی ئاسووری و ئەرمەنی لێ پەیدا دەبێت و دەیگـرن و بەهـەموویان ئـابڕوی دەبەن پاشـان ئـازادی دەکەن.کچەکەش بـەو خـوێن و وەزعـەوە دەگەرێتـەوەو دەچێتە مـاڵی

سمكۆ لەبەردەم سمكۆدا دەرپێ كەی دادەكەنێ و دەست ئەكا بەگریان سمكۆ لێی دەپرسێ كێ وای لێ كردی؟لەوەلامدا دەڵێ ئاسووری و ئەرمەنیەكان ئەویش دەڵێ كەسیان دەناسی دەڵێ بەڵێ لەناویاندا (خەیول)هەیە خەیول كەسێكی سەركێشی ئاسووری و پیاوی تەنگانەیان بووە بۆیە سمكۆ دەڵێت هەرچی عەبدۆیی هەیە بێنە ئێرە (عەبدۆیی)بنەماڵەو هۆزەكەی خۆیەتی لەناوعەشیرەتی شكاكدا هەموو كۆدەبنەوەو سمكۆ دەرپێی كچەكە بەرزدەكاتەوەو دەڵێ ئەم دەرپێیە دەبینن ئەوە شەرەفی هەموو شكاكە بۆیە دەمەوێ خەیول نەمێنێ و تۆڵەی ئەو تاوانە وەرگرێ سێ كەس لە قەرەباڵغیەكە دەچنە دەرەوە و دەڕۆن پاش كەمێك (خەیول) دەكوژن و دەگەڕێنەوە پاش ئەمە مارشەمعون نامەیەك دەنوسێ بۆ سمكۆ دەڵێ كارێكی خراپتان كرد(خەیول)تان كوشت سمكۆش لە وەلامدا دەڵێ(وەڵلاهی زۆر فكرمان كردەوە بەلام هیچ شتێكمان لەكوشتن بەچاكتر نەزانی بۆیە خەیولمان كوشت)پاش ئەوەی سمكۆ لەگەڵ عەشیرەتی هەركی ئاسووریەكان دەشكێنن هێزە هەڵهاتووەكەی ئاسووریەكان بەرەو باشوور دەڕۆن و دەچنە هەمەدان لەوێ بۆ ماوەیەك دەگیرسێنەوە و پاشان ئینگلیزەكان ئاسووریەكان دەگوازنەوە بۆ عێراق و لەشاری بەغداد و بەعقوبە نیشتەجێ دەكرێن و سەركردایەتی ئاسووریەكان دەدرێتە دەست ئاغا بترۆس ئیتر ئینگلیزەكان بۆ مەرامی خۆیان بەكاریان دێنن و هەموویان چەكداردەكرێن و بوون بە سوپای (لیڤی) لە شۆڕشی شێخ مەحمودا زۆر سەرسەختانە دەجەنگان ئەگەر بەچاوێكی واقیع سەیری مەسەلەكان بكەین دەگەینە ئەو ڕاستیەی ئەگەر سمكۆ مارشەمعونی نەكوشتایە ئەوسا دەوڵەتێك لەسەر ئاوو خاكی كوردستان دروست دەكرا زۆر لەوە بەهێزتر دەبوو كە چاوەڕوان دەكرا نەك كاریگەری دەبوو بۆ سەر ڕۆژهەلاتی كوردستان و بەڵكو شێخ مەحمودیش دەكەوتە نێوان بەرداشێكی بێ كۆتایی و پارچەیەكی گرنگ لەكوردستانی گەورە دائەبڕا و بەدڵنیاییەوە سنوری جوگرافیای كوردستان وەك ئێستای نەئەمایەوە .ڕەنگە خودی سمكۆ ئەو كارەی كەكردی نەك وەك پەشیمانی بەڵكو تاڕادەیەك پێی خۆش نەبووە بەلام لەبەر ئەو هۆیانە ناچاربووە.لەدوای ئەو كارەساتە سمكۆ

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هێزو دەسەلآتی لەپەرەسەندندا بووە و ئەستێرەی بەختی لەدرەوشانەوەدا بووە بەلآم جارێکی تر بیری لەتۆڵە سەندنەوە نەکردەوە بەرامبەر بە ئاسورییەکان.ژمارەی ئەو ئاسوورییانەی کە ناوچەکەیان جێهێشت زیاتر لە (32000)کەس دەبوون ئەو خێزانە کوردانەی لە جنگی ئاسوورییەکان ڕزگاریان بوو هەموو هەڵهاتن بۆ بەشەکانی تری کوردستان زۆرترینیان ڕوەو باشوری کوردستان هاتن لەشارەکانی دهۆك و هەولێرو سیدەکان و سۆران و کۆیەو قەلآدزێ و سلێمانی گیرسانەوە زۆریشیان لەناو بەفروسەرماو سۆڵەی قەندیل دا گیانیان لەدەست دا( پیاوێك دەگێڕێتەوە کە لەو کارەساتە ڕزگاری بووە دەڵێت : کە دایکمیان کوشت لەبەر چاوم من منداڵ بووم تەمەنم 8 – 9 ساڵان بوو لە ترسا دەستی خوشکەکەمم گرت کە لەخۆم بچوکتر بوو رامان کرد بۆ دەرەوەی ماڵەکەمان هەندێ منداڵی تری خاڵۆزای خۆمم بینی ئەوانیش ڕایان دەکرد هەموو دەرچووین لە گوندەکە دنیا سارد بوو خۆشمان نەمان دەزانی بۆ کوێ دەچین کاتێك گەیشتینە قەندیل بەفر دنیای داپۆشی بوو لە برسان و لە ترسان ئێمەی منداڵ سەرمان لێ شێوابوو خوشکەکەم زۆر بێ هێز ولاواز بوو بوو چووم بۆ گوندێکی نزیك بدۆزمەوە تافریامان بکەون بەلآم هیچم نەدیت تا گەڕامەوە لەناو بەفرەکەدا خوشکەکەم گیانی سپاردبوو ) ئەو کارەساتە تەنها گەلی کوردو ئاسووری زەرەرمەندی سەرەکی بوون و بەقازانجی وولآتانی ئێران و تورکیاو ئینگلیزەکان شکایەوە....

مارشەمعون پاش ئەوەی دەستی بەسەر ورمێ دا گرت بەنیازی پتەوکردنی دەسەلآت گفتوگۆی لەگەڵ سمکۆدا کرد لەکاتی چوونی بۆ کۆنەشار لەخەسرەو ئاوا دادەنیشێ لەگەڵ(وثوق الدولة)پێی دەڵێ(ئێوە فریوی بەریتانیاو ڕووس مەخۆن ووتی باپیرانی من خزمەتکاری دەوڵەتی ئێران بوون.نووسراوی پڕ لەشانازی شاعەباسی سەفەوی سەبارەت بەباپیرم هەر لەلامان ماوە هەر شوێنێك دەوڵەتی ئێران داوای بکات من لەگەڵ عەشیرەتەکەم دەڕۆم و لەوێ دادەنیشم یەکێك لەخزمەتکارەکانی ئێران دەبم) پاشان چووە لای سمکۆ بۆ کۆنەشار. لەوێش ئەو کارەساتەی کەباسمان کرد ڕووی دا هەرچەندە کاك کمال سەید إبراهیم لەکتێبەکەیدا باسی

بردنی 250ئافرەتی شکاك دەکات کەلەگەڵ خۆیاندا لەکاتی بردنی ئاسوریەکاندا لەگوندی شکاك نشینەکانی سەر ڕێگاکانیاندا پەلاماریان داون و بردونیان بۆیە سمکۆ سەید تەها ڕادەسپێرێ کە قسە لەگەڵ ئینگلیزەکان بکات بۆ ئازادکردنی ئەو ئافرەتانەی کە ئاسووریەکان بردونیان ئەوەی ڕاست بێت نازانین کاك کمال لەکام سەرچاوەوە وەری گرتوە،زۆرێك لەمێژوونوسان و نوسەرانی ئەوکاتەی کارەساتەکە هەریەکە بەجۆرێك باسی ئەو کارەساتە دەکات .هەندێك بە میزاج و بەشێکی بەسۆزەوەو بەشێکی تر بەمەبەست بابەتەکە دەشێوێنن .وەك ئەوەی کە مارشەمعون پێشتر پەلاماری دەمانچەی دابێ لەسمکۆو خورشید ئاغای برای سمکۆ لێی هاتۆتە دەست و مارشەمعونی کوشتووە. ئەمە زۆر دوورە لەڕاستیەوە.چونکە مارشەمعون داواکاری گفتوگۆبووە هاتۆتە ناوچەیەك کە هەمووی سەر بەعەشیرەتی سمکۆ بوون .کە باش دەیانزانی ڕێگای دەرچوونیان زەحمەت بووە.هەر دانوستانێك و ڕێکەوتنێك بکرایە لەبەرژەوەندی مارشەمعون و ئاسوریەکان تەواودەبوو .یاخود دەوترێت لەهەڵەی یەکێك لەپاسەوانەکانەوە ئەوە ڕووی داوە ئەمەش جێگای بڕوا نییە.چونکە دەتوانرا چارەسەر بکرێت دەکرێت بڵێین چەند چەکداری شکاك لەو کارەساتەدا کوژراوە؟ یاخود هیچ نەکوژراوە یان شتێکی ئەوتۆ نەبووە .باشە ئەگەر ئاسووریەکان مەبەستیان دەستوەشاندن بوایە خۆ دەبوایە ئەوان لە 150چەکدار پەنجایان دەرچووایە بۆ هەموو کوژران وەك دەڵێن تەنها یەك کەسیان دەرچووە.کەواتە شکاکەکان زۆر بەمەبەست و زۆر ئامادەبوون بۆ ئەو کارە.خودی سمکۆ نایشارێتەوە کە دەڵێ وای بۆچووم مارشەمعون بکوژم چونکە لەپشتی ئێمەوە پیلانیان داناوە بۆ ئەوەی دەست بەسەر باکوری کوردستاندا بگرن.(کریس کۆچێرا) نوسەری فەرەنسی دەڵێ سمکۆ لای هەندێك لەسەرکردەکانی ئێران و تورکەکان وەك(حەسەن ئەرفع)و(ئۆزەدەمیر)ی تورك بە کەسێکی شەقاوەو مرۆڤێکی لەخۆبایی و هیچ نەزان و تالأنکەرو مرۆڤێکی نەتەوەپەرست و ناسیۆنالست حساب کراوەو زۆربەی ئاغاکان و دەرەبەگەکان هاوکاریان لەگەڵدا کردووە سمکۆ هەروەك ئەوان دەرەبەگ بووە.تامی ناسیۆنالیستی چەشتبوو.لەڕاستیدا

ئەوانە هەموو نەتەوە پەرست بوون). هەروەها کریس کۆچێرا دەڵێ (سمکۆ پانتۆڵێکی شکاك و چەکمەیەکی ڕووسی لەپێ دەکرد)ئینگلیزەکان دەڵێن سمکۆ خۆش لیباس بووە و پیاوێکی کەم دووی لەسەرخۆبووە و شوێن و مەڵبەندی سمکۆ چەهریق بووە کەنزیکی سنوری تورکیایە.لەناوچۆمێکدا لەسەر تەختەبەردێکی بڵند باوکی سمکۆ قەڵایەکی دروست کردبوو کە نیشانەی هێلانەی(هەڵۆ)بوو هەروەها د.نصرالله شیفتە نوسەری (سێ مەردی عەجیب) لەسەر سمکۆ دەڵێ اسماعیل ئاغا لەناوچەی ورمێ و سەڵماس و مهابادو حاکمی موتڵەق بوویەبێ ئەوەی کەس بتوانێت لەڕوویدا بوەستێت هەرچی بیویستایە دەیکرد لەکاتی شەڕدا کە ڕووسیا ئازربایجانی گرت اسماعیل ئاغاکە هەستێکی ئازاوەچێتی تیابوو بەپشتیوانی ڕووسەکان چوو بەگژ تورکەکاندا جاری واش هەبووە بەباشی بزانیایە کارەکەی بەپێچەوانەوە ئەکرد دوای شۆڕشی ڕووسیاو کشانەوەی هێزەکانی دەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرت و سمکۆ کارێکی ناڕەوای کرد کەچوو بەگژ ئاسوریەکاندا بۆ ئەوەی خۆی لەتورك نزیك بکاتەوە مارشەمعونی بانگ کردە ماڵی خۆی و کوشتی بەو جۆرە خۆی لەتورك نزیك کردەوە. ئەمەش بۆچوونی تەنها د.نصرالله شیفتە نییە.ڕەنگە کەسانی تریش هەبێ بەم شێوەیە بیربکەنەوە لەهەڵسوکەوتی سمکۆ.بەڵام سمکۆ ماڵی لە چەهریق بوە نەك کۆنەشار دەرچووانی کارەساتەکە شایەتی ئەوە دەدەن کە لەماڵی سمکۆدا ئەم کارە نەکرا بەڵکو لەماڵی تەیموور ئاغادا بووە بۆ مێژوو باس دەکرێ کە تەیموور ئاغا پێشتر ئاگادار نەبووە کە سمکۆ نیازی کوشتنی مارشەمعونی هەیە.بەڵام نوسینەکەی دکتۆر نصرالله دەردەکەوێ کە پەلە پەل و مەبەستی لەدواوە بێت.

یاخود بەسری فەرماندەی ستادی جەنگ بروسکەیەك دەنێرێ بۆ ئۆزدەمیربەگی قائیمقامی ڕەواندوز سمکۆ زیاتر بەئۆزدەمیر دەناسێنێ‌لەبروسکەکەدا هاتووە.

دیاریەکر بۆ ئۆزدەمیر بەگی قائیمقام

338/6/14 استخباراتی ئومرۆ 1745

1-سمکۆ کابرایەکی فێڵبازە بەهۆی زرنگی خۆیەوە ئەو خەنجەرەی هەڵی گرتووە بۆ کاتی خۆی دەشارێتەوە ئەم کابرایەبیری سەربەخۆیی لەکەللەدایە مەبەستی ئەوەیە کەتا لە ئێراندا دەسەلاتی زیاد دەکات و بەهێزدەبێت لەگەڵ ئێمە تێك نەچێ تا بەم جۆرە بە مەرام و ئامانج بگات.

2-سەرکەوتنی سمکۆ لەناو عەشایەری کورددا بەم جۆرە گەورەبوونی و دەسەلات پەیداکردنی بۆ حکومەتی میللی ئێمە (حکومەتی تورکی مستەفا کەمال)دەست نادات بەلام لەم رۆژەدا تێکچونمان لەگەڵ سمکۆ بۆ ئێمە باش نیە ئەگەر ئێوە بتوانن هەوڵی ئەوە بدەن کە بە بلاوکردنەوەی پروپاگەندە کە عەشایەری پێ تەفرە بدەن بیانکەن بەدوژمنی سمکۆ بەراستی خزمەتێکی گەورە بۆحکوومەت جێ بەجێ دەکەن وەکو ئەوەی بڵێن سمکۆ بەپارەی ئینگلیز ئەم شۆرشەدەگێرێ بۆ قازانجی خۆی و خزمەتی ئینگلیز.خوێنی کوردەکان ئەرێژێ.

3-ئەو مەفرەزەیەی کە لێرەوە خراوەتە رێ جارێ دەچێتە (جولەمێرگ)دوای گەیشتنی ئێوە بەرەواندوز و جێگیربونتان لەوێ بەپێی هەواڵ و پێویست فەرمانی تر ئەدرێ بەجولاندنی مەفرەزەکەو هاتن و نەهاتن ی بۆ رەواندوز.

4-مەکارەمان(وەسیلەی گواستنەوە) نیە کە تۆپ و رەشاشی پێدابنێرین هەوڵ ئەدەین کە ئەو شتانەتان بۆ جێ بەجێ بکەین.

**بەسری**

**فەرماندەی ستادی جەنگ**

ئەگەر سەیری ئەم بروسکەیەی سەرەوە بکەین ئەوسا دەرئەکەوێت کە تورکەکان چەندە دوژمنی سەرسەختی کوردو شۆرشەکەی بوون لەئاخرو دوا هەناسەی عوسمانیەکاندا هێشتا بەشی کوردی چارە رەشیان پێ ماوەئەگەر بەچەك دەستیان نەگاتە سمکۆ ئەوا بەپروپاگەندەو ناوزراندن .هەندێ جار بوون بەعیسایی بۆ سمکۆ بلاودەکەنەوە.وەك پێشتر باسمان کرد کەچی

سەرەڕای ئەم هەموو بەڵگە زیندوانە کەچی دەڵێن سمکۆ پیاوی تورکەکانە یاخود پیاوی ئێرانیەکانە یان بە فەرمانی ئینگلیز هەڵسوکەوت دەکات .

(ش.محۆیان)* لەگۆڤاری (پەیڤ)دا بڵاوی کردۆتەوە لەبارەی سمکۆوە دەڵێ ئەو وولآتانەی لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا بەشداربوون هەرلایەك بەهۆی تەقەلای بەکرێگیراوەکانەوە هەوڵی ئەدا کورد بۆ مەبەستی خۆی بەکاربهێنێ ئەوکاتەش سمکۆ سەرۆك عەشیرەتی شکاك بوو لەناوچەی مەرگەوەرو برادۆست هەمیشە لەهەوڵی دروست کردن و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆدا بوو سمکۆ لەو ناوچانەی ورمێ کە عەشایەری شکاکی تێدا ژیاوە بەدەسەلآترین کەسێك بووە هەر لەسەرەتای شەڕی جیهانی یەکەمەوە ناوبانگی بڵاوبوەوە لەو کاتەدا لایەنگری ڕووس بوو دژی ئێران و تورکەکان شەڕی دەکرد.دوای ئەوەی هەندێك لەبنەماڵەکەی سمکۆ بەدەستی کاربەدەستانی ئێران کوژران ئیتر سمکۆ ڕەزامەندی خۆی نیشاندا بەئاشکرا بۆ سوودی تورك و ئەڵمانەکان شەڕی دەکرد دژی ئێران.سمکۆ لەسەرەتادا دەستی کرد بەڕاپەڕینەکەی ئەو دەسەلآتەی نەبوو بۆیە بەدوای دۆست ولایەنگرانی دا دەگەڕا تا لەگەڵ ڕووسەکاندا هێرشی بردە سەر تورکیا.لەسالی 1915–1918 سمکۆ تاکە هێزی دەسەلآتداری سەروی ڕۆژئاوای ئێران بوو کەلە هەندێك ناوچەی تورکیاش دەسەلآتی هەبوو سمکۆ لەگەڵ ئەو وولآتانەی شەڕیان دەکرد زۆر شارەزایانە مناوەرەی دەکرد هەوڵی ئەدا ئەنجامی ئەو شەڕانە بەسوودی خۆی بێت لەدوای کشانەوەی ڕووسیا سمکۆ توانی لایەنگرانی زۆر کۆبکاتەوەو شەڕی ئێران بکات پشتگیریەکی زۆری خەڵکیش بۆخۆی مسۆگەر بکات.

* ئەمەش بڕوانە (ش محویان لەکتێبی بزوتنەوەی کوردەکانی کوردستانی خوارو سیاسەتی ئیمپریالیزمی ئینگلیز (وەرگێڕانی سەیوان علی ڕەش لە ڕووسیەوە.)

کاتێك دوا کەشتی ئینگلیزەکان سنگی لەکەناراوەکانی عەرەبی دا لەساڵی 1917دا وورده وورده سوپا کشا تا گەیشتە شاری بەسرە لەساڵی 1918توانیان تێکڕای شارەکانی عێراق بگرن(جگە لەشارەکانی کوردستان وەك کەرکوك،سلێمانی و هەولێرو موسڵ تا ئەو کاتە کوردستان نەلکێنرابوو بەعێراقەوە سنوری باکوری عێراق ئەو کاتە چیاکانی حەمرین بوو دوای پەیمانی سایکس بیکۆی شوم باشوری کوردستانیان لکاند بە عێراقەوە لەو ڕۆژەوە عێراقی بوون بوە بەبەڵایەك تەنها ساتێکیش کورد نەحەساوەتەوە و بگرە مەینەتیەکانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیادی کردووەو تاکار گەیشتە ئەوەی بە پرۆسەیەکی نەگریس و دوور لەبەهاکانی مرۆڤایەتی عەرەب کەوتنە ڕەشە کوژی دانیشتوانی کوردستان بەپێش چاوی جیهانەوەو لایەنێکیش نەبوو ڕێگری لەو کوشتارە بکات و ئەو پرۆسەیەشی بە ئایەتێکی پیرۆزی قورئانەوە دەبەستەوە کە سورەتی (ئەنفال)بوو تەنانەت وەك کافرەکانی سەرەتای ئیسلام مامەڵەیان دەکرد و هیچ حسابێکیان بۆ موسڵمان بوونی کورد نەکردوو زۆر بەئاسانی ئەم تاوانەیان جێ بەجێ کردو بۆیان چووە سەر. کەدەبوایە بەپێی ڕێکەوتنامەی سایکس بیکۆی ساڵی 1916ولایەتی موسڵ لەژێر ئیدارەی فەڕەنسادا بوایە. بەبێ شەڕ شاری موسڵ تەسلیم بوو بەبەریتانیا بەپێی ڕێکەوتنامەی (مۆدرۆس)خرایە ژێر فەرمانڕەوایی بەریتانیاوە. ئەو سەردەمە خەڵکی کوردستان(52).بەتایبەتی ناوچەی هەولێرو بادینان لەبێ هیوایدا دەژیان. چونکە کۆتایی شۆڕشی شێخ عبدالسلام بارزانی لەساڵی 1915بەگیانی خۆی تەواو بوو بوو. کاتێك ئینگلیزەکان لەناوچەی سلێمانی لەوە تێ گەیشتبوون کە شێخ مەحمودی کوڕی شێخ سەعید وەك بنەماڵەیەکی ئایینی و کۆمەڵایەتی خەڵکی سلێمانی ڕێزێکی تایبەتیان

دەگرن و وەك بنەماڵەی کاك ئەحمەدی شێخ تەماشا دەکرێن.بۆیە لەگەڵ شێخ مەحمودا کەوتنەگفتوگۆ بۆ بەڕێوەبردنی سلێمانی و لەڕۆژی 17ی تشرینی 1918 بەفەرمی لەلایەن (مێجەرنوئێل)وە شێخ مەحموود وەك حوکمداری ناوچەی سلێمانی ناسێنرا. بەڵام ئەوەی جێگای پرسیاربوو سنووری دەسەڵاتی شێخ مەحمود دیاری نەکرابوو ئەوەی دەزانرا سنوری

هەڵەبجە لەژێر فەرمانڕەوای جافەکاندا ماوەتەوەو سنوری چەمچەماڵ لەژێر دەسەلآتی هەمەوەندەکاندا بووەو سنوری ناوچەی پشدەریش لەژێر دەسەلآتی بابەکر ئاغادا بووە .بەواتایەکی تر لەناوچەی دووکان تاگشت ناوچەی قەلآدزەو سنوری بتوێن بابەکر ئاغا تەواوی دەسەلآتی هەبوو پاشان ئینگلیزەکان دوای شەش مانگ لەدەسەلآتی شێخ مەحمود کەوتنە بچووك کردنەوەی دەسەلآتی شێخ مەحموود دەیانویست ڕیزەکانی لەبەریەك هەڵبوەشێنن .ئەمەش دوای ڕۆشتنی (مێجەرنوئێل)بەناوی گەشتەوە بۆ ناوچەکانی باکوری کوردستان بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو ئەرکەی کە پێی سپێردرابوو لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە.هاتنە پێشەوەی مێجەرسۆن وەك کەسێکی توند بەهاتنی (سۆن)بۆ سلێمانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پشێوی زیاد دەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگری لەدەسەلآتی شێخ مەحموود دەکرا لە21نیسانی 1919دا ئینگلیزەکان ویستیان حوکمداریی شێخ مەحموود بەیەکجاری نەهێڵن.بۆیە شێخ مەحمودیش وەك کاردانەوەیەك ویستی دام و دەزگاکانی ئینگلیز لەسلێمانی دەربکات بۆ ئەم مەبەستە شێخ مەحمود نامەیەکی نهێنی نارد بۆ هاوڕێ دێرینەکەی کە هەمیشە پشتی پێ بەستبوو کەئەویش مەحمود خانی دزلی یە هەڵبەت محمود خانی کانی سانانیش یەکێك بووە لە دۆستە نزیك و بەوەفاکانی شێخ مەحمود.بەلآم لێرەدا تەنها نامە نهێنیەکە نێردراوە بۆ محمود خانی دزلی (محود خانی دزلی کوڕی عەزیز خانی بارام بەگ)لەسالی 1870 لەگوندی دزلی(53).ناوچەی هەورامان لەدایك بووە پشتاوپشت بنەماڵەی بارام بەگی حوکمداری ناوچەی هەورامان بوون خاوەنی پێگەیەکی کۆمەلآیەتی داکۆکی کارێکی گشت کێشە نەتەوایەتیەکان بوون .دوای گەیشتنی نامە نهێنیەکەی شێخ محمود.خانی دزلی بەهێزێکی چەند سەد کەسی یەوە دێنە ناوچەی شاربازێرو پاشان بۆ ڕۆژهەلآتی سلێمانی و لەبناری شاخی گۆیژەدا دەمێننەوە کە تائێستا ئەو ناوچەیەبە(قووتەی محمودخان)ناسراوە.مێجەرسۆن ئاگاداری شێخ محوود دەکاتەوە کەبۆچی محمود خان هێزی هێناوە؟ئەویش لەوەلآمدا دەڵێت محمود خان موریدی کاك ئەحمەدی شێخەو سالآنە بۆ زیارەت دێن و ناکرێ ئێمە ڕێگری لێ بکەین.لە 19ی مایسی

1919هێرش کرا بۆ ڕزگارکردنی سلێمانی و هێزی محمودخان توانیان کۆنترۆڵی شارەکەن و بۆجاری یەکەم شار ئازادکرا زۆربەی زۆری ئەفسەرو سەربازە ئینگلیزەکان دەست بەسەر کران لەدەبۆکەی سلێمانیدا زیندانی کران.ئەو ئەفسەرانەی کە ڕزگاریان بوو بوو ڕۆژی پێشتر سلێمانی یان چۆڵ کردبوو بەمێجەرسۆنیشەوە هەر هەمان ڕۆژ بەپەلە حەپسەخانی نەقیب خۆی دەگەیەنێتە دەبۆکەو هاوکاری پێشکەش بە ئەفسەرو سەربازەکانی ئینگلیز دەکات و بریندارەکانیش دەنێرێ بۆ چارەسەر وەك کارێکی مرۆڤانە لە22ی مایسی 1919دا جەنەراڵ (دان ئیگلس)بەهێزێکەوە هێرشی هێنا بۆسەر سلێمانی لەبەرەبەیاندا لەناوچەی تاسلۆجەی ڕۆژئاوای سلێمانی کەوتە بۆسەی هێزەکانی محمودخان و شێخ قادرەوە تاناچار بەهەڵهاتن کران لە23ی مایس دا سەر لەشکر (برێدجس)بەهێزێکی هیندییەوە هێرشی هێنا ئەمیش لەناوچەی بازیاندا بەخراپی شکاو هێزی ئینگلیزەکان لەناوچەی چەمچەماڵدا مۆڵ دران هێزی محمود خان و شێخ قادر چوونە ناوچەی قەرەهەنجیر شەڕ لەو ناوچەیەدا دەستی پێکرد. کۆلۆنێل(تۆمسن)کوژرا لەماوەیەکی کەمدا جەنەراڵ (فرایزەر)بەهێزێکەوە گەیشت هێزەکانی مەحمودخان و شێخ قادر پەلاماریان دان و ئەگەر بەتالیۆنی فەرماندە(چارت)نەبوایە(فرایزەر)بەدەستی هێزەکانی کورد دیل دەکرا.شێخ محمود لەم کاتەدا لەدەربەندی بازیان خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو هێزی زیاتری لەو ناوچەیەدا دادەمەزراند پاشان هێزە کوردیەکان پاشەکشەیان کرد بۆ دەربەندی بازیان ئینگلیزەکان هێرشیان هێنا دوای شەڕێکی سەخت توانیان کوردەکان بشکێنن و شێخ مەحمودیش بەبرینداری و بەدیلی دەکەوێتە دەستی ئینگلیزەکان پاشان بردیانە بەغدا و لەدادگا دواجاربڕیاری دوورخستنەوەیان دا بۆدورگەی (ئەندامان) لە هیندستان دوای دووساڵ بەناچاری گەڕێنرایەوە بۆ سلێمانی کەلەدوایدا بەدرێژی باسی دەکەین.

پاشان شێخ مەحمود بەدیلی دەبرێ بۆ بەغداد لەدادگایەکی سەربازی نادادپەروەرانەدا بڕیاری مردن بەسەر شێخ محمود وشێخ حمە غەریبی زاوایدا درا و هەریەك لە محمودخانی دزڵی بەبێ

ئامادەبوونی خۆیان زیندانی هەتا هەتایی و محمودخانی کانی سانانیش بە(3)ساڵ زیندانی دوای ئەوەی بڕیاری حوکمەکەی تەمیزکرایەوە حوکمی شێخ محمودو شێخ حمە غەریب کەم کرایەوە بۆ هەریەکەیان (10)ساڵ بەندی و دوورخستنەوەیان بۆ دوورگەی(ئەندامان)لەهیندستان(54). و لەترسی گرتن ماڵ و منداڵی شێخ محمودو کەس و کارە نزیکەکانی بەئاوارەیی ڕوو لەڕۆژهەلاتی کوردستان دەکەن.

شێخ محمود و شێخ حمە غەریبی زاوای لەبەغدا ڕۆژی دادگایکردن دیاری کراو لەڕۆژی مەحکەمەکەدا شێخ محمود نەیویست پارێزەری هەبێت تەنانەت دادگای سەربازی عورفی ڕەت کردەوەو ووتی ئێمە مەزلومین و ئێوە زاڵم و داگیرکەر من بەواجبی سەرشانی خۆمم زانیوە کە بەرگری لەنەتەوەکەم بکەم.وەك واجبێکی شەرعی.ئەو تاوانانەی کەخرابووە پاڵ شێخ محمود بریتی بوو لە داگرتنی ئاڵای بەریتانیای گەورەو دڕاندنی کەئەمە بوختانێکی گەورەبوو بەڵکو شێخ محمود بەڕێزەوە ئاڵاکەی داگرتبوو بەقەدکراوی تەسلیمی کردەوە خاڵی دووەم دژایەتی کردنی بوودژ بە سوپای ئینگلیزو ڕاگەیاندنی شەڕ ئەمەش بەتاوانی گەورەو خوێن ڕشتن ئەژمار ئەکرا.بۆیە بەو شێوەیە بۆجاری یەکەم کە حوکمی مردنیان دا. ئەمەش وەك هەیبەت نواندن و کەم کردنەوەی حوکمەکەی بۆ 10ساڵ ئەمەش وەك بەخشینێك و نەرمی نواندن بووە بەڵام لەمەش سەیرتر ئەوەبووە کۆمەڵێ کەسایەتیان لەسلێمانیەوە لەگەڵ کاپتن(بۆند)ی حاکمی چەمچەماڵ دا هێنابوو بەزۆر یان بەخواییش لەدادگا ئامادەبوون وەك شایەتی دان لەسەر تاوانەکانی شێخ محمود.کەسایەتیەکانیش وەك مامۆستا ڕەفیق حلمی ئامازەی پێ داون ئەمانەن:

1-حاجي ملا سعيد كەركوكلي زادە

2-عيزەت بەگي وەسمان پاشاي جاف

3-شێخ(نەجيب)ی قەرەداغ.

4-عەوني يەفەني يوزباشي كوڕی (حاجي گوڕون)

5-حەمە بەگی قادر پاشا.
6-حاجی ئاغای حسن ئاغا
7-میرزا فەرەج حاجی شەریف.
بەلآم لەدادگادا دوای حکومەکەش بێ شلەژان شێخ محمود وەك پلنگیکی ناوقەفەس لەهەلمەت بردن و چەپۆك داهێنان ئەگەرا بەرامبەر بەدیوانی عورفی و لەئاستی شایەتەکاندا سروشتی مەردانەو دلێرانە بوو لەنیگاکانیا بەرامبەر شایەتەکان وا ئەخوێنرایەوە کە نرخیان بۆ دانانی بەسووك دێتە پێش چاوی داخی ئەوەی ئەخوارد کەکورد لەلای بێگانە شایەتی لێ بدا ماتی ئەوە گرتبووی کە کۆت و زنجیری ئینگلیز پەکی خستەوە نەیئەتوانی بیان پلیشێنێتەوە.......)*
دوای ئەوەی لەدادگای سەربازی ئینگلیزدا ناوی چەند کەسایەتیەك لەخەلکی سلێمانیدا هاتووە و مامۆستا ڕەفیق حلمی دەلێ(بەزۆر هاتبن یان بەخواهشت ئەو کەسانە لەدادگا شایەتیان داوە لەسەر شێخ محمود) ئەگەر سەرنج بدەین ئەو کەسانە زۆر نزیکن لەشێخ.خۆشەویستی شێخ محمود لەوکاتەدا بێ سنوور بووە و زۆر لە شاعیرەکانی ئەو کاتە شیعریان بۆ هۆنیوەتەوە ئەمە پەیوەندی بەسادەیی شێخ و تێکەلّ بوونی بوە لەگەلّ خەلك دا.جگە لەوەی بنەمالەی کاك ئەحمەدی شێخ بووە بەپێی ئەو وەلآمانەی کەلە دادگادا دراوەتەوە جۆرێك لە زۆرە ملەی پێوە دیارە وا دەردەکەوێ کە بەزۆر هێنرابێتن بەڕای من (نوسەر)ئینگلیزەکان مەبەستێکی تایبەتیان هەبووە لەبە زۆرهێنانی شایەتەکان لەسێ خالّدا دەبینمەوە.
1-هێنانی ئەو کەسایەتیانە کە نزیکن لەشێخ محمودو پێشتر هاوکارو دلسۆزی شێخ بوون تاگومان و دوودلّی وبێ بڕوای لەنێو خەلك دا دروست بکەن.

---

* بڕوانە یاداشتەکانی ڕەفیق حلمی لاپەڕە 178

2-دروست کردنی ناکۆکی لەنێوان بنەماڵەی شێخ و ئەو بنەماڵانەی تردا.

3-ئینگلیزەکان دەیانویست دوای دورخستنەوەی شێخ محمود ئەم چەند کەسەی کەبەزۆر هێنراون بۆ دادگا نەتوانن درێژە بە ڕێبازەکەی شێخ بدەن و تا وا لە خەڵك بگەیەنن ئەمانە خیانەتیان بەشۆڕش و حکەمەتەکەی شێخ کردووە،تاکەس دوایان نەکەون بۆیە شێخ لەوەڵامێکی دادگادا دەڵێ:بەلای منەوە جێ ی داخە هەرەشەی ئێوە وای لەم کوردانەکردووە کەشایەتیم لەسەر بدەن لەکاتێکدا من کۆمەکیم بەوان کردووەو داوای مافی ئەوان دەکەم .

شایەتی یەکەم:مەلا سعید کەرکوکلی زادە هاتە پێشەوەو حاکم لێی پرسی .

-چی لەبارەی ڕووداوەکەوە دەزانیت؟

وتی:گڵکۆی کاك ئەحمەدی شێخ جێ یەکی پیرۆزە و ئینگلیزەکان قەدەغەیان کرد نەیانهێشت کەس بۆ زیارەت کردنی بچێت لەبەرئەوە خەڵکەکە بە ڕووتاندا تەقیەوە.ئاژاوە بەهەموو لایەکدا بڵاوبۆوەو بەرەنگاریتان کرا.ئێمەی موسڵمانیش ئەمەمان لەئێوە چاوەڕوان نەدەکرد.

جارێکی دی لەشایەتەکەی پرسی:ئایا شێخ محمود فەرمانی پێ دایت کە فتوا دەربکەیت و بڵێیت ئینگلیزەکان کافرن.دەبێ بکوژرێن؟.

وتی نەخێر من بێ ئاگام لەم قسەیە.......

ئەگەر سەیری ئەو وەڵامانە بکەین دەبینین تەنها بەرگری کردن بووە لەشێخ و شایەتی دانە لە خودی خۆی کە ئاگادارە خەڵك چی وای لێ کردون پەلاماری ئینگلیزەکان بدەن هۆکارەکەشی قەدەغەکردنی زیارەتی مەرقەدی پیرۆزی کاك ئەحمەدی شێخە.بەوپێ یە کە موسڵمانن ئەمەش وەستانەوەی ئینگلیزە بەرامبەر بە ئاینەکەمان.

شایەتی دووەم:عزەت بەگی عوسمان پاشا بوو:سەرۆکی دادگا لێی پرسی؟

-ئایا شێخ محمود هانی خەڵکەکەی دا بۆ خۆپیشاندان؟

وتی نەخێر بەڵکو خۆشی هاوبەشی گەلی کرد لەهەستەکەیاندا بۆخۆپیشاندانەکەو بەرهەڵستی کردن لەمافی گەلەکەی .

ئەگەر وردبینەوە لەم وەلأمەش تەنها بێتاوانی شێخی نیشان داوەو هیچی تر.

شایەتی سێ یەم شێخ نەجیب قەرەداغی بوو ووتی: من لەماڵەوە بووم شێخ مەحمود بەپیاوێکدا نامەیەکی ناردە لام و داوای لێ کردم کەلەشکرێك لە عەشایەر کۆبکەمەوە تێیان بگەیەنم کە تێکۆشان لەرێگەی ئاین و نیشتیماندا ئەرکی سەر شانی هەموو موسڵمانێکە دژ بەئینگلیز بووەستێنەوە پێشی ووتم ئێستا ئێمە لەگەڵ ئینگلیزدا لەشەڕداین خێرا هێزێك بنێرە.

شێخ نەجیب نامەیەکی لەگیرفاندا دەر هێناو پێشکەشی دادگای کرد ووتی :من ئەو فەرمانەی پێم کرا لەترسی ژیانی خۆم جێ بەجێم کرد.

شایەتی چوارەم عەونی ئەفەندی ئەفسەرێکی سوپای کوردستان بوو کاتێك پرسیاریان لێ کرد ووتی:من وەك ئەفسەرێك ئەوەی پێم ووتراوە جێ بەجێم کرد ئەگەرچی من ئەفسەرێکی جەنگیش نیم بەڵکو ئەفسەرێکی ئیداریم ئەو مەعلوماتانەی من هەمە لەناوخەڵکدا و بلاوبوەوە کە ئێمە حکومەتین .ئەمە کتوپڕ هەڵگەڕایەوە ئەم ئاژاوەیەی لێ دروست بوو. هۆی سەرەکیش نازانم چی بوو چونکە من نەپیاوێکی سیاسیم و نەپیاوێکی جەنگیم شایەتی حەوتەم.میرزا فەرەج ووتی:

—من لەماڵەوە بووم کە گەل دەستی بەخۆپیشاندان کرد هەموومان بەگەنج و پیرەوە چوینە ناو خۆپیشاندانەکە شێخ مەحمودیش وەك یەکێك لەئێمە هاتە ناو خەڵکەوە و نەشم بینی سەرکردەی خۆپیشاندانەکە بکات.

شایەتەکانی دی بەگشتی باسی ئەوەیان دەکرد شێخ مەحمود سەرکردایەتی جووڵانەوەکەی کردووە بۆیە بەگشتی ئەگەر سەیری وەلأمەکان بکەین دەرئەکەوێ کە هەموو خۆیان بەشدارکردووە و لاریان نەبوە لەبەشداری کردنیان لەگەڵ شێخ مەحمود ئەمەش زیاتر دەرئەکەوێ کەبەزۆر هێنراون چونکە دوای بەندکردنی شێخ مەحمود و دورخستنەوەی و گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی هیچ کاردانەوەیەکی بۆیان نەبووە جگە لەڕێزو خۆشەویستی بۆیان دەنا شێخ ئەگەر وانەبوایە وەلأمی دەبوو بۆیان بەپێی نوسینەکانی دکتۆر ئەفراسیاو هەورامی

بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی رووسیاو سۆڤیەت دەربارەی شێخ مەحمود گەلێ زۆرن هەندێك بەڵگەنامە ئاشکرا کراوە لەلایەن رووسەکانەوە کە دەبێت هەڵوێستەی لەسەر بکەین وەك لاپەرە(236) دکتۆر ئەفراسیاودا هاتووەو دەڵێ:ئینگلیزەکان توانییان پیاوانی دەوروبەری شێخ مەحمود بکڕن یان باوەڕپێکراوانی خۆیان دابنێن وەك شێخ قادر(برای شێخ مەحمود) شێخ قادر کوڕی شێخ صالح شێخ عبدالکریم ,مستەفا پاشا یامولکی.ئەوانە ئینگلیزەکانیان لەپەیوەندی یەکانی شێخ مەحمودو تورکیا ئاگاداردەکردەوە ئینگلیزەکانیش داوایان لەشێخ مەحمود کرد کەبەیەکجاری دژی تورکیا شەڕ رابگەیەنێ یان بێتە بەغدا بۆ وەرگرتنی دەستورو رێنوێنی.

ئاشکرایە هاتنی نوێنەری سوپای ئینگلیز لەکەرکوکەوە بۆ سلێمانی بەمەبەستی پەیوەندی بەستن و کارتێکردن

لەو کەسایەتیانەی دەوروبەری شێخ مەحمود بوو).لێرەدا دەپرسین دەبێ شێخ مەحمود لەم بارودۆخە ناسەقامگیرولێڵیەدا چی بکاو چی پێ دەکرێ لەکاتێکدا کە نزیکترین کەسی پەیوەندی گرێ دابێ لەگەڵ دوژمنەکانی بۆ دەبێت گلەیی لەشێخ مەحوود بکرێ کەتەنانەت نەیتوانیوە نهێنێ کانی بدرکێنێ لەم سەردەمەداو ئێستاشی لەگەڵ دابێ هیچ سەرکردەیەك ناتوانێ زیاتر بکات لەشێخ مەحمود بەو شێوەی ئەو ئاوا چواردەوری بەو کەسانە دەور درابێ.ئەمەش ئەوەمان دێنێتەوە یاد کە مامۆستای خوالێخۆش بووعلاالدین سجادی لەرشتەی مرواریدا دەڵێ لەکۆتایی تەمەنی شێخ مەحمود دا من لەبەغدا لەمزگەوتەکەی خۆم و لەحوجرەدا بووم کاتێکم زانی غەڵبە غەڵب لەبەردەم مزگەوتەکەدا دروست بوو خەڵکانێك خۆیان کرد بەناومزگەوتەکەدا سەیرم کرد شێخ مەحموودبوو عەرەب چواردەوریان گرتووە.یەکێك دەستی زیارەت دەکاو یەکێك شانی ماچ دەکات،دەڵێ منیش بەپەلە چووم بۆلای و هێنام بۆ حوجرەکەی خۆم دوای بەخێرهاتن و هەواڵ پرسین .شێخ مەحمود فەرمووی علا الدین خۆت دەزانی ئەوەی لەتوانامدا بوو بۆ میللەتەکەم کردو هیچ درێغیم نەکرد باش بێت یان خراپ

ئەوەم لەتوانادا بووە بەڵام ئێستا هیچم پێ ناکرێ تەنها ئومێدێکم هەیە ئەویش تۆی.دەڵێ لەم کاتەدا فرمێسك بەچاویدا هاتە خوارەوە بۆ سەر ڕوومەتەکانی . منیش ووتم یا شێخ جا منێکی بێ کەس و بێ عەشیرەت چیم پێ دەکرێ ئەویش لەوەڵامدا دەڵێ ئومێدم بەقەڵەمەکەتە قسور مەکە بۆ نەتەوەکەت) لێرەدا دەرئەکەوێ کە شێخ مەحمود چەندە خەمخۆری میللەتەکەی بووە. ئەگەر لەمێژوو ووردبینەوە دەبینین شێخ مەحمود هیچ سازشێکی لەسەر حسابی کورد نەکردووە، هەموو ژیانی بەدەربەدەری و شەڕو شۆڕەوە بەڕێ کرد هەقی خۆیەتی وەك هێمای بەرگری نەتەوەیەك و وەك شانازی مێژووی مان تەماشا بکرێت.خۆ قەیسەری ڕووس ناوچەی ئالاسکای فرۆشت بەئەمەریکا.کەچی ئێستا ڕووسەکان وەك بەشێك لەمێژووی خۆیان سەیری قەیسەر دەکەن و تەنانەت بەشانازی یەوە ناوی دەبەن خۆ شێخ مەحمود جگە لە قوربانی و بەرگری زیاتر هیچی نەکرد نامەکانی دەری دەخات کە چەندە خەمخۆری نەتەوەکەی بووە لەیەکێك لەنامەکانیدا بۆ ڕووسەکان دەڵێ:

بۆ بەڕێز کۆنسوڵی ڕووس لەتەورێز

پایتەختی کوردستان شاری سلێمانی

بارەگای مەلیك

20ی کانوونی دووەم 1923

**سلاوێکی گەرم بۆ بەڕێزتان**

لەساڵی 1917 کاتێك کە دەنگی ئازادی ڕاستەقینە و ڕزگاری مرۆڤ لەژێر چەپۆکی زۆرداران و ستەمکاران لەڕێ ی ڕۆژنامەکانتانەوە گەیشتە گوێ ی جیهانیان. چەوساوانی دنیا هەزار سلاو سوپاسیان نارد بۆ گەلی ڕووسیا.بۆ ئازادی و ڕاپەڕین.بەو هیوایەی مافی خۆیان بەدەستبێنن لەساڵی 1919واتە چوارساڵ لەمەوبەر کاتێك لەناوەندی سلێمانی گەلی چەوساوەی کورد داوای مافی سروشتی خۆی کرد ڕووبەڕووی ئاگری چەکی نوێنەرانی خوێنڕێژی ئینگلیز بووە و لەئەنجام دا خەڵکێکی زۆر بوونەقوربانی و شەهیدکران.لەچارەڕەشی کوردان ئەو دەمە

بارودۆخی ناو ڕووسیا هەر بەردەوامی هەبوو بەلآم لەسایەی خواوە گەلی ڕووسیا ڕزگاری بوو گەورەیی و بەهێزیەکەی دەرکەوت.بەم چەشنە مەبەستی گەلی کوردتان ئاراستە دەکەم .تەواوی گەلی کورد لەباشوری کوردستان ئامادەیە سەر بەدەولەتی رووسیابێت و یارمەتی و قوربانی بۆ بدات و بەگیانی و کردەوە و ئامادەی جێ بە جێ کردنی هەر دەستورێك کە پێمان بدرێت بۆ بەجێ گەیاندنی ئەم ئەرکە پێویستە بەمافی نەتەوایەتی خۆی بگات. بۆ ڕوون کردنەوەی پەیوەندی یەکان و بارودۆخی گشتی و زیادکردنی هێزەکان و ترساندنی دوژمنان و باوەڕی هەردوولا پێویستمان بە تۆپ و فڕۆکە و ڕەشاش و چەك وتەقەمەنی هەیە.شتەکانی تر بەدووروودرێژی بەزارەکی لەلایەن قوماندار ڕەشید ئەفەندی و سکرتێری تایبەتی عارف ئەفەندی یەوە ئاراستە دەکرێت و زیاتر کاتتان ناگرم.

ئیمزا

**مەحمود**

**مەلیکی کوردستان**

ئەگەر سەیری ناوەڕۆکی نامەکەی شێخ مەحمود بکەین دەبینین چۆن لەهەولدا بوە بۆ بەدەست هێنانی پشتگیری وولآتە زلهێزەکان یاخود ئەو وولآتانەی خاوەنی بڕیاربوون بۆ بەهاناچوونی گەلانی لێقەوماو یاخود

گەلانی ژێردەست بەهەمان شێوەش سمکۆ گەلێ نامەی ئاراستەی ڕوسەکان کردکە یارمەتی و هاوکاری بکەن

تابتوانێ ڕۆژهەلآتی کوردستان ئازادو سەربەخۆبێت بەلآم ڕووسەکان چونکە لەبەرژەوەندیاندا نەبوو تەنانەت وەلآمی نامەکانیشی وەرنەگرتەوە.بەهەمان شێوە شێخ مەحمودیش چارەنوسی لەسمکۆ باشتر نەبوو.شێخ مەحمود زیاتریشی نوسی بۆ ئینگلیزەکان کەچی لەباتی ئاوڕدانەوە لەشێخ مەحمود تۆمەتیان دەخستە پاڵ شۆڕشەکەو پیاوەکانی خۆیان لەشێخ مەحمود نزیك

دەکردەوە تابەلا ڕێدابیبەن تەنانەت شێخ مەحمود نیگەرانی هەڵسوکەوتی ئینگلیزەکان بوو.دەچوون کەسێکیان لەدوورگەی عەرەبی یەوە دەهێنایە عێراق دەیانکرد بەمەلیك و ئەبوایە شێخ مەحمود چاوی لەدەستی ئەوبوایە.هەوڵەکانی شێخ مەحمود بەردەوام بوو. تا کایە ڕۆشنبیریەکان بەهێزتربێت .هەرچەندە خۆشی دەستی شیعری کوردی هەبووە لەبەشێك لە شیعرەکانی خۆیدا دەڵێ:

**فەرهادی قەومی کوردم و فەریادی کورد ئەکەم**

**دوژمن بەکوتەکی کاوە وەکوو شووشە ورد ئەکەم**

**بۆ بێستونی مانیعی ئامالی کوردەکـــــــــــان**

**وەك کۆهکەن بەعەزمی مەتین دەستو برد ئەکەم**

شێخ مەحمود هەمیشە هەوڵی داوە کوردستان بەعێراقەوە نەبەستڕێتەوە بەڵکو خوازیاری سەربەخۆیی ناوچە کوردی یەکان بووە.ئەمەش لەم بەڵگەنامەیەدا دەبینرێ کە دکتۆر کمال مەزهەر لە(کوردستان و کورد) هاتووە: سەعادەتی مەندوبی سامی بەریتانیا لە عێراق .

**دوای سلاو**

گومان لەوەدا نی یە کە سەعادەتتان باش ئاگاداری باری کارگێری ئێستای کوردستانن ئەم کارە پڕ لە شەرمەزاریانەی لەکوردستان کران.ئەو کارە دڕندانەی عەرەبەکان لەسلێمانی ئەنجامیان دا کوردستان هەرگیز لەوێنەیانی بەخۆوە نەبینیوە .دوای ئەوە هەڵبەت لای سەعادەتتان تەواو ئاشکرایە تاچ ڕادەیەك ئیتر کوردو عەرەب ناتوانن پێکەوەبژین کورد هەمیشە بێ هیچ شەرت و شروتێك ئێستاو دواڕۆژیش خۆیان بەقەرزاری حکومەتی بەریتانیا دەزانن کورد وەك ئەرکی سەرشانی خۆی هەرگیز درێغی نەکردووە لە دەربڕینی دۆستایەتی و ملکەچیان بۆ بەریتانیەکان چ ئیمڕۆکەو چ لەدواڕۆژیشدا بەلام بەداخێکی گرانەوە دەڵێم ئەم دۆستایەتی و ملکەچی یە تاوەکو حالی حازر لەکێشەو نەهامەتی بەو لاوەهیچی بۆ کورد لێ نەکەوتۆتەوە و بۆ عەرەبیش بوونەتە هۆی خێرو بێر بەپێی ئەو نامەو سەرەخۆشیانەی پێم

گەیشتوون لەوە گەیشتم کە کوردەکانی دراوسێشمان هیچ هیوایەکیان نەماوەو ئەوانیش تەواو بێ هوودەبوون بەردەوام لەهەرچوارلای کوردستانەوە هەواڵی ئەوەم دەگاتێ کەلەدوای خوێن رشتنە پڕ لەشەرمەزاری یەکەی عەرەب لەگەڵ کوردی لای خۆماندا کردیان ئیتر مافی هیچ ئیرادەیەکیان نی یە بەناوی ئەم نەتەوە (ئاری)یەوە هەموو داوای کورد ئەوەیە ئێوە لەجەنگی عەرەب رزگاریان بکەن و جودایان بکەنەوە. کورد زۆر بەپەرۆش و بڕواوە داوا دەکەن هەمیشە لەژێر حیمایەی بەریتانیەکاندابن.

ئیمزا

**مەحمود**

1930/9/17

ئەم نامەیەش ئەوە دەردەخات کە شێخ مەحمود ئومێدی بەئینگلیزەکان بووە وویستویەتی زیاتر لێیان نزیك بێتەوە بەڵام بەداخەوە ئەمە وەزعی حەقیقی شێخ محمود بووە لەکوردستان بەدەست عەرەب و ئینگلیزو تورکەوە.کەچی خەڵکانێك جارجارە گوێبیستیان دەبین دەڵێن شێخ مەحمود خۆی بەدوورگرتوە لەئینگلیز .دەنا کورد دەکرا بەحکومەت کە ئەمەڕاست نی یە و قسەی بێ بنەمایە و هیچی تر شێخ مەحمود لەیەکێك لەهۆنراوەکانیدا دەڵێ:

**موودەتێ عومرم بەتاڵان چوو لەسووچ و قوژبنا**

**پێمەلەم زۆرکرد لەبەر ئیمان لەبەحری بێ بنا**

**شاهبازێ بووم لەمەیدانی شکاری دوژمنا**

**جەهلی میللەت بوو بەزیللەت هات بەسەر شانی منا**

هەروەها شێخ مەحمود بە ناوی کۆمەڵێك هۆزو کەسایەتی واژۆکانیان کۆدەکردەوە بۆ پشتگیری کردنی شەریف پاشای خەندان بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس لەگەڵ وەفدەکەشدا نامەیەك ئاراستە دەکات لە 1919/3/20

**بۆسەرۆکایەتی کۆنگرەی ئاشتی جیهانی - پاریس .**

(نامەم پێشکەش بە ئێوەی بەڕێز دەکەم کە سەرۆکایەتی ئاشتی جیهانتان پێ سپێردراوە هیوای زۆرمان پێتانە کە گوێ لەدەنگی هەقی ڕەوامان بگرن ئەو بەیانانەی کەلەلایەن دەوڵەتە هاوپەیمانەکانەوە لەکاتی یەکەمین جەنگی جیهانیدا دەرکرا ئەو هەموو کوشتارو ماڵ وێران کاری یەی کە داتان بەهیوای ڕزگارکردنی گەلانی لاوازی ژێر دەستەی تورك و سوڵتەسەر کوت کەرەکەی بوون ئامانجتان لەم شەڕەدا سەربەخۆیی بوو بۆ ئەو گەلانە کەلەنێوانیاندا گەلی کوردیش دێت گەلی کوردمان یەکێکە لەو گەلە کۆنە ژێردەستانەی حکومەتی تورك کەلەدەمێکەوە بەدەستیانەوە دەناڵێنێ.بڵاوبوونەوەی ئەم بەیانانەش لەلایەن دەوڵەتە هاوپەیمانەکانەوە مژدەیەکی دڵخۆشکەربوو بۆمان لەهەموو شوێنێکی کوردستانەوە گەلی کورد دەنگی خۆی و داخوازی یەکانی بەرزدەکاتەوە بۆتان هەڵگری ئەم مەزبەتانەش (سەید ئەحمەدو سەید ڕەشید زەکی بەگ)کەبەڕێوەبەری قوتابخانەی کوردستانن و نماینەدەی ئێمەن لەکوردستانەوە دێنە لاتان داواتان لێ دەکەین بەداخوازی عەشیرەکاتەکانمان ڕازی بن گوێ ی هەقیان بۆ شل بکەن و مەزبەتەکانیان پێشکەش بەکۆنگرەی ئاشتی جیهان بکەن بۆئەوەی ئەوانیش بتوانن ئەم ستەمکاری یەی تورك مان لەسەر هەڵبگرن بەیارمەتیتان خۆمان دروست بکەین و نماینەدەکانیشمان بەمژدەی سەربەستی یەوە بگەڕێنەوە(56).

**سەرۆکی حکومەتی کوردستان**
**شێخ محمودی حەفید**

لەگەڵ ئەم نامەیەدا تەواوی خەڵکی کوردستان بەهیوابوون کە کۆنگرە ببێتە مایەی خۆشی و سەرفرازی بۆیە لەشارەکانی رۆژهەلات لەشارەکانی سەقزو وان و کەرکوك نامەو پشتگیری لەرێگەی شەریف پاشاوە نێردرا بۆ پاریس.داوای ئازادی و یەکبوونی پارچەکانی کوردستان کرا لەنامەکانی شێخ مەحمود دا دەرئەکەوێت کەچەندە بێ هیوا بووە لەروس و تورك وئینگلیزەکان و عەرەبەکانیش بەهەمان شێوە بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هەموو هەوڵ و ماندوو بوونە گشتی نووسراوی سەر کاغەز بووە و کاری پێ نەکراوە تەنانەت هەردوو وەفدی کوردی لە سوریا فەرەنسیەکان گرتنیان و هێنایاننەوە و لەموسڵ حوکم دران ئیتر وەفدەکە نەگەیشتە کۆنگرە.ئالێرەوە شێخ مەحمود زیاتر بێ هیوابوو کاتێك ویلسن حاکمی عێراق درۆیەکی تر دەکات کە دەڵێ کاتێك لەگەڵ شێخ مەحمود کۆبوومەوە سەرۆك عەشیرەتە کوردەکان بەشێخ مەحمود رازی نەبوون .

ئەمەش بەمەبەستی دروستکردنی گومان و بێ متمانەیی لەناوخەڵکی کوردستاندا و هیچی تر.

# داگیر کردنەوەی سلێمانی لەلایەن سوپای ئینگلیزەوە

دوای ئەوەی لەشکری کوردستان بلاوەی کردو شکستی هێنا لەبەرامبەر سوپای پرچەکی ئینگلیزله1919/6/18دا هاتنی مێجەرسۆنی بالوێزی گەرۆکی ئینگلیز هەر لەرێگەوە کەوتنە رووپیە بەخشینەوە بەناو پشدەرییەکان و شێخەکانی سەرگەلوو سەنگاو(57).تابتوانن سۆزیان بۆلای خۆیان رابکێشن گەلێك رێگای هاتووچۆی کردەوە مێجەرسۆن کەسێکی رەوشت نزم بوو بۆهەر لایەك برۆشتایە چەند ئافرەتێکی لەگەڵ خۆی دەبرد دەیویست بەهەر شێوەیەك بێت بێ رەوشتی لەناو کۆمەلگای مسولمانی کوردیدا بلاوبکاتەوە.واشی نیشان دەدا کە هاتوون خزمەت بەگەلی چەوساوەی کورد بکەن وەهەرچی پێ کراوە بەرامبەر بەکەسایەتیە ناودارەکان درێغی نەکردووە هەرکەسێکیان بەدڵ نەبوایە بەتۆمەتی هاوکاری کردنی شێخ مەحمودو شۆرشەکەی تووشی گێچەڵ دەبوو.کەلە 1919/6/20دا تەواو سلێمانی کەوتە ژێر رکێفی ئینگلیزەوە لە27حوزەیرانی 1919کۆتایی بەشۆرشی شێخ هات .دورخستنەوەی شێخ مەحمود وای لەئەفسەرە کوردەکان کرد لەگەڵ کەسایەتیە نیشتیمان پەروەرەکاندا جەمعیەتێك دروست بکەن و درێژە بەشۆرشەکە بدەن وا لەئینگلیزەکان بکەن کە بیر لەگەرانەوەی شێخ مەحمود بکەنەوە لەکاتی خۆیدا زیاتر درێژەی پێ دەدەین.عەبدوللا زێوەر دەلێ:دوای ئەوەی تورکەکان لەسەر دەستی عەشایەری سورچی و دزەیی و خۆشناودا شکان و رووەو سنوری ئێران رایان کرد ئینگلیزەکان هێزێکیان ناردە سلێمانی و تەکلیف لەشێخ قادری برای شێخ مەحمود کرا بەئاسایش حکومەتێکی وەتەنی دروست بکات مادام تەماشای پرسی کورد دەکات بەلأم شێخ قادر تەکلیفی قبوڵ نەکرد و شاری بەجێهێشت.چووە سەر دێ یەکەی خۆی دانیشت(58).

# (ڕۆژانی دەربەدەری)

شێخ لەتیف لەیادەشتەکانیدا دەڵێ دوای ئەوەی لە 1919/6/22دەنگ بڵاوبۆوە لەناوخەڵکدا کە سوپای شێخ مەحمود توشی شکست هاتووە شێخ بەبرینداری لەلایەن ئینگلیزەوە گیراوە. کۆمەڵێك لەئەفسەرو سەربازی دڵسۆزەکانی کوژراون خەڵکی تووشی دڵەڕاوکێ بوون و ئێمەش بەهاوکاری خەڵکی بەشەرەفی مەڵکەندی بەتایبەتی حاجی کەریم و ئەحمەد بەگی ساحێب قران و نوری برای .توانیمان شاری سلێمان بەجێ بهێڵین کە سوپای ئینگلیز هاتنە خاکەکەمان هەرچی ئاڵتون و لیرە هەبوو بردیان و پاشان خانوەکەیان ئاگرداو لەگەڵ زەوی تەختیان کرد.ئیتر ئەم خێزانە قۆناغ بە قۆناغ بەژن و مناڵەوە بەرەو سنور تا دەگەنە مەریوان لەوێشەوە بۆ لای محمود خانی کانی سانان و پاشان دوای حەوانەوەی چەند ڕۆژە بەرەو دزڵی لای محمود خانی دزڵی بەڕێ دەکەون و بەگەرمی پێشوازی دەکرێن ماوەی مانگێك لەوێ دەمێننەوە لەو کاتەدا کونسوڵی ڕووسی لەکرماشان داوا لەوالی سنە دەکات کە محمود خان بگرێ حکومەتی ئێرانی بەفێڵ دیاری بەنمایندەی خۆیدا دەنێرێ بۆ محمودخان و داوای لێ دەکات.کە سەردانی سنە بکات و حکومەتی ئێران بڕیاری داوە کە بتکاتە فەرمانڕەوای سنە هەرچەندە پێی دەڵێن مەچۆ ئەمە فێڵە بەڵام محمود خان لەگەڵ چەند چەکدارێك دا دەڕوا و لەوێ دەگیرێ و تەسلیمی ئینگلیزەکانی دەکەن و ئەوانیش ڕەوانەی بەندیخانەی هندی یە دەکەن لەعێراق بۆجارێکی تر لەگەڵ شێخ مەحمود یەك دەگرنەوە.

پاشان بەهەمان شێوە نمایندەی ئێران سەردانی محمود خانی کانی سانان دەکات و بەشێوەی پێشوتر بەویش دەڵێن بەڵکو سەردانی سنە بکات تابکرێتە فەرمانڕەوای سنە لەئەنجامدا دەچێتە سنەو لەوێ بەدەردی محمودخانی دزڵی دەبەن دەیگرن سەیر لەوەدایە سەرکردەکانی کورد هێندە خۆش باوەڕن کە زۆر بەئاسانی دەکەونە دوای دوژمنەوە.

خێزانی شێخ محمود لەدزڵی دەرئەچن و دەچنە ناوچەی بانە .لەوێ چەند رۆژێك میوانی رۆستەم خان و پاشان بۆلای سیف الدین خان لەسەقز. ئینگلیزەکان تەبلیغی هەردوولایان دەکەن کە خێزانی شێخیان تەسلیم بکەن ئەوانیش رازی نابن بۆیە سوپایەکیان بۆناردن و هەردوولایان تێك شکاندن و سیف الدین خان و رۆستەم خان گیران و بڕیاری کوشتنیان دان و هەر زوو بڕیارەکەیان جێ بەجێ کرد تەنانەت خێزانی شێخ مەحمود هێندە دڵ تەنگ دەبن خۆیان بەئەرك دەزانن بەسەر خەڵکەوە ناهەقیان نیە چونکە ئەوە کەی رەوایە لەووڵات و نیشتیمان و ناوگەلی خۆتا نەتوانی بمێنیتەوە و دوژمن قۆناغ بە قۆناغ بەدواتەوە بێت و هەوڵی دەستگیرکردنت بدات بۆیە ئەو خێزانە بەرێزەش بڕیار ئەدەن بەرەو ئازربایجانی سەرو یاخود باکوری رۆژهەلاتی کوردستان بڕۆن هەرچۆنێك بێت خۆیان بگەیەننە مەڵبەندی شکاك تا بۆماوەیەك بحەوێنەوە.ئەم سەفەرە دوورودرێژەو رێگاکردن لەگەڵ ژن و منداڵ کارێکی هەروا ئاسان نی یە.تا دەگەنە ناو عەشیرەتی مەنگوڕ و بایزئاغای مەنگوڕ زۆر مەردانە پێشوازی کردوون چەند رۆژێك دەمێننەوە پاشان روو لەناوچەی نەهری دەکەن جێگای شێخ عبدالقادری نەهری و شێخ عبداللەی نەهری و شێخ تەهای شەمزینی نەوەی شێخ عبدالقادری نەهری دەبینێت وەك خێزانی شێخ مەحمود دەڵێن دڵخۆش نابێت بەچوونەکەیان بۆیە ئەوانیش بڕیار ئەدەن بچنە لای کەسایەتی و سەرکردەی ناسراو ئیسماعیل خانی سمکۆ کاتێك لەرێگاوە دەچنە گوندی (مێشەدەرە)بێوەژنێکی لێ دەبێ بەناوی(سەیزادە)ئەم گوندەجۆگەیەك دەیکات بەدوو بەشەوە سەیزادە هەموو رۆژێك ئەمبەرو ئەوبەری ئاوەکەی دەکرد بۆئەوەی لەوبەری ئاوەکە پەنیرو کەرە بۆ منداڵەکانی شێخ دەهێناو جارێك لەناو ئاوەکەدا لاقاودێت و دەی خنکێنێت .دوای ئەم هەموو کارەسات و ماندوبون و شەونخوونیە دەگەنە لای سەرکردەی ناسراوو دەست رۆیشتوی ئەو ناوچەیە کەئەویش سمکۆی شکاکە کاتێك گەیشتنە کۆنە شاری مەڵبەندی سمکۆ دانیشتوان زۆر بەگەرمی پێشوازی یان دەکەن ئەوانەی کەلەگەڵیان دەبن زێوەری شاعیرو سەید عبداللەی حاجی سەید حسن و شێخ علی و کاکە حەمە کە هەردوکیان

ژنبرای شێخ محموودبون بەچاکم زانی کەلەزاری شێخ لەتیفەوە پێشوازی سمکۆ بنووسم کەدەڵێ: سمکۆی شکاك بەسواری گالیسکە هات بۆ دەوارەکەی ئێمە پێیان ئەوت (بایتۆن)سیزاری قەیسەری رووس بەدیاری دابووی بەسمکۆ وەرزی بەهاربوو دانیشتوانی شارەکە بەکوردو تورك و گشت تایەفەکانی ترەوە سلاویان بۆ سەرکردەکەیان دەکرد هاتە لای ئێمە خاڵەکانم و زێوەری شاعیر و عبدوللای سەید حەسەن و حەپسەخان و دایکم چوونە پێشوازی و سلاویان لێکرد ئەویش سەری بۆ دایکم دانواند و میر سمکۆ ووتی ئێوە خاوەنی وولات و ئێمە غەوارە.لەئێوە فەرمان و لەئێمە جێ بەجێ کردن تکام وایە بەگرتنی شێخ محمود کەنیشانەی شەرەفی کوردانە.دلگران مەبن چونکە مێژوومان پرە لەشانازی دوای ئەوەی فرمێسك بەچاوەکانیا هاتە خوارێ ڕێ ی قسەکردنی لێ گرت کەمێك هاتەوە سەرخۆی ئێمەی جێ هێشت و بۆ ماڵی حاکمی شار ملی نا فەرمانێکی دەرکرد دەڵێت:( خێزانەکەی شێخ مەحمود بەهۆی زوڵم و زۆری ئینگلیزەوە دەریەدەری وولاتی خۆیان بوون.هاتونەتە لای ئێمە هەرچی پێویستی ئەم خێزانەیە لەسەر حسابی میرنشینەکە دەیاندرێتێ هەر فەرمانێکیشیان هەبێ دەبێ بەزووی جێ بەجێ بکرێت پێویستی ژیانیان بۆ ئامادەبکرێت دەمەوێت پارێزگاری لەژیان و شەرەفیان بکەم پەیمان دەدەم کەجەماوەرو میرنشینەکەم لەخۆشی و ناخۆشیا لەگەڵیان بم بەرهەڵستی ئەوانەش دەکەم کە داوایان دەکەنەوە ڕۆح و سوپاکەم فیدایانە)(59).
ئەمە هەڵوێستی قارەمانانەی سمکۆ بووە هەر ئەوەشی لێ چاوەڕوان دەکرا دوای ئەوە هاتنی خێزانی مەلیکی کوردستان بلاودەبێتەوە حاکمی تەورێزو ورمێ و هەردوو کونسوڵی ئینگلیز دەچنە لای سمکۆ داوای ئەوەی لێ دەکەن کەخێزانی شێخ تەسلیم بەوان بکرێت ئەوانیش بیدەنەوە دەست ئینگلیزەکان بەلام سمکۆ زۆر تووڕە ئەبێت و دەڵێت مردن بۆ ئێوەیە کە دوژمنایەتی ژن و منال دەکەن وولاتەکەیانتان کاول کردووە واز لەمنداڵەکانی ناهێنن پاشان دەڵێت :من لەپێناوی خێزانی شێخ مەحمود دا ئامادەم هەموو سەربازەکانم بەکوشت بدەم تەنانەت خوێنی خۆشم.ئەگەر هەر چارم نەما ئەوا یەك بەیەك منداڵەکانی شێخ مەحمود

بەدەستی خۆم دەیانکوژم و تەسلیمیان ناکەم هەر لەم کاتەدا شێخ قادری برای شێخ مەحمود دێت بۆ سۆراغی منالەکان ئەویش لەموکریان دەسگیردەکرێت و تەسلیم بەئینگلیزەکان دەکرێتەوە پاشان ئەویش دەنێرنە هیندستان بۆلای شێخ مەحمود.پاش ماوەیەك کەسێك نامەیەك دەبات بۆ خێزانی شێخ مەحمود گوایە نامەکە شێخ قادر نوسیویەتی تێدا هاتووە وەزعی ئێمە زۆر باشەو شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزدا رێکەوتووە ئێوەش بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی دوای ئەوەی ئەمانیش ئاهەنگی خۆشی دەگێڕن سمکۆ ئەم هەواڵە دەبیستێ و دەچێ بۆ سەردانیان ئەوانیش خێرا نامەکەی دەدەنە دەست سمکۆ دوای ئەوەی سکرتێرەکەی دەیخوێنێتەوە خێرا دەڵێ ئەمە پیلانە کابرای نامە هێنەر دەگرێ دەڵێت من لەتورکیاو لەڕوسەکانەوە هەواڵی دوێنێم هەیەو شێخ مەحمود هەر لەهیندستانەو ئینگلیزو ئێران بەتەمان هێرش بکەنە سەر ئێمە بۆیە سیخوڕەکە دەگرن و دوای لێدان هەموو ڕاستیەکە ئاشکرا دەکات ئەوانیش لەشاخێکەوە فڕێی ئەدەنە خوارەوە.

پاشان ئێرانیەکان بەهێزێکی زۆرەوە ڕووەو ناوچەی شکاك پێشڕەوی دەکەن و ناوچەکەیان گەمارۆ ئەدەن پێش ئەم گەمارۆدانە سمکۆ هەرچی سونەکانە دووریان دەخاتەوە بۆ ناوچەکانی نزیك شاری وان لەترسی عەجەمی جەعفەری.کە ئەمە جگە لەکێشەی نەتەوەیی کێشەی مەزهەبیش بوو.دوای ئەوەی گەمارۆکە توند ئەکەن هێرش و پەلامار دەست پێ دەکات تەنانەت تا سێ مانگ بەم شێوەیە دەمێنێتەوە کەمی تەقەمەنی و خۆراك زۆر بۆ سوپاکەی سمکۆ دێنێ و ئەویش بەئەحمەد ئاغای برای دەڵێ بەڵکو بچنە دەرەوەی گەمارۆکەو پاشان هێرش بکەنەوە بەڵکو گەمارۆکە بشکێنین سوپای عەجەم 18هەزار کەس بوون ئەحمەد ئاغا بەرنامەی هێرشەکەی سمکۆ جێ بەجێ دەکات سوپای عەجەم دەشکێت و دەست دەگرن بەسەر کۆمەڵێك ئازوقەو تەقەمەنی عەجەمەکان.ئیتر هێرش لەدوای هێرش عەجەمەکان دەشکێ و زۆریان دیل دەبن لای هێزەکەی سمکۆ لێرەدا کۆمەڵێك ڕاوبۆچون هەیە کە گوایە دیلەکان کوژراون دەستییان لێیان نەپاراستون.هەندێك دەڵێن ئەوە دوژمنانی کورد باسی دڕندەیی کورد

دەکەن بەو چەشنە نی یە بەڵام ئەم ڕایە لاوازە.دەبێت ڕای یەکەم جار ڕاست و دروست تربێت چونکە بەوتەکانی سمکۆدا دەرئەکەوێت کەلەدیلەکان بێزارو تورە بووە کە پێی وتوون ئێوە هاتوونەتە سەر خاك و وڵاتی ئێمە و ژن و منداڵ و پیرو پەککەوتە دەکوژن هیچ بەهایەکی مرۆڤایەتی نازانن بۆیە ڕەنگە بڕیاری کوشتنی دیلەکانی دابێ شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود لەیاداشتەکانی دا دەڵێ سمکۆ چەکدارەکانی ڕاسپارد کەبەچەکەکانی خۆیان بیانکوژن کەبەژمارە باسی چەند هەزار سەربازێك دەکات ئەگەر لەحاڵەتێکیشدا ئەگەر وابێت ئەوا ناکرێ هەروا بەسوك و ئاسانی سمکۆو چەکدارەکانی تاوانبار بکرێن چونکە سەربازەکانی کورد لەبەرەی بەرگری و بەرگری لەخۆکردنداببوون پێشتر لەشەڕی ناوشاری ورمێ و دەوروبەری تەنها لەعەشیرەتی شکاك 1920کەس لەژن و منداڵ و پیری پەککەوتە کوژراون لەماوەی مانگێکدا ئەم ژمارەیەم لەدەمی کەسانی بنەماڵەی سمکۆوە وەرگرتووە.جگە لەخەڵکێکی زۆر کە دەربەدەرو لەناوشەڕو کوشتن و لەسەرماو لەبرسان وڵاتیان جێ هێشتووە کەزۆرینەی ئەوانیش کوردبوون بەتایبەتی عەشیرەتی شکاك

شێخ لەتیف دەڵێ:(سمایل خان پێشەوایەکی ئازاو چاونەترس و بەتوانابوو لەنەخشەکێشانی پیلانی جەنگیدا.جەنگاوەرێکی بێ هاوتابووە دەیویست حکومەتێکی کوردی دابمەزرێنێ و ئیدارەیەکی ڕێك و پێکی بکات .دژی تاڵان و جەردەی نائاسوودەیی بوو لەسەر شانۆی ڕامیاری دیبلۆماسیەکی گەورەبوو هەمیشە لەگەڵ وڵاتە دراوسێکانیدا پەیوەندی و کۆبوونەوەی دەکرد و لەو سەرۆکانە نەبوو وڵاتەکەی بۆ پارە بفرۆشێ یان حەز لەپایەی بەرز بکات ئەو سیفەتانەی لەسمکۆدا باسمان کرد.لەبەرئەوەی سمکۆ دۆستی دڵسۆزی نەبوو پشتگیری بکاو گەلەکەشی هێندە وریانەبوون خۆی پێ ڕانەگیراو ڕوخا جگە لەمانەش دوژمنە دێرینەکانی کورد وەك ئینگلیزو ئێران و تورك زۆر بەهێزبوون دەرەبەگە کوردەکانیش پاڵیان پێوە دابوون سمایل خان بەرامبەر دوژمن و داگیرکەر دڵ ڕەق بوو لەبزوتنەوەکەشدا بەتوانابوو بەدرێژایی ژیانی هەر

لەهەڵسوکەوتدابوو هەرگیز مۆڵەتی بەخۆی نەدا لەتەك سەرۆك کوردەکاندا کۆبێتەوە دەیویست ڕیزەکانی یەك بخات و بۆئەوەی کوردستان ڕزگاری بێت بەلآم هەڵەکانی ئەمانەبوو کوشتنی مارشەمعون و نزیك بونەوە لەتورکەکان.چوونە ناوشۆڕشی سەید تەهای شەمزینان و داگیرکردنی شاری مهابادو تالآنکردنی شارەکە لەلایەن سوپاکەیەوە سوپاکەشی تێکەلآوبوو لەو دۆستە نوێ یانەی کە لەژێرەوە لایەنگری ئینگلیز بوون ئەمەش بۆ ناشیرین کردنی لای گەل . لێرەدا دەمەوێت هەندێك وەلآمی دروستی ڕای خوالێخۆشبوو شێخ لەتیف بدەمەوە هەرچەندە خۆشی هەمان ڕای منی هەبوو کەدەڵێ سمکۆ دیلەکانی بەچەکەکانی خۆیان کوشت ئەمە ڕاستەو.دەرئەنجامی ئەو کارە دزێوانەیە کە ئەوان دەرهەق بەمیللەتێکی بێکەسی بەشخوراو دەیانکردو ئایا ئەوان هیچ بەهایەکی مرۆڤایەتیان دەزانی دەستیان دەپاراست لەکەسانی بێ تاوان و دوورلەشەڕ یاخود هەموویان بەیەك چاوسەیر دەکران و دەکوژران بۆ کوشتنی مارشەمعونیش قسەو باسی زۆری لەسەر کراوە .سمکۆ هیچ کات نەیشاردۆتەوە کەبەچ مەبەستێ مارشەمعونی کوشت.دەڵێت وای بۆچووم کەبیکوژم چونکە لەپشتی ئێمەوە پیلانی دائەنا تا دەست بەسەر باکوری کوردستاندا بگرێت.ئەگەر سمکۆ مارشەمعونی نەکوشتایە ئەوا ئێستا ناوچەی گرنگ و ژیاری کوردستان دائەبڕاو ئێستا دەبوایە لەدوورەوە بۆی بگریاینایە.هەرچەندە بۆ خۆم لەگەڵ هیچ جۆرە کوشتنێکدا نیم و ئەوەش زیانێکی گەورەبوو گەلی کورد و ئاسووری.مەزەبی زەرەرمەندی سەرەکی بوون و بەقازانجی دوژمنان کەوتەوە.ئێستاش سلبیاتی لەهەندێك وشوێن و ناوچەدا هەرماوە.لەبارەی چوونی سمکۆ بۆناو شۆڕشی سەید تەها ئەمەش بەو شێوەیە نییە. بەڵکو هاوکاری کەم هەبووە لەنێوان سمکۆو سەید تەها هەرچەندە خزمیش بوون لەڕێگەی ژن و ژن خوازی یەوە بەڵکو ساڵی 1914جەمعیەتێکیان بەهاوبەشی دروست کرد بەناوی (جمعیەتی استخلاصی کوردستان)ئەم جەمعیەتەش وەك ڕێکخراوێکی نەتەوەیی و هەوڵدان و داوایان لەکاربەدەستانی ڕووس کردووە بۆ گفتوگۆ دەربارەی هاوکاری کورد دژی تورك بەو مەرجەی پشتیوانی لەئامانجی نەتەوەیی

کورد بکەن نوسەری کوردو عەجەم لەلاپەرە 413دا دەڵێ پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەرو کشانەوەی تەواوی سوپای ڕووس لە ورمێ و مەڵبەندەکانی دەوروبەری بۆشایی دەسەڵاتی تێکەوت دەوڵەتانی هاوپەیمان ویستیان بەئاسووری یەکان پڕی بکەنەوە.ئەمەش وەلامێکی دروستبوو بۆ ئەوەی کەهاوپەیمانان دەیانویست بەشێکی کوردستان بکەن بە دەوڵەتێك بۆ ئاسووریەکان.هەروەها ناوبانگی سمکۆ هێندە گەورەبوو کە ناکرێ بەو شێوەیە بێت کەسمکۆ داخڵ بەشۆڕشی سەید تەها بوبێ لێرەدا دەڵێم دروست کردنی جمعیەی استخلاصی کوردستان بۆ وەرگرتنی هاوکاری لەگەڵ ڕووس بووە دژی تورك ئیتر سمکۆ چۆن بوە بەداردەستی تورك کەخۆی لەهەموو کەس باشتر تورکەکانی دەناسی.هەروەها شێخ لەتیف دەڵێت داگیرکردنی مهابادو تالانکردنی لەلایەن سەربازەکانی سمکۆوە ئەمەش تەنها ڕای شێخ لەتیف نییە بەڵکو زۆر لەنوسەرانی عەجەم هەندێکی خۆمانەش هەمان قسە دەڵێنەوە.بەلام ئەم بابەتە لەشوێنی خۆیدا کەبەدرێژترو چڕتر باسی دەکەین و ئەوەی دەمەوێ بیڵێم تەنها ئەوەیە کەسمکۆ مهابادی داگیرنەکرد بەڵکو ڕزگاری کرد لەچنگی عەجەم ئەمەش بەخۆشی چۆڵ نەکرا بەڵکو شەڕی سەختی تیاکراو کوژراو برینداری زۆری تیابوو ئەو شەڕەش سەرکەوتنێکی گەورەبوو بۆ شۆڕشگێرە کوردەکان و ڕووخانی ورەی دوژمنان.ئەحمەدی کیسرەوی لەبارەی سمکۆوە دەڵێ(سمکۆ ئەم سەردەمە سەربەخۆیی بۆ کوردستان ئەویست و لەرێگەی ئەم ئارەزوەدابوو کەوتە ئامادەکردن . یەکێ لەتۆوەکانی ئاشوب و زیانکاری کەئەوروپایی لەرۆژهەلات دا وەشاندویانە ئەم ئارەزووی سەربەخۆییە کارکەرانی ئەوانە ساڵەها گەڕان و چوونە ناو کوردو ئەرمەنی و تورکمان و ئاسوری و بەختیاری و هتد.........

ئەم تۆوەیان لەدڵی ئەواندا چاندووە ..کوردیش چەندەها ساڵ بوو ئەم قسانەی بیست بوو هەوەسمەندانی شوێن ئەم ئارەزووە کەوتبوون و هەندێ جار کتێب و وتاریان دەنوسی بۆیە ئێستا سمکۆ دەیویست ئەو ئارەزووە بهێنێتەدی بەپەیڕەوی ئازادیخوازانی عوسمانی کە(ژون

تورکی)لێ پەیدابوو ئەو کارانەیان کردبوو بۆ دروست کردنی دەستەیەك بەناوی ژون کورد تێ ئەکۆشا)*

کاك کەریمی حسامی لەکتێبەکەیدا شیعرێکی(سیف القضات) نوسیوە دەڵێ:

(سمکۆیٚ خودا کەداویە بەمە ساحێب و ڕەئیس
شوکری بکەین بەزارو زبان و ددان ولیـــــــو
مەقسودی وی ئەمە کەهەقی مە بداتەمـــــــە
تەکلیفی مەش وەهایە فیدای بین بەنێر مێو)

ئەمەش نیشانەی خۆشەویستی سمکۆیە لای خەڵکی کوردستان بەڕزگارکەر تەماشاکراوە نەك داگیرکەر و تالآن چی.

خەڵکانی تر هەندێك شیعری تریان کردبووە ویردی سەر زمانیان ڕۆژانە لەسەر زاری خەڵکی یەوە دەبیسترا لەژمارە 5ڕۆژی 4ی ئەیلوولی 1922گۆڤاری بانگی کوردستان نوسیویەتی :

صەبا هەستە دەخیلت بم برۆ بۆ چارێ لای سمکۆ
بلێ تاوی بدا ئەسپی هەتا تەبرێزو قافلانـــــکۆ
هەموو کرمانجی کرمانشا بەئاواتن بەجان و دلـــ
سنە حاجر هەموو دەڵێن بێ لەشکری سمـــــکۆ

یاخود جاری وا هەبووە سەرکەوتنەکانی سمکۆ هێندە ئومێد بەخش بووە وای لە خەڵکی کردووە کە سەرکەوتنەکان بکەن بەشیعرو وەك گۆرانی ئەم شیعرانە لەگۆڤاری بانگی کوردستان ژمارە 6 ڕۆژی 18ئەیلوولی 1919نوسیویەتی:

* ئەحمەد کیسرەوی:بڕوانە کوردو عەجەم نەوشیروان مستەفا لاپەڕە 418-419.

بەشارەت بێ دەڵێن سمکۆ هجومی کردە سەر ئێـــــــران

بڵاوەی کرد عەجەم تێك چوون وەکو ڕێوی لەبەرشێران

شەبەیخونێکی مەردانە شکاك و هەرکی یان کـــــــــردی

بڵندی کرد بەحمدلله کڵاو وتەپلەی کـــــــــــــــوردان

دەسا کوردان بەفیداتان هەموو هەســـــــــتن بەیەك جارا

نەتیجەی ئەم شەڕە خێرەکە ئیستیقلالە بۆ کـــــــــــوردان

ژمارە9ی تشرینی یەکەمی 1922 لەژێر ناوی (اسماعیل خانی سمکۆ)نوسیویە:

بکێشە خەنجەرت سمکۆ بدە نەعرە هەتا توران

سەلامێ کە لە شاەڕا(؟)کە یارە بۆ هەموو کوردان

نیهایەتدە بەقاجاران کە جای قاجار لـــــــــەتورانە

وەلی جای پەهلەوی و فورسان تەواوی موڵکی ئێرانە

دەسادیبوکرییان هەڵسن لەگەڵ مەنـــــــــگوڕبەئازانە

ببەستن ڕێی فیرار(؟)ئەسیری کەن بەمـــــــــــــەردانە

تەنانـــەت جـــەلال تاڵـــەبانی لەکوردســـتان و بزوتنـــەوەی نەتـــەوەیی کـــورد(60).دا دەڵێــت مێژوونوسان لەسەرئەوە کۆکن کەپەیوەندی یەکان لەنێو کوردە موسڵمانەکان و بـرا مەسـیحیە کوردستانیەکاندا و لـەنێوان تایفـە مەسـیحیە غـەیرە کوردەکانـدا بەدرێـژایی ڕۆژگـار پەیوەنـدی خۆشەویستی وبرایەتی و هاوکاری بووە دەبێت کوردەکان شانازی بکـەن کـە ئـەم پەیوەندیانـە باشن و بەرەو باشتریش پەرەدەسێنێت هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان.سەرەڕای هەوڵە داگیرکاری یـە بەریتانیەکان و هەوڵەکانی دوژمنان ئەوا ئـەو پەیوەندیانـە بەخۆشەویسـتی وبرایـەتی ماوەتـەوە لەمێژووی ئەم پەیوەندی یە درێژانەشدا تەنها یەك ڕووداو هەیە کەلەباری دروستی ئـەم برایـەتی یـە مێژوویـــەی بۆماوەیـــەکی کـــەم شـــێواندبێت ئـــەوەش ئـــەو قەســـابخانە تاوانکاریـــەبوو

کەسمکۆ(سمایل خانی شکاك)ئەنجامی دا دژبەبرا ئاشوری یەکانمان ئەم پرۆسە غەدرکارییە کوردە پێشکەوتوو خوازەکان ئیدانەی دەکەن مێژووی کوردی پڕلەخۆشەویستی و دۆستایەتی لەبەرامبەر برا ئاشوریەکاندا بێزراوی دەکات چەندین جار خوێنی کوردەکان و ئاشوری یەکان لەسەر کوشتارگەی ئازادی نیشتیمانە هاوبەشەکەیان ڕژاوە ئاشوریەکان و برا مەسیحیەکانی تریش چەندین شەهیدی سەربەرزیان بەخشیوە نمونەی هورمز ملك چکۆو چەندانی تر لیژنەی لێکۆڵینەوەی سەر بەکۆمەڵەی گەلان لەسالی1925دا ئەوەی باس کردوە پەیوەندی لەنێوان گەلی کوردی و مەسیحیەکان باشترین جۆرەکانی پەیوەندی بوە لەنێوان موسڵمانەکان و مەسیحیەکاندا).

ئەمە ڕاو بۆچوونی جەلال تالەبانی یە سەبارەت بەو کوشتەرگەیەی کەئەو باسی دەکات تالەبانی هەقی خۆیەتی کەبەو شێوەیە بەرگری لەبرا ئاشوری یەکان بکات چونکە بەلێك دانەوەی تالەبانی ئەو ئاشوریانە هەمان ئەو ئاشوری یە دڵسۆزو بەئەمەك و دۆستانەی باشوری کوردستانن کەهەمیشە لەسەنگەری بەرگری و گیان فیدایدا بوون لەباشوورو لەخۆشی و ناخۆشیدا لەگەڵ کورددا بوون تەنانەت بوون بەبەشێکی جیانەبوەوە لەکوردو لەحکومەتەکەی شێخ مەحموددا کەریمی عەلەکە وەزیری دارایی بوو لەدوای سەرۆکی وەزیران کەشێخ قادری حەفید بووە ناوی کەریمی عەلەکە دێت تا ئێستاش هێندە خۆشەویستە کەلەیادەوەریدا دەرناچێت و برا غەیرە موسڵمانیەکان بۆ ساتێکیش لێمان دانەبڕاون کەواتە کوردەکان ئەرکی سەرشانیانە لەخۆیان باشتر شکۆمەندیان بپارێزن و بەشداریان پێ بکەن لەدام و دەزگاکانی وڵاتدا بێ جیاوازی بەڵام ئەپرسم داخوا ئەو برا ئاشوریانەی لای سمکۆی شکاکیش هەروابوون یان بەهەرچوارلا دەگەڕان و دەیان ویست لەسەر حسابی کورد دەوڵەتداری بکەن ئایا ئەوان دەست پێشخەرنەبوون تا ئەو کارە نەخوازراوە ڕوویدا کەهەردوولا زەرەرومەندی سەرەکی بوون خۆ هەمان ئاشوری بوون لەباکوری کوردستان کەتالەبانی لەلاپەڕە64ی کتێبەی (کوردستان و بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد)باسی دەکات دەڵێت لەسالی 1829دا کەمسیۆنێرەکانی بەریتانیا

هاتنە ناوچەکە لەگوندی (تکومە)نیشتەجێ بوون بەکرێ گیراوێك بەناوی (کرانت)تۆوی دوبەرەکی چاند لەنێوان موسڵمانە کوردەکان وئاشوریەکاندا شەمعونیش بەپروپاگەندەی ئەوانە هەڵخەڵەتاو چەند ڕووبەڕوبونەوەیەکی خوێناوی لەنێوان ئاشوری یەکان و هەندێك هۆزی سەر بەبەدرخانیەکان دا ڕویدا ئەمەش ئەوەی خواست کەبەدرخان بێتە ناو مەسەلەکەوە و باڵوێزی ئەو کاتەی بەریتانیاش (ستراتفۆرد ریدکلیف) ئەوەی قۆستەوە لای بابی عالی مەسەلەکەی ووروژاندو فشاری خستە سەر حکومەتی تورکی بۆ ناردنی سوپا تا شۆڕشەکەی بەدرخان پاشا سەرکوت بکات بەوشێوەیە داگیرکەری بەریتانی هەر لەو کاتەوە دوژمنایەتی خۆی بۆبزوتنەوەی کوردی و هیواو ئاواتەکانی گەلی کورد خستەڕوو.....)

لێرەدا دەپرسین خۆ ئەو مێژووەی کە ئەمەی تیا ڕوویداوە سمکۆ بە53ساڵ دوای ئەو مێژووە لەدایك بووە.ئەو گێچەڵە لەناوچەیەکی تری کوردستانیدا بووە دەکرێت بڵێین ئەمەش کورد بەر پرسە لێی و پەنجەی تاوان بۆ کورد ڕابکێشین؟

بائەم وەڵامە لای تاڵەبانی و ئەوانەی وەك ئەو بیردەکەنەوە جێ بهێڵین.

دەربارەی ڕۆژنامەی كورد كە سمكۆ دەریكردووە (تمدن) لەكتێبەكەیدا لاپەڕە (269-271)بەناوی (أوضاع ایران درجنگ اول تأریخ رضائیه)دەڵێ: دەرچوونی ڕۆژنامەی كوردباسی تەقەللای سمكۆ دەكات بۆ بەچاپ گەیاندنی كە خاوەنی چاپخانەكە (تمدن)خۆی بووەو دەیگێڕێتەوە كەوا ڕۆژێكیان (سەید عبدالله)كەسێكی سمكۆ و سەیدتەهابوو هاتە لام ووتی كە (ئاغا)مەبەستی سمكۆ بووە لەبەرچاویەتی كەبەهۆی نەبوونی بلاوكراوە لە رضائیە (ورمێ)ئەم كەموو كورتی یە نەهێڵێ لە(ورمێ)ش ڕۆژنامە بلاوبكرێتەوە ئایا بەچ قەبارەو تیراژێك ئەتوانرێ ڕۆژنامەیەك لەم شارەدا بلاوبكرێتەوە هەم سەنگین و هەم جێگای سەرنجدان بێت (تمدن) ئەڵێ بەداخەوە حەرفەكانی چاپخانەكەمان زۆر كەمەو بەشی چاپكردنی ڕۆژنامەناكا ئەڵێ كەسەید عبدالله ئەم وەلامەی بیست زۆر تێكچوو گۆڕا ترسام و هەستم بەهەڵەی خۆم كرد ووتم ئەگەر لەگەڵ كرێكارەكانی دامەزراوەی خۆمان تەقەللابدەین ئەبێ زەحمەتی زۆر بكێشین,هەتا كەرەستەی پێویست ئامادەبێت.لێرەدا قیافەی شێخ عبدالله گۆڕا وەلامی نەدایەوە هەرچەند ئەو بەڵێنی ئەدا كەهەقدەستی كرێكارەكان دابین دەكا بەلام نەدەكرا لەو ڕۆژگارەدا بڕوا بەقسەی كورد بكەیت لەبەرئەوەی یاخی بوون لەفەرمانی سمكۆ لەو هەل و مەرجەدا یاریكردن بوو بەگیان پاش دوو سێ ڕۆژ هەڵهاتم(تمدن)(61).

بەلام سمكۆ بەردەوام بوو لەسەر ڕای خۆی بۆ دەركردنی بلاوكراوەیەك.ئیتر بەزۆربێت یان نا دەبێت بلاوكراوەیەك دەربكرێت بێ گومان سمكۆ دەیویست لەخەڵكی بگەیەنێ كەدژی هیچ نەتەوەو ئاینێك نیە.بەڵكو ماف بۆ خاوەنەكەی دەگێڕێتەوە .چونكە دوژمنان خراپ لەدانیشتوانی غەیرە كوردی یان گەیاندبوو.بۆیە سمكۆ پێ داگری دەكرد لەدەركردنی ڕۆژنامەكە بۆ ئەو مەبەستە زیاتر بووە كەچوون بۆ چاپخانەكەی (تمدن)و تابلۆكەیان لابردووەو تابلۆیەكی تریان داناوە بەناوی چاپخانەی (غیرەت)بۆ دڵنیابوون لەڕاوبۆچونی و نیازپاكی سمكۆ ڕۆژنامەكە بەزمانی فارسی و كوردی دەرچووە وەك هەفتە نامەیەك بەناوی (ڕۆژی كوردو شەوی عەجەم)پاشان گۆڕا بۆ (ڕۆژی كورد)دواییش بۆ (كورد)ژمارەی یەكەمی لە12ی شەوالی

1340دا بلاوکرایەوەو مەلا محمدی تورجانی وەك بەرێوەبەر دەست بەکاربووە.هەرچەندە ماموستا علا الدین سجادی دەلێ رۆژنامەی کورد لە 1921 لەورمێ دەرچووە بەلام ئەو بەروارە دروست نیەو کریمی حسامی بە سالی 1919ناودەبات ئەم بەروارەی ماموستا حسامی لە راستیەوە نزیکە. لەگەلێ ئەوەشدا زۆر لەنوسەران باسی گۆڤارێك دەکەن بەناوی کوردستان لەلایەن عبدالرزاق بەدرخان و سمکۆوە لەسالی1912دەرچووە.لەسالی 1914کاتی بەرپابونی جەنگی جیهانی یەکەم لەدەرچوون کەوت.

بەهەمان شێوە لەخوارووی کوردستانیش هەفتەنامەیەك هەبووە بەناوی بانگی کوردستان ئەم هەفتەنامەیە بەزمانی کوردی.تورکی—فارسی دەرئەچوو.هەفتەی جارێك.سەرنوسەرەکەی (حاجی مستەفا پاشا یامولکی) نوسەری بەشی کوردی بوو وبەشی فارسی( علی باپیر ئاغاو شێخ نوری شێخ صالح )بەشی تورکیش (ماموستا رەفیق حلمی) بووە زیاتر نوسینەکانیان دەربارەی چالاکیە رۆشنبیری و سیاسی و عەسکەرییەکانی ناوخۆ بەشی رۆژهەلات و باکور بووە.هەوالی ئەو سالانەش1922زیاتر سەرکەوتنەکانی سمکۆی شکاك و بلاوبونەوەی شکاندنی دوژمنان بووە وەك

ژمارە(5)ی رۆژی 4/ئەیلول 1922

لەسەر ناوی (سمکۆو عەجەم)نوسیویەتی.

(بینا لەئەخباری ئەستەمبولێ غەزەتەی ئەلرافدان نوسیوویەتی کەلەشکری سمکۆ داخلی تەوریز بووە.وەزارەتی تەهران لەخەوفا تەلەبی معاونەت و ئیمدادی لەفرقەی یازدەهەمی بولشەویك (روسیە)کردوە.

بۆ ئێمە چەند مەتلوبە دۆستی هەموو ئێران و عەجەمان کەخانەدانی موحتەرەم مونەوەرانی بەقیمەتی زۆرەو بۆ ئێمە ئەوەندی بەقیمەت و پێویستە)

لەژمارە6 رۆژی 8ئەیلول1922

لەژێر ناوی (دیسان سەردار نصرت)(سمکۆ)نوسیوویەتی:

(بینا به ئەخبارێکی تازه کەلەبانه وەرگیراوه جەنابی(سمکۆ)لەپاش ئەمه که مقەری خۆی یەعنی (چاری)تەرك و تەحەسونی بەمەوقعی مەنیعی شاخانی سۆماو لەشکرێکی عەجەمی بێشومار چاری ئەترافیان هەموو ئیستیلاو یەغماکرد سمکۆ چەند رۆژێ ئەم ئەحواڵەی سەیرو تەماشاو بەو وەسیلەوه عەجەمەکانی ئیغفال و تەداروکاتی خۆشی ئیکمال دەکرد لەپاش ئەم استحصارانه شەوێك بەسەر لەشکری عەجەم دا شەبەیخونێکی ماهیرانەی کرد بەریوایەتێکی مەوسوقه قەریب پێنج هەزار تەلەفیات و برینداری بەئۆردوی عەجەمدا و لەپاش ئەمەیش بۆ ئەتراف تەعمیمی نوسی کەحەسبه ئیسانیه هەرکەس و هەر عەشیرەتێکی کوردو بەقەدەری ئیمکانی خۆی بۆ کفن و دفنی ئەو عەجەمانه موعاوەنەتی نەقدیەی تەلەب کرد.لەسەر ئەم غالیبیەتەش دیسان جەنابی سمکۆ عەودەتێ بۆ چارێ موناسیب نەدیوه و لەگەڵ تەرتیباتێکی مەخسوسەی خۆی مەشغوڵه بزانین تا ئەم حەملەی دووەمه بۆ کوێ یه .والحاسڵ جەنابی سمکۆ دیسان غالیبه.ئێمه زاتەن تائێستا بەمەغلوبیەتی ئەو چونکه بەڕاستی باوەڕمان نەکرد بۆ هەر بەحسێ غالبیەتی ئەومان دەنوسی ئینشائەڵلا هیچ کوردێ لەسەر هەق مەغلوب نابێ و لەخودا تەمەننا دەکەین کە ئەم ئیختیلاف ومونازەعاته لەبەینی کوردانی یەعنی قەومی پەهلەوی و عەجەم دایه بەزووی موبدەلی خێر ببێ تا لەهەردوو تەرەف تەوعیەتی بەشەرو موسڵمانان ئیتر زەرەر دیده نەبن).چونکه کوردلەو سالآنەدا کەزۆربەی کێشەکانی جیهان لەو ناوچەیەدا کۆبووبۆوه واته خاڵی قورسایی گشت کێشەکان و جەنگی جیهانی یەکەم و دەرئەنجامەکانی لێرەدا مۆڵی خواردبوو .زەرەرمەندی یەکەم یاخود دۆڕاوی یەکەم لەم جەنگەدا کورد وەك نەتەوه بووه .ئەو نەتەوەیەی دوورو نزیك ئاگاداری شەڕو ئامانج لەو شەڕه نەبوو بەڵکو بەرژەوەندی وولآته زلهێزەکانی ئەو رۆژگاره بەپێی جوگرافیای ناوچەکه شەڕیان ئاڵاندە ناوچەی کوردەکان و ئەتوانین بڵێین کورد لەخۆیدا نەبوو شەڕیش بەردەرگای گرتبوو .ئەویش ناچار بەبەرگری کردن بوو.

*گۆڤاری بانگی کوردستان:لەباشوری کوردستان و لەشاری سلێمانی لەلایەن جەمعیەتی کوردستان دەرچووە.

.ناوچەکە قات و قڕی و برسیەتی زۆری بۆهێنابوو .شێخ لەتیفی شێخ مەحمود لەو ڕۆژگارەدا بەئاوارەی لەو ناوچەیەدابووەلەگەڵ خێزانەکەیدا بەچاوی خۆی بینیویەتی کە گۆشتی پشیلە بەناچاری دەخورا.لەو ڕۆژگارە سەختەدا بەزەحمەت ژیان بەڕێ دەکرا.سمکۆش لەگەمەیەکی سیاسی نێودەوڵەتیدا لەوە زیاتری پێ نەدەکرا هیچ دەوڵەتێك نەبوو کەپشتی بگرێ و کۆمەکی بکات ئەوەی هەبوو خەڵکی نەدارو نەخوێندەواری کوردبوو حاڵی پارچەکانی تری کوردستانیش باشتر نەبووە........

لەهاوینی ساڵی 1919دا سمکۆ بڕیاری دا بەگەشەپێدانی شۆڕش دەست بەسەر شاری ورمێ دا بگرێ لەیەکەم هێرشدا بەندەری (گوڵمانخانە)ی داگیرکرد کەتەنها ڕێگای پەیوەندی کردن بوو لەگەڵ(تەورێز)پاشان چەکدارەکانی نارده ناو شاری ورمێ و دوای گرتنی بنکەکانی حکومەت چەند سەربازێکی تیامابوو بەدیل گیران.حەسەن ئەرفەع دەڵێ:

هێزەکانی سمکۆ کە چوونە ناوشارەوە خەڵکی شارەکەیان بەتەواوی تالان کرد ئینجا هێرشیان هێنا بۆسەر شاری سەلماس و دوای دوو ڕۆژ لەشەڕی خوێناوی لەگەڵ خەڵکی ئەو شارە سەرئەنجام شاریان خستە دەست خۆیان خەڵکەکەش بەرەو ناوچەی (لەکستان)ڕایان کردو زۆربەیان لەڕێگادا کوژران*.حاکمی تەورێز تەواوی

* حەسەن ئەرفع:کوردەکان لاپەڕە19 وەرگێڕانی حامید گەوهەری چاپی یەکەم2007

شەرکەرەکانی لەژێر فەرمانی خۆی کۆکردەوە و ڕەوانەی شەرەفخانەو تاسوچ لەباکوری گۆمی ورمێی کردن سەروان(فیلیپۆف)فەرماندەی ئەو چەکدارانەبوو کەلەتارانەوە ناردبویانن بۆ ئەو ناوچەیە تا شەڕی کوردان بکات ناوبراو هێرشی کردە سەر کوردەکان و توانی ئەوان بەرەو چەهریق بکشێنێتەوە کەچی بەدبەختانە لەجیاتی ئەوەی کەسەرکەوتنەکەی درێژە پێ بدات و کاری سمکۆ یەك سەرە بکاتەوە کەچی.ڕێگای ووتوێژی لەگەڵ گرتە بەرو ڕێگای پێدا کەلەناوچەی چەهریق بمێنێتەوە بەومەرجەی‌دەست لەکوشتن و تاڵانکردنی خەڵکی ناوچەکانی دراوسێ هەڵبگرێت)

ئەگەر بەراوردی نوسینەکانی حەسەن ئەرفع بکەین بەهەمان شێوەو زمانی ئۆزدەمیر دەنوسێ و دەیەوێت هەرچۆنێك بێت شۆڕشی سمکۆ وا وێنا بکات کە جگە لەتاڵان و کوشتن و زیان هیچ ئامانجێکیان نەبووە خۆ ناکرێ سەروان (فیلیپۆف)کەیەکێك بووە لەجەنەڕاڵەکانی ڕووس و فەرماندەیەکی ناسراوی ڕۆژگارەکە بووە .لەگەڵ کۆمەڵێك چەتە کەوتبێتە گفتوگۆو دانوستان چونکە(فیلیپۆف) زۆر شارەزایەکی تەواوی کێشەی کوردبووە کەسێکی بێ ئاگانەبووە چونکە پێشتر لەولاتی ئەودا سمکۆو عبدالرزاق مەدالیای زێڕیان وەرگرتبوو لەگەڵ ئەوەشدالەجوانترین پێشوازیان دابوون.

ئەرفع لەنوسینەکەیداو دواتر دێتە سەر باسی گەڕانەوەی (فیلیپۆف)دوای سمکۆ هێزەکانی کۆکردەوە و هۆزی هەرکیش لەگەڵی کەوتن سەرلەنوێ ئەو جێگایانەی گرتەوەو هەڕەشەی گرتنی شاری(خۆی) دەکرد.

ئەو هێزەی لەوێ بوون زۆر بەخراپی شکابوون.لەمیاندوایش دا (400) کوژراو لەهێزی ئێرانی هەبووە.سمکۆ توانی هێزی بەرامبەر بشکێنێ و دوای ئەو سەرکەوتنانە سمکۆ لەگەڵ هۆزەکانی( مامەش–مەنگوڕ–دیبوکری–پیران–گەورك–زەرزا–فەیزوڵلابەگی–پشدەر–بانە–قادرخانی )لەگەڵ هێزەکانی خۆیدابوونە یەك وهەڕەشەی گرتنی میانداوو مهابادیان دەکرد ارفع لەبەشێکی نوسینەکەیدا دەڵێ دوای چوونم بۆ میانداو خۆشبەختانە توانیم نزیکەی 500کەس

لەهۆزی هەوشار کۆبکەمەوە بەگشتی هێزێکی 600کەسی کۆبکەمەوە بەوانە هێڵی ڕووباری (تەتەهور)بگرم لەسنوری نێوان ئازەرو کوردەکاندا 300سەربازی سوارەش لەشاری (خۆی) لەگەڵ ئێمە کەوتن پاشان یەکەیەکی 600کەسی ژاندارم کەبۆ یارمەتی ئێمە ئامادەکرابوو بچمە ناوچەی (هیراسا)مەبەست لەو کارە ئەوە بوو کەلەو جیٚ یە هێزێکی دوو هەزار کەسی لەهۆزی(قەرەچداغ)بەسەرۆکایەتی (امیر ئەرشەد)لەگەڵ ئێمە هاتن ئەو 2000کەسە لەسۆفیان و شەرەفخانەوە بەرەو سەلماس دەهاتن قەرەچداغیەکان بەچەك کردنی ئەرمەنەکان پرچەك کرابوون لەساڵی 1920دا لەناویاندا ئەفسەری ڕووسیش هەبوو کەلەئازەربایجانی ڕووسیاوە پەنایان هێنابوو بەڵام سمایل ئاغا(سمکۆ)زۆر بەلێزانانە لەهێرشی لەناکاو کتوپڕدا توانی پێش بەلەشکری قەرەچداغیەکان بگریٚ و پەلاماریان بدات و200کەسیان لیٚ بکوژیٚ کەیەکێك لەوانە (امیر ارشد)برای (محمدحسین ضرغام )ی بکوژیی جعفر اغای برای سمکۆ بوو ئەوانی تریش ڕایان کرد(62). سمایل اغا توانی ئەو هێرشەی بەرەو کاروانی ئێمە هێنا و ژاندارمەکانی تاران تەنانەت هەندێك بەربەرەکانیان کردو دوای ئەوەی خەریك بوو تەقەمەنیان لیٚ ببڕیٚ کشانەوە شاری(خۆی) کوردەکان وەك هەمیشە خۆیان لەڕاونانی ئێمە دەپاراست من هەوڵم دا بەهێرشێکی کتوپڕو لەناکاو بەیەکەکانی سوارە لەمانگی نۆڤەمبەردا دەست بەسەر گوندی کوردنشینی(ئەزدیکان)دا بگرم بەگرتنی ئەو گوندە دەمتوانی شەڕەکە بەرەو دەشتاییەکانی سەلماس بکێشم بەڵام یەکێك لەسەرۆکە تورکە ئازەری یەکان کەمن میوانی بووم و ئەبوایە لەو شەڕەدا چاودێری لەمن بکات شەو ئێمەی لەڕێگا بەجیٚ هێشت و چوو کوردەکانی لەپیلانی ئێمە ئاگاداركردەوە بەو جۆرە بەرلەوەی ئێمە دەست بەکاربین ئەوان ئێمەیان لەداوخست.شەو لەنیوە تێپەڕی بوو کەخۆمان لەگەمارۆی کوردەکانی (ئەزدیکان)و (کزستی)دا دیتەوە دوای شەڕێکی توندی شەش سەعاتە کەلەوەدا ئەسپەکەی منیش کوژرا بەناچاری بەپەنجا کوژراوو نۆ دیلەوە پاشەکشەمان کرد ئەو نۆ دیلەیان برد بۆلای سمکۆ ئەو داوای لیٚ کردبوون کەشێوەی بەکارهێنانی ئەو ڕەشاشەیان بۆ شی بکاتەوە کەلەئێمەیان گرتبوو یەکێك لەدیلەکان

کەمەئموری ئەو کارەبوو لەکاتی فێرکردن و چۆنیەتی بەکارهێنانی لولەی ڕەشاشەکەی کردبووە سمکۆ لەو کاتەدا لەچاوتروکانێکا سمکۆ خۆی دەگەیەنێتە سەری بەتوندی دەستی دەگرێ پێی دەڵێ بەسە ئیتر فێربووم چۆن بەکاردێ.ئازایەتی ئەو دیلە زۆر سمکۆ دڵخۆش دەکات بەو بۆنەیەوە هەر دیلەو لیرەیەکی زێری دەداتێ و ئازادیان دەکات .دوای ئەو ڕووداوە تەواوی کاروانەکە پرچەك کرایەوە لەگەڵ 100سوارە لەهۆزی تورکی(ئەرسەلان لو)ی ماکۆ بەسەرۆکایەتی سەرۆك(بەیات)ی ماکۆ لەبەرزاییەکانی قەرەتەپە پەلاماری کوردەکانیان دا و کاروانەکە زۆر ئازایانە شەڕیان کرد لەو پێکهەڵچونەدا(60)کەسی لێ کوژرا بەلآم 600کەس ژاندارم لەبەرامبەر هێزێکی 3000کەسی سمکۆ بۆباس ولێدوان نەدەبوو عەشایەری ماکۆش کەلەباسکی ڕاستی ئێمەوە شەڕیان دەکرد گۆڕەپانی شەڕەکەیان بەجێهێشت چونکە مەترسی ئەوە هەبوو کەبکەوینە گەمارۆوە ڕێگای (خۆی)مان لێ ببەسترێ بەگوێرەی فەرمان پاشەکشەمان کرد

.ڕۆژی دوای تەواوی کاروانەکە شاری(خۆی)چۆڵ کرد بەرەو شەرەفخانە بەڕێ کەوت بەلآم کوردەکان نەك بەشوێن ئێمە نەکەوتن بەڵکو لەهێرش کردن بۆ سەر شاری(خۆی) خۆیان پاراست.

تێکشکاندنی هێزی ئێران و درێژە کێشانی ڕووداوەکانی ئازربایجان پەژارەیەکی زۆری لای تاران دروست کردبوو ڕەزاخان پێویستی بە دەسکەوت و سەرکەوتن هەبوو بۆخۆی سەرتیب شەیبانی کەسەرکەوتوو نەبوو لەکارە جەنگیەکانی دژی سمکۆ کێشرایەوە بۆ تاران سەرتیپ ئامان الله میرزای جیهانبانی سەرۆکی ستاوی ئەرتەش خۆی چووە ئازربایجان بوو بەفەرماندەی گشتی هێزەکانی ئازربایجان دکتۆر (مصدق )لەو ڕۆژانەدا والی تەورێزبوو .دەستی لەکار هەڵگرت وەزارەتی کیشوەر کەسی تری لەجێگای ئەو دانەنا بەمجۆرە دەسەلآتی کیشوەری و لەشکری پێ سپێردرا.کەوتە کۆکردنەوەو سازدانی هێزەکانی ئێران و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر سمکۆ و داڕشتنی پیلانی پەلاماردان(63). کەواتە ئەم هێزکۆکردنەوەیەو لادانی فەرماندە سەربازی

یەکانی ئێران و تێك شکاندیان لەبەرامبەر سمکۆدا ئەمە ڕاستی و دروستی ئەو وەڵامەیە بۆ حسن ارفع کە دەڵێ تاڵانچی و زۆری هێرشەکان بۆ تاڵان بووە.هێزێکی تاڵانچی بتوانێ ئەو سەرکەوتنانە یەك بەدوای یەکدا تۆماربکات لەشکری ئێرانی شپرزە بکات کەواتە هێزێکی مەعنەوی لەپشتی سمکۆو لەشکرەکەیەوە هەیە بێ گومان هەستی نیشتیمانی و دڵسۆزی بۆ خاکەکەی والەخەڵکی کورد دەکا پەلاماری لەشکری زەبەلاحی دوژمن بدات تا نیشتیمان ئازادبێت دەنا سمکۆ هیچ کەس و عەشیرەتێکی بەزۆر نەخستبوە ریزی لەشکرەکەیەوە خۆ خەزنەیەکی وای لەبەردەستدا نەبوە تابەپارە ڕازیان بکات.......

سمکۆ خەریك بوو ئەو بۆشاییانە پڕبکاتەوە کەبەڕۆشتنی ڕووسەکان و تورکەکان و ئاسوریەکان بەدی هاتبوو بۆ بەدەست هێنانی ئەو مافە لەگەڵ ڕۆشتنی هەر ڕۆژێکدا سمکۆ بیری لەدروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی دەکردەوە بەسەرۆکایەتی خۆی و تێ دەکۆشا تابتوانێ دەسەڵاتی تەواوی بەسەر ناوچەکانی دراوسێ دا بڵاو بکاتەوە کەژمارەیەکی کەمیان ئازەری بوون(64).بۆئەمەش وورده وورده لەکاربەدەستانی ئینگلیز لەعێراق نزیك بوەوە بەو هیوایەی کەیارمەتی بدەن و ئەوەی ئەیەوێت بۆی جێ بەجێ بکەن هەروەها بەپێی قسەی سەرچاوە ئەرمەنیەکانیش سمکۆو سەید تەها پەیوەندیان بەتورکە قەومیەکانەوە کردووە.چونکە تورکەکان لەو کاتەدا هەوڵی ئەوەیان ئەدا ئەرمەنیەکان بگەڕێنەوە بۆ ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات بەرامبەر بەوە پەیمانیان داوە بەسمکۆ یارمەتی بدەن(65). بەڵام لای ئێمە شێوەی ئەم ڕێکەوتنەو ئەو پەیوەندی کردنە روون نی یە .تەنیا ئەو ئامازەیە نەبێت کەلەیەکێك لەنوسراوەکانی مستەفا پاشادا دەردەکەوێت دەڵێت : سمکۆ پیاوێکی نەزانەو لەگەڵ ناسیۆنالستەکانی تورك پەیوەندی خۆشە(66). بەڵام پیاوانی ئینگلیز لەدەمی سمکۆوە ئەو پەیوەندی یە بەدرۆ دەخەنەوە لەم کاتەشدا بوو کوردەکان بەتەواوی لەسمکۆ نزیك بوونەوە و یارمەتیان دەدا ئامانجی هەموو لایەك سەربەخۆیی کوردستان بوو .گەورەیی و دەسەڵاتی سمکۆ لەو کاتەدا (گوردن یادۆکی) کونسوڵی ئەمەریکی لەتەوریز خستە سەر ئەو باوەڕەی بکەوێتە

وتووێژکردن لەگەڵیا کە نزیکەی پێنج هەزار دۆلاری زیوی بداتێ ئەویش لەبەرامبەر ئەوەدا ماڵ و دراوی ڕاسپاردە ئەمەریکیەکان لەورمێ تالان نەکات.

هەرچەندە سمکۆ سەرقاڵی بەرنامەی پەلهاویشتن بوو بۆ ئەوەی بتوانێ ڕای تێکڕای گەلەکەی بەدەست بهێنێ خوازیاری دروست کردنی دەوڵەت و سەربەخۆیی کوردستانی هەبوو بەڵام زۆر گوێ ی بەحکومەتی ئێرانی نەئەداو دەڵێن لەهەولی دروست کردنی پارتێکی سیاسی دابووە تابتوانێ ڕابەرایەتی جەماوەری کوردستان بکات بەڵام کورتی تەمەنی و کەم تەجروبەیی وای کرد دوای شەهید بوونی خۆی پارتەکەشی بوونی نەماو ئەو پارتەی کە ئەو پێکی هێنا بەناوی (ژیانی کورد)(67)بوو لەڕاستیدا هەموو ئەمانە کارێکی دووسەرەی ئینگلیزەکان بوو چونکە کاریان نەدەکرد بۆسەربەخۆیی و ڕزگاری کوردستانی ڕۆژهەلات بەڵکو بۆ بەکارهێنانی کوردەکان بوو بۆ دەرکردنی تورکەکان و بەکرێگیراوەکانی ئەڵمان و تورکەکان لەئێران سەپاندنی سەرپەرشتیاری بەریتانیا بەسەر هەموو ئێران داو پاشان بەکوردستانیش دا بۆیە ئینگلیزەکان هەموو هەوڵەکانیان بەکارهێنا بۆ فشار خستنە سەر ئێران تابگەن بەئامانجەکانیان لەکۆتایی جەنگدا هەرچەندە فەڕەنساو ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کەلەکۆتایی شەڕدا هاتبوونە ناوچەکە بەبیانوی ئەوەی ڕۆڵی پێشەوایەتی دەگێڕێت لەپرس و کێشە جیهانیەکاندا لەوانەش پرس و کێشەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەڵام بەتەنها ئینگلیزەکان خاوەنی هێزێکی سەربازی کاریگەر بوون لەناوچەکەدا و هەر ئەوان خاوەنی قسەی کۆتایی بوون(68).

# (کوشتنی خاڵۆ قوربان)

ئێرانیەکان لەهەوڵی هێزکۆکردنەوەدابوون بە فەرمانەدەی سەرتیب حبیب اللە شەیبانی سەرپەرشتیاری گشتی عەمەلیاتی ئێرانی و سەرلەشکری شمالغرب ئیسماعیل ئاغای ئەمیر فەضلی لەگەڵ چوار هەزار چریکی کورد بەسەرکردایەتی خاڵۆ قوربان و هەندێ قۆزاخ لەمیاندواو کۆکرانەوە خاڵۆ قوربان کوردی کرماشان بوو یەکێکە لەهاوکارە نزیکەکانی میرزا کوجك سەرکردەی شۆڕشی جەنگەڵی.خاڵۆ قوربان وەزیری ئەو حکومەتەی جەنگەڵ بوو دوای خۆبەدەستەوەدانی هێزێکی عەشایەری پێك هێناو شانبەشانی ژاندارم و قۆزاخی ئێران بەشداری ئەکرد لەسەرکوت کردنی جولانەوەکانی دژی دەوڵەت دا.

هێزەکانی تەورێز لەبەندەری (کەمارلۆ).سوارەکانی مظفرالدولە لە(خۆی).هێزەکانی چریك لەمیاندواو مۆڵ درابوون.هێزی خاڵۆ قوربان دەبوایە خەتی نێوان موکریان و ورمێ بگرێ بۆئەوەی هێزەکانی کورد لەیەك

دابرێ.ئەم سێ هێزە دەبوایە هەریەکەیان لەقوڵی خۆیەوە بەرەو پێشەوە هێرش بەرن.بەرەو بارەگای سمکۆ.لەوکاتەدا سەرهەنگی ژاندارم لاهوتی لەتەورێز یاخی بوو لاهوتی کوردی کرمانشان بوو سەردەمێك حوکمی ئیعدامی هەبوو لەسەر ئەوە هەڵهاتبوو بۆئەستەمبوڵ ماوەیەك لەوێ تێکەڵاوی ئازادیخوازانی کوردو تورك بوبوو.پاشان حکومەتی ئێرانی لێی خۆش بوو.بەپلەی سەرهەنگ گەڕایەوە ناو ژاندارمی ئێران یەکەم هەلی بۆ هەڵکەوت دەستی گرت بەسەر تەورێزدا نیازی سەر(تاران)یشی هەبوو.بۆیە شەیبانی بۆ سەرکوتکردنی (لاهوتی) هەندێك لەهێزەکانی گەڕاندەوە بۆ سەر تەورێزو.جولانەوەکەی (لاهوتی) زۆر زوو سەرکوت کراو لەم کاتەدا هێزەکانی کورد پەلاماری خاڵۆ قوربان یان داو لەبەرزاییەکانی (ئینەدەر قاش)لای بۆکان بوبەشەڕ سەرکردەی چریك خاڵۆ قوربان کوژراو بەکوژرانی سەرکردەکەیان هێزەکە تەواو

ورەیـان بـەرداو ڕیزەکـەیان لەبەریـەك هەڵوەشـاو بڵاوەیـان لێ کرد.سـەرهەنگ کیکاوسـی و سەرهەنگ شەهاب بەهادور السلطنه و ئەفسەرەکانی تر لەگەڵ خالۆ قوربان بـوون نـەیان تـوانی هێزەکە ڕێك بخەنەوە ئەوانیش خۆیان و قازاخەکانیان دەربازکرد.نەوشیروان مستەفا لـەکوردو عەجەمدا لەزمانی ڕۆژنامەکەی سمکۆوە (ڕۆژنامەی کـورد)ی زمانحـاڵی بزوتنەوەکـەوە بـەزمانی فارسـی ڕێپۆرتـاژێکی لەسـەر ئـەم شـەڕە نوسـی وە ئاغـای تمـدن لەکتێبەکەیـدا وەکـو خـۆی ڕایگوێزاوە تاوەکوبیکاتە بەڵگەیەکی مێژوویی کە ئەمە کوردی یەکەیەتی.

هەواڵنێری ئێمە ئەنوسیٚ(کوژرانی خالۆ قوربان و شکاندنی ئۆردوەکەی بۆ ئاگاداری خوێنـەرانی بەڕێز ڕوون دەکەمەوە .ڕۆژی 28ی ڕەمەزانی 1340ی قەمەری لەکاتێکدا ئۆردوی کورد لـەژێر فەرمانی سەید تەها ئەفەندی دا لەدەوروبـەری گونـدی قزلـوی خـاکی ئەفشـار پـەلاماری سـاێن قەڵای دابوو هەواڵی هێرشی خالۆ قوربان

لەمیانداوەوە بۆ شارویٚران و سابڵاخ لەلایەن دوو سواری ئاغای سـەرداری مـوکری یـەوە هـات و دەس بەجێ ڕووی کردە سابڵاخ شەوی 29ی ڕەمەزان لەبۆکان مایەوە سبەی بەیانیەکـەی زوو جوڵاو دووسەعات مابوو بۆ ڕۆژئاوا لەنزیك گوندی (دەرمان)سەرانی عەشـایەرلەگەڵ سـەید تـەها ئەفەندی بۆ گفتوگۆو ڕاوێژ کۆبونەوەو پیلانی پەلاماردانی ئۆردوەکەی خالۆ قوربانیان بـەمجۆرە دانا.

جیهانگریەگ لەئیلی هەرکی–ئەسکەندەرخانی برادۆستی–حمزە ئاغا مامـەش–ئـەمیر ئەسعەد دیبوکری و سالار سەعید لەخەتی لاچین لەکاتی ئاوابونی خۆردا لەهەرسیٚ لاوە لـەکاتی دیاری کراودا دەست دەکەن بەهێرش و دەست ڕێژ ئەمیر عشائر و ئەمیر ئەسعەد و سالار سەعید سـەر لەبـەیانی 29ڕەمـەزان لەبەرزاییـەکانی کێـوی زاواوبووکـەوە هـەڵیان کوتایـە سـەر تاقمـێ لـەهێزەکانی خالۆقوربـان کەلەسـەر گـردی( دوشـان مەجیـد) لەسـەنگەردا خۆیـان بـۆ شەڕئامادەکردبوو لەهەردوو لاوە بوو بەشەڕ سوارانی کـورد نـەیان هێشـت شـەڕ درێـژە بکێشـێ ڕژانـە ناوسـەنگەرەکانی عەجەمەکانـەوە ئەوانـەیان بەلوولـەی تفـەنگ دەرکـردو ڕاویـان نـان

هەندێکیان دیل و هەندێکیان کوژران هەندێکیشیان ڕایان کرد بۆ گوندی (ئەگریقاش)بۆلای خالۆ قوربان سوارەکانی ئەمیر عەشائر حاجی (سطوة السلطنه) ی حوکمڕانی سابلاخیان بەدیل گرت و سوارەکانی ئەمیر ئەسعدیش یەك مەترەلۆزیان دەسکەوت بوو ئەسپ و تفەنگێکی زۆر لەکاتی هێرشەکەداگیرا. لەو کاتەدا سوارەکانی ئاغایانی مەنگور و هەرکی و زەرزا شالآویان بۆ بردن لەپێکدادانێکدا خالۆ قوربان و هەندێك لەپایەدارەکان و خەڵکی تر کوژران بەگێڕانەوەیەك دەڵێن سوارەی ئەحمەد گولاوی ئاغای مەنگوڕ و بەگێڕانەوەیەکی تر ئەحمەد خانی هەرکی کوشتویانە کۆلۆنێل نەسروالله فەرماندەی ژاندارم لەساین قەلاوە بەرەو موکری بەڕێ کەوت بەتەواوی لەو ڕووداوە بێ خەبەر بوو بۆئەوەی لەگەڵ خالۆ قوربان یەکبگرنەوە بەفیزەوە بۆلای بۆکان دەهات امیر ئەسعەد کەئەو خەبەرەی بیست زۆر بەپەلە خۆی گەیاندە (ئەمیر ئابادی )تەنیشت بۆکان کۆلۆنێل کە ئەگاتە بۆکان خەبەری کوژرانی خالۆ قوربان و شکان و بلاوبونەوەی لەشکرەکە ئەزانێ بۆی دەرئەچێ بۆ( ساین قەلا ) و ئەگەڕێتەوە.سوارەی بەگزادەو سوارەی سەرداری موکری دوایان دەکەون ئەمیر ئەسعەدو ئاغاکانی دیکەی دیبوکری بەزەحمەت خۆئەگەیەننە یارمەتی سوارانی بەگزادەو موکری .ئۆردوی ژاندارم لەکێوی پشت گوندی (ئالبلاغ) گەمارۆ دەدەن زۆریان ئەکوژن و بەدیل ئەگیرێن دەسکەوتیش زۆربووە.

لەو پەلامارەدا سولتان عبدالحمیدخان ئەفسەری ژاندارم کوژراوە کۆلۆنێل لەگەڵ پاشماوەی لەشکرەکەی شەوانە لەکێو دێتە خوارێ بەلاڕێ دا هەڵدێ ئاغایانی بەگزادەی فەیزوللا بەگی تۆپێکی گەورەیان گرت و

ناردیان بۆ چەهریق* دوای ئەم هەموو تێکشکاندنە هێشتا ئێرانیەکان لەداڕشتنی پلانی دوژمنکارانەدا بوون بۆ سمکۆ .تابتوانن بەهەرچی شێوەیەك بێت سمکۆ بکوژن و کۆتایی

---

* بڕوانە محمد تمدن ومزعی ئێران لەشەڕی جیهانی یەکەمدا لاپەڕە3-6.

*ئەحمەدی شەریفی ص34-35هەروەها احمد کاویان پور .کمال نوری معروف لاپەڕە137-138.

بەبزوتنەوەکە بهێنن بۆ ئەم مەبەستە محمد حسن میرزای نائیبی حاکمی تەوریز کە بە(موکەرەم الملوك) ناسرابو لە23ی شەعبانی 1337کۆچی/1920زایینی پەنجاو چوار هەزار تومان ئەدا بە کۆمیتەیەکی ئەرمەنی کەپیلانێك بدۆزنەوە بۆ ئەوەی بتوانن بەهەر شێوەیەك بێت سمکۆ لەناوبەرن پیلانگێرەکان سندوقێکی شیرینیان ئامادەکرد.بۆمبێکیان خستە ناوی بەناوی دیاری یەوە بینێرن بۆسمکۆ کەلەو کاتەدا لەگوندی کانیانی نزیك سەلماس دەبێت و لەوێ دەگاتە دەستی سمکۆ لەبەرئەوەی کابرایەکی وریابوو توانیویە لەبەلا زوو خۆی رزگاربکات سمکۆ دەلێت کاتێك سندوقە شیرینیەکەیان بۆ هێنام لەباخێکدا لەژێر درەختێکدا لەگەلّ ژنەکەم و کورەکەم دانیشتبووین و ئەمانویست بەخۆشی رابوێرین کورەکەم هاتە پێشەوە و بەوردی سەیرم کرد روناکی یەکم لەناویابەدی کردبێ ئەوەی ماوە بەخۆم بدەم سندوقەکەم فرێ داو چەند مەترێك لەخۆم دورخستەوە یەکسەر تەقییەوە ئێمەش هەرئەوەندەمان پێ کرا خۆمان لەشوێنێکدا مەلاس بدەین بۆئەوەی زیانمان پێنەگات لەئەنجامدا هەرچەندە سمکۆ زیانی پێ نەگەیشت بەلام بووە هۆی ئەوەی چەند کەسێك لەخزمەکانی کەلەنزیکەوە بوون برینداربن و ژمارەیەکیش بکوژرێ کە لەناویاندا علی ئاغای برای تێدابوو.

سمکۆ لەم کردەوەیەی حکومەتی ئێران زۆر دلگران بوو بۆیە بریاری دا بەهیچ جۆرێ گوێ بەقسەیان نەداو ناچاریش بوو نامە بۆسەرۆك عەشیرەتەکانی کورد بنووسێ و گوێچکەیان پربکات و پێیان رابگەیەنێ کە حکومەتی ئێران بەچاوێکی دوژمنکارانە سەیری گەلی کورد دەکات.

بەوهۆیەوەنامەیەکی نارد بۆ (موکەرەم المولك)داوای لێ کرد شازادەی قاجاری(ثقة السلطان)لەگەلّ دوو کەسی دی کەناوی (میر هیدایەت و سەرهەنگ علی محمد خان) بەبەندکراوی بنێرن بۆ(خۆی)بۆئەوەی تەمێ یان بکات(موکەرەمول ملوك)هەرسێ کەسەکەی بەدەست بەستراوی لەگەلّ 13سوارە نارد بۆ شاری چارێ لەرێگا میر هیدایەت لەدەست سوارەکان هەلّدێ بەلام شازادەو علی موحەممەد خان ئەگەیەننە چارێ دوای لێدانێکی زۆر

بەدەم ئازاروئەشکەنجەوە دەمرن پاسەوانە سوارەکان دوای ئەوەی کارەکانیان تەواو دەبێ داوا لەسمکۆ دەکەن ڕووخسەتیان بداو بگەڕێنەوە سمکۆ لێیان ئەپرسێ ئێوە لەکام تیرەن؟ لەوەلأمدا ئەڵێن (قەرەباغین)بەفەرمانی سمکۆ هەر سیانزە سوارەکەش دەکوژرێن تۆڵەی خوێنی جەعفەر

ئاغای برای دەکاتەوە کەبەدەستی ئەوان و (نظام السلطنە )ی قەرەباغی کوژرابوو.

# کۆنگرەی ئاشتی لەپاریس

بـارودۆخی دوای شـەڕی جیهـانی یەکـەم کـارێکی وای کردبـوو کـە ئەورووپیـەکان بەتایبـەتی بەشداربوانی شەڕی جیهانی بیر لە کۆنگرەیەکی ئاشتی بکەنەوە لەپاریسی پایتەختی فەرەنسا مەبەستی کۆنگرەش تەنها ڕزگارکردنی گەلانی ژێر دەسـەڵاتی دەوڵـەتی عوسمـانی بوو.بۆئـەم مەبەستە گشت لایەنەکانی کوردستان خۆیان سازدا کەهەرچۆنێك بێت دەنگی خۆیـان بگەیەننـە کۆنگرەو جەنەراڵ شەریف پاشای خەندانی کۆنە سەفیری دەوڵەتی عوسمانی لەسوید (بەرەگەز کـورد) خـۆی واناسـاند کەنوێنـەری گـەلی کوردسـتانەو شـێخ مـەحموودی حـوکمڕانی سلێمانی پشتگیری کرد بەو مەزبەتەیەی کەبەناوی خـەڵکی کوردسـتانەوە ڕەوانـە کـرا بـەڵام نەگەیشـتە پاریس نوێنەرەکانی شێخ لە(حەڵەب)ڕێگەیان لێ گیرا گەڕانەوە بۆ عێراق لەوەوبەر بەدرێژی ئـەو باسەمان کرد.کوردەکانی ڕۆژهەڵاتیش هـەموو ئامادەییـەکیان تیـابوو چـاوەڕوان بـوون بـۆ ئـەو هەلە کە بتوانن دەنگی کورد بەدنیابگەیەنن.بەتایبەتی سمکۆ بـەڵێنی وەرگرتبـوو کەهەرچـۆنێك بێت خۆی لەئاژاوە بپارێزێ تا کارەکـانی بەباشـی بەڕێوەبچـێ هـیچ کۆسـپێك دروسـت نـەبێ.تا ببێتــە بەڵگــە کەخواســتی کــورد لەئاشــتیدا نــی یــە.دژی کــورد بــەکاری بهێنن.تورکــەکان لەپارێزدابوون لەلایەکی ترەوە.لەهەوڵی نزیك بوونەوەدا بوون تابتوانن بەبرایەتی یەکی ڕووکەش کورد بەلارێدابەرن و لەمەبەستە سەرەکیەکە دووریان بخەنەوە..........

مامۆستا ڕەفیـق حلمـی لەیادەشـتەکانیدا(69) دەڵـێ: کوردەکـانی تورکیـا بەتایبـەتی کۆمەڵـە سیاسـیەکانی ئەسـتەمبوڵ کەوتبوونـە تێکۆشـانێکی بـێ ووچـان و تەقەللایـەکی بـەتین لەگـەڵ کۆتایی هاتنی شەڕو دەرچـوونی گـەورەکانی کۆمەڵـەی (یـەکێتی و سەرکەوتن)لەئەسـتەمبوڵ و ڕاکردنیان بۆ دەرەوەی خاکی (عوسمانی)ئەم کۆمەڵانە بەئاشکراو بـەبێ تـرس هاتنـە مەیـدان و بەڕەسمی داوای حقووقی کوردیان خستە پێشەوە .(ویلسن)ی سەرۆکی ئەمـەریکا لـەو ڕۆژانـەدا

(14)بەندەکەی خۆی بلاوکردبوەوە کەبەپێی ئەم دەستورو بەلگەیە هەموو قەومێك مافی داواکردنی سەربەخۆیی پێدرابوو لەبەرئەمە سیاسیە گەورەکانی کوردیش پالیان دابوو بە (دەستوورەکەی ویلسن)ەوە داوای سەربەخۆیی کوردستان و ئازادی قەومی کوردیان ئەکرد بۆ ئەم داوایە زۆر تێکۆشان لەلای ولاتە سوێندخۆرەکان گەلێ تەقەلایان دا حکومەتی ئەو ڕۆژەی ئەستەمبولێ کەوتبووە وێستاوێکی گرنگەوە ئەنجامێکی سامناکی لەپێشەوەبوو.لەوە ئەترسا کە (کوردستان)و(ئەرمەنستان)ی لێ جیابێتەوە و هیچی بەدەستەوە نەمێنێ ئاگاداری ئەوە بوو کەکۆمەلەکانی سیاسی کورد پەرەی سەندووەو لە زۆربەی ویلایەتەکانی خۆرئاوا و شارە گەورەکانی کورد بلاوبۆتەوە بۆیە ویستی بەهێمنی لەگەلێ کوردەکاندا بجولێتەوەو هەرلەوسەردەمەدا(کلیمانسۆ)ی سەرۆکی فەڕەنسا وتارێکی بلاوکردەوە ئەمەش بەجارێ تورکەکانی پەشۆکاندو بناغەی دەولەتی هێنایە لەرزە لەم وتارەدا (کلیمانسۆ)بەناوی دەولەتە سوێندخۆرەکانی ئەورووپاوە ئەیوت حکومەتی تورك و(دەولەتی عوسمانی)ئەوەی لەبارنی یە کەبتوانێ میللەتێك بەڕێوەبەرێت لەبەرئەوە متمانەی پێ ناکرێ و نابێ قەومێك کە تورك نەبێت و تائەمڕۆ لەژێر چەپۆکی ی تورك و ستەمی تورکا ژیاوە دووبارە بخرێتەوە ژێر حوکمی لەبەر ئەمە حکومەتی تورکیا کەوتە ترسێکی گەورەوە ویستی لەکوردەکان نزیك بێتەوە هەولیان دا ئەم دەرفەتە لەدەست کورد بدەن و دوای قسەکانی(ویلسن) نەکەون.بۆ ئەم مەبەستە چەند لیژنەیەکی وەزاری یان پێك هێنا بوو بۆ بەدوادا چوون و لێکۆلینەوە لەو خالآنەی کەکورد داوای ئەکات ئیدارەیەکی هاوبەش کەکورد پێی ڕازی بێت بەو مەرجەی کورد لەچوارچێوەی حکومەتی تورکیا بمێنێتەوە وەك دوو گەلی موسلمان و برا پێکەوە کاربکەن بۆ پاراستنی خاکی تورکیا بەپێی موسلمان بوونی کورد.ئەبێ ئەرکی پاراستنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی لەئەستۆدابێت و لە لایەکی ترەوە تورکەکان کاریان دەکرد کە کورد لەکۆنگرەی ئاشتی مایەپوچ دەرچێ بۆیە ئەوەی توانیان کردیان و درێغیان نەکرد ناردنی(حەسەن خەیری)بەرەچەلەك کوردو بەجل و بەرگی کوردی یەوە بەرەو پاریس بەپشتگیری هەندێك لەنۆکەرە کوردەکان تالەناوکۆنگرەی

ئاشتیدا ووتارێك بدات وابەستەبوونی کورد بەتورکەوە ڕابگەیەنێ و واش نیشان بدات کەشەریف پاشای کوڕی سەعید پاشای سلێمانی کە ئەو ڕۆژگارە ناوێکی دیاربوو لای ئەورووپیەکان وا نیشانی بدا کە نوێنەری هەموو کورد نی یە.لەلایەکی ترەوە هەموو کۆمەڵە کوردییەکان متمانەی خۆیان دابوە شەریف پاشا.کەبریتی بوون لەم کۆمەلآنە (کۆمەڵی تەعالی کوردستان)و (کۆمەڵەی تەشکیلاتی اجتماعیە)و(کۆمەڵەی ئیستیقلالی کوردستان).
شەریف پاشا یاداشتێکی پێشکەشی کۆنگرەی ئاشتی کرد. هەوڵەکانی شەریف پاشا زوو جێگای خۆی گرت و سێ بەندی یاداشتەکەی کە دەربارەی سەربەخۆیی کوردستان بوو خرایە پەیمانی سیڤەرەوە نوێنەرانی دەوڵەتی عوسمانی و فەرید پاشا واژۆیان کرد.پاشانیش شەریف پاشا نەخشەی کوردستانی دیاری کردو پێشکەشی کرد بەکۆنگرەی ئاشتی و هەروەها هەستا بەسازدانی ڕێکەوتن لەگەڵ شاندی ئەرمەنیەکانی (طاشناق)ئەوەبوو بەیاننامەیەکیان دەرکرد لەکۆنگرەدا لەبەرواری 20ی کانوونی یەکەمی 1919 چۆن چاوەڕوان دەکرا وابوو ولآتە هاوپەیمانەکان پێشنیارەکانی تورکەکانیان وەرنەگرت کەدژ بەمەرجەکانی ئەوان بوو چونکە بەپێی ڕێکەوتنی (سان ڕیمۆ)لەنیسانی 1920کە خستیانە بەردەم تورکەکان لەبەرامبەردا تورکیا هەوڵی دا هەندێك لەمەرجەکانی سوك بکات لەسەرخۆی.چونکە هاوپەیمانان مامەڵەی دۆڕاویان لەگەڵ تورکدا دەکرد پاشان وولآتە هاوپەیمانەکان پێشنیاریان کرد بەدەرهێنانی کوردستان و ئەرمینیای خۆرئاوا لەژێر ڕکێفی تورکیاو پەرەیان پێ بدرێت تا لەداهاتوودا سەربەخۆیی نیشتیمانی بەدەست بهێنن ئەمە کورد نەیکرد ئینگلیز پێی هەستا کەتەنیا لەبەر بەرژەوەندی یەکانی خۆی بوو لەم لایەنەوە گرنگی درا بەکورد لەکاتی ئامادەکاری یەکان بۆ پەیمانی(سیڤەر) یاسای (فرسای)بۆ چاکسازی دوای شەڕ کۆتایی هات بەهاتنی پەیمانی سیڤەری ئاشتی کەواژۆی لەسەر کرا لەبەرواری 10ی ئابی 1920لەشاری سیڤەر لەنزیك پاریسی پایتەخت لەنێوان حکومەتی دەسەلآتداری تورکی و وولآتە هاوپەیمانە سەرکەوتووەکانی جەنگی جیهانی یەکەم هەروەها پەیمانی (سیڤەر)لەسەر بنەمای مەرجەکانی

(سایکس بیکۆ)و بڕیاری کۆنگرەی (سان ڕیمۆ)دانرا پەیمانی سیڤەر بەڵێننامەیەکی گەورە بوو لەڕووی قەبارەوە کەلە13بەش و 433مادە پێك هاتبوو بەپێی مەرجەکانی ئەم پەیماننامەیە تورکیا هەموو ئەو خاك و زەوی و زارانەی لەدەست دەدا کەلەدەرەوەی سنوری تورکیا بوون .بەم شێوەیە خاکی فەلەستین و عێراق کەوتە ژێر دەسەلاتی ئینتیدابی بەریتانی.سوریاو لوبنان بون بەموڵکی فەڕەنسا بەم پێ یە پەیماننامەکە ڕژێمە گەورەکانی دانا لەژێر چاودێری لیژنەیەکی نێودەوڵەتی و تورکەکانیش دانیان نا بە ئەرمینیا وەك وڵاتێکی سەربەخۆو ئازاد.

# (پەیمانی سیڤەر و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی)

پەیمانی سیڤەر لە10ی ئابی 1920دا مەرجەکانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆکورد و ئەرمەنەکانی دیاری کرد لەسێ بەندا .بەندی 62-63-64.

لەبەندی 62دا هاتووە.دەوڵەتانی ئینگلتەراو فەرەنساو ئیتالیا لەماوەی شەش مانگ لەبەگەڕخستنی ئەم پەیمانەوە نوێنەرانی خۆیان بۆ لیژنەیەکی سێ قۆڵی دیاری دەکەن کە بارەگاکەیان لە (ئەستەمبوڵ)دەبێت تارێگا بۆ مافی بەڕێوبەرێتی خۆیی ئەو ناوچانە خۆشکەن کەڕەگەزی کوردی تێدا زۆربەن کەڕۆژهەلاتی فوڕات و خوارووی سنووری ئەرمینیا و ژووروی سنووری نێوان تورکیاو سوریاو میسۆپۆتامیا دەگرێتەوە.بەمەرجێ ئەمە لەگەڵ بەندی 27ی پەیوەندیدار بەسنوری نێودەوڵەتانەوە هاوئاهەنگ بێت.لەحاڵەتێکدا گەر هەمووان لەسەر ئەم کێشەیە ڕێکەوتن ئەوا نوێنەرانی وولاتانی خۆیان ئاگادارئەکەنەوە.

لەبەندی63هاتووە دەوڵەتی عوسمانی بەرپرسیارە لەماوەی سێ مانگ پاش ئاگادارکردنەوەی بڕیارەکانی لیژنەی بەندی 62پەسەند بکات و بەگەڕی بخات.

لەبەندی64:ئەگەر لەماوەی ساڵێك دوای بەگەڕخستنی ئەم پەیمانەوە دانیشتوانە کوردەکانی ئەو ناوچانەی

لەبەندی62دا دیاری کران(کۆمەڵەی گەلان)یان ئاگادارکردەوە بەئیسپاتیان گەیاند کەزۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە داوای جیابوونەوە لەتورکیادەکەن.کۆمەڵەش پێی وابوو کە دانیشتوان توانای ئەوەیان هەیە سەربەخۆ خۆبەڕێوەبەرن ئەوا دەبێت ڕێگەیان بدرێت.دەوڵەتی تورکیاش دەستەبەر دەبێت ئەو داوایە پەسەندبکات و لەو ناوچانە دەستبەرداری هەموو هەق و مافێکی دەبێت.

ئەمە پوختەی ئەو بەندانەیە کەپەیوەستە بەگەلی کوردەوە بۆیە بەباشم زانی کەهەر سێ بەندی پەیمانی سیڤەر بخە مەڕوو تاخوێنەرانی ئازیز زیاتر ئاشنابن بەپەیماننامەکە ئەوەی کەهەر بیستراوەو وتراوە تەنها چاکی پەیمانی سیڤەرە کە لەبەرژەوەندی کوردبووە ئیتر کەم هەن کە ناوەڕۆك و بەندەکان بەتەواوی بزانن تەنها بەندی 62-63-64-باسدەکرێ ئەمەش ڕاستە هێندە لەسەر زاری خەڵکی کوردستانە کەدەبوایە بەئێستاشەوە بەتایبەتی فەرەنسیەکان ویژدانیان ئازاری بدانایە بەرامبەر بەو تاوانە گەورەیەی لەجێ بەجێ نەکردنی پەیماننامەکە دژ بەگەلی کورد ئەنجامدرا مامۆستا جمال نەبەز لەکتێبی (کوردستان و شۆڕشەکەی)دا ئۆباڵی جێ بەجێ نەکردنی پەیمانەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ نەبوونی پارتێکی خاوەن ئایدۆلۆژیاو سەرکردایەتی بزافی کوردایەتی ئەو دەمە بەفیۆداڵ و هەڵپەرست دەزانێ بەبێ تواناو بورژوا ناویان دەبات و دەڵێ بەگفتی سەوزو سووری ئیمپریالیزمی جیهانی و بەڵێنەکانی ئەتاتورك فریویان خواردو ئەتاتورکیش کەم توانای سەرانی بزافی کوردی بەهەل قۆستەوە و بەناوی دینەوە دوژمنەکانی پێ ڕامالێن).

ڕاوبۆچوونی مامۆستا جمال نەبەز لەجێی خۆیدایە بەلام دەکرا بەبارێکی تردا سەیری پێگەی کوردی بکردایە.کەڕەنگە کوردو سەرکردەکانی هەر هێندە هێزی دبلۆماسی و سیاسیان هەبووە لەئاست دبلۆماسیەتی وولاتانی ئەورووپاو تەنانەت کمال مستەفا ئەتاتورکیش.چونکە هێزی کمال ئەتاتورك هێندە بەهێزبووە و ئەوەندە کاریگەربووە کەهەرخۆی مامۆستا جمال نەبەز لەهەمان لاپەڕەدا دەڵێ:(سوێندخۆران)مەبەست وولاتە سوێندخورو هاوپەیمانەکانی ئینگلتراو فەرەنساو ئیتالیایە چیدی بەری سەرکەوتنەکانی ئەتاتورکیان پێ نەگیرا تالەگەڵیا ڕێکەوتن لە 24/حوزەیرانی 1923پەیمانی (لۆزان)یان لەگەڵ مۆرکرد).

ئیتر ناوی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لەئارادا نەما.هەمان کات دەسەلاتدارانی تورکیا لەگەڵ پێوەلکاندنەوەی کوردستاندا ئامبازی سیاسەتی بەتورك کردنی کوردبوون ئەو بەندانەی لەلۆزاندا دەمیان لەمافی(کەمەنەتەوایەتیەکان)دا ژەندبوولەلایەن تورکەکانەوە پشت گوێ

خـران ئەمـەش بـەتێڕوانینی بەنـدی 38ی پـەیمانی لـۆزان کەتێـدا هـاتووە:ڕژێمی تورکیـا بەرپرسیارە لەپاراستی ژیان و دەستەبەرکردنی ئازادی هەموو دانیشـتوانی تورکیـا بـێ ڕوانینـە جیاوازی نەتەوایەتی.زمان.ڕەگەزو ئاینیان بەم شێوەیە کورد وورده وورده لەپـەیمانی سـیڤەردا بەمایە پوچی لێی دەرئەچوو بارودۆخی ئێرانیش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەکوردستانی ڕۆژهەلات بـەرەو خراپ بوون و قات وقڕی دەچـوو بـاری ئـابوری داڕووخـابوو سمکـۆ لەهـەموو لایەکـەوە پـەلامار دەدرا شەڕو کوشتن بەرۆکی گرتبوون و بزوتنەوەی سمکۆش ڕوو لەهەوراز بوو سـەرکەوتنەکانی سمکۆ خەڵکی دڵسۆزی کوردستانی مەست کردبـوو دەسـەلاتی ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ فـراوانتر دەبـوو بۆیە سمکۆ بـیری لـەڕزگارکردنی شـارو شارۆچـکەکانی تـری کوردسـتان دەکـردەوە بەتایبـەتی ناوچەکانی سابلاخ. ڕێکەوتنی پێشووی سـاڵی 1907کەلـەنێوان ڕوسـیاو بـەریتانیا بـۆ دابـەش کردنـی ئێـران ڕێکـەوتبون بـەو شـێوەیەش کوردسـتانی ئێـران دەکەوتـە ژێـر دەسـەلاتی ڕووسەکانەوەو بەلام شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئەو نەخشەیەی بەجارێ هەڵوەشاندەوە بـەریتانیا وازی لەدابەشکردنی ئێران هێنـا ئەیویسـت دەوڵـەتی ئێـران بمێنـێ وحکومـەتێکی بـەهێزی مەرکـەزی ئـەوتۆی تیادامـەزرێنێ کەبـەری تەقینـەوەی کۆمـۆنیزم بگـرێ لەهـەمان کاتـدا دەیویسـت بـە پـەیمانێکی دوو قـۆڵی ئێـران ببەسـتێتەوە بەبـەریتانیاوە تالـەژێر کاریگـەرێتی خۆیـدابێ ئێـران خوازیاربوولـەکۆنگرەی ئاشـتی دا بەشـداربێت بـەهاوکاری بـەریتانیا بـەلام ئینگلیزەکـان نەیاندەویست کەئێران بەشداربێت چونکە بەشداری جەنگی جیهانی نەکردبووئێترچۆن بەشداری کـۆنگرەی ئاشـتی بکات.تـا لـەدیاری کردنـی چارەنوسـی ڕۆژهـەلاتی ناوەڕاسـتدا ڕۆڵـی هـەبێت بـەریتانیا لەڕێگـەی دانـی چـەردەیەك بـەرتیل بـە (وثـوق الدولـە) سـەرۆك وەزیـران و وەزیـری دەرەوەو وەزیری دارایی لەساڵی 1919پەیمانی لەگەڵ ئێران بەست(70).مس بێڵی سـکرتێری مەنـدوبی سـامی بـەریتانیا دەربـارەی سیاسـەتی حکومـەتی بـەریتانیا لەکوردسـتانی ئێـران دا وتویەتی (لەدوای بەستنی پەیمانی 1919لەنێوان ئێران و بەریتانیا کە (وثوق الدولە)ی سەرۆك وەزیرانی ئێران و (سێر پێرسی کوکس) مۆریـان کردبـوو لـەدوای مـۆرکردنی ئـەو پەیمانـە ئـیتر

سمکۆ تارادەیەکی زۆر هیوای بەپشتیوانی کردنی بەریتانیا نەما کە تەقەلایەکی زۆری ئەدا بۆ نزیك بوونەوە لەئینگلیز بەمەبەستی پێك هێنانی جۆرە یەکێتی و هاوکاری یەك لەنێوان هەموو کوردەکانی ئێران وعێراق و تورکیادا)(71). لەبەرئەوە ئینگلیزەکان هیچ جۆرە گرەنتی یەکیان بەکوردەکان نەدا و تەنانەت بەڵێنی جۆرێك لەحوکمی خۆجێ یەتیشیان بەڕەوا نەزانی دوای شەش مانگ لەحوکمداری شێخ محموود پەشیمان بوونەوە کەوتنە جێ پێ لێژکردنی و هەوڵی پەرت کردنیانی ئەدا بەهەمان شێوەش ڕووسەکان بەرامبەر بەکورد هیچ بەرنامەیەکیان نەبوو لەپێش جەنگی یەکەم و دوای جەنگیش هیچ خواستێکی کوردیان لەبەرچاونەگرت.هەرچی تەقەلای عبدالرزاق بەدرخان و شێخ عبدالسلام بارزانی و کامیل بەگی بەدرخان و سمکۆی شکاك و مەلا سەلیمی ناوچەی خێزان و سەید تەهای شەمزینی سوودی نەبوو ڕووسەکان لەهەوڵی ڕازی کردنی ئاسووری و ئەرمەنەکاندا بوون چونکە لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ڕووسەکان توشی کێشەیی گەورەی ناوخۆیی بووبون لەلایەکی ترەوە ئەو گەمارۆ ئابوریی یە ئەورووپیەی لەسەر ڕووسەکان بوو کاریگەری هەبوو لەڕووبەڕووبونەوەی ڕووسەکان بۆیە رووسەکانیش پەشیمان بوون لەهاوکاری کردن بۆ دابەش بوونی خاکی ئێران و تورکیا کەپێشتر ڕایان لەسەری هەبوو بەڵام ئێستا بەپێچەوانەوە خواستی ڕووس بۆ تورکیا و ئێران و ئەفغانستان تەنیا لە بەهێزبوونی ناوەندا بوو هەربۆیە پەیماننامەیەکی لەگەڵیاندا بەست.چونکە سمکۆ لەساڵانی دەربەدەریدا کەلە باشقەڵابوو لەڕێگەی ڕووسەکانەوە لەسەرداوای خالید بەگی جوبرانلی سەرۆکی(جمعیەی استقلالی کوردستان)لەڕێگەی قونسوڵی ڕووسیا لەورمێ پێشنیازکرا کە هاوکاری کوردی–ڕووسی بکەن لەم نێوەندەشدا کاربکەن بۆ گەڕانەوەی سمکۆ بۆ ئێران و تا سەلامەتی پارێزراوبێت لەشوێنی خۆی دانیشێ .....سمکۆ ئەو هیوایەی بەئینگلیزەکان هەبوو لێیان کەوتبووە گومانەوە بەڵام(مس بێڵ) دەڵێ سمکۆ تا چەند ساڵ دوای ئەوەش لەئینگلیز بێ هیوانەبووە.

(یەحیای دەوڵەت ئابادی)لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا نوسیویەتی کەپێش کودەتای ڕەزاخان دەوڵەتی ئینگلی نەخشەی پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی لەکوردستانی گەورەدا بەدەستەوە

بوو.بەلآم پاش ئەوەی کە ڕەزاخانیان هێنایە سەر حوکم کەڕەزاخان تۆکەری خۆیان بوو ئیتر کوردستانی گەورە و حکومەتی کوردی لەبیر چوەوە)(72). حکومەتی بەریتانیا بۆ پتەوکردنی جێ پێی حکومەتە دەسکردەکەی خۆی لەعێراقدا کە هەروەکو جگەر گۆشەیەکی خۆی پەروەردەی دەکرد تەقەلآی ئەدا کە کورد بکا بەلایەنگری ئەو حکومەتە کەلەوەدا تەنها سوودو بەرژەوەندی خۆی مەبەست بوو لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی کورد لەخۆی زویر نەکا بەتایبەتی ئەو کوردانەی کەباوەڕیان بەسیاسەتی بەریتانیا هەبوو بۆ پینەکردنی مەبەستە سەرەکیەکانی خۆیان.دەستیان کرد بەفرۆفێڵ و بەنج کردنی مێشکی کورد.لەحوزەیرانی 1919دا حکومەتی بەریتانیا حکومەتی عێراقی ڕاسپارد کەبەیانێك دەربکات بۆ هەموو کوردەکان کەلەو بەیانەدا هاتووە.پاشەڕۆژی ئەو وولآتەی کەپێ ی ئەوترێ ئەرمینیا و کوردستان پێویستە لەکۆنگرەی ئاشتی دا باس بکرێ وچارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە کەلەوەدا هیچ گومان نیە بەپێی ئەو نەخشەیە دەستنیشانی ئەوە بکرێت هەموو میللەتێك مافی ئەوەی هەبێت شێوەی بەڕێوەبردن و کاروباری خۆی دەستنیشان بکات بەرلەمە بەریتانیا کوردی دڵنیاکردبوو کەمافی کورد پشت گوێ ناخات لەکۆنگرەداو ئەوە دەخرێتە بەرچاو و بەرژەوەندی کورد لەوەدایە کەهێمنی و ئاسایش بپارێزێ لەناوچەکانی خۆیاندا.بەلآم دەربارەی ئەو کوشتارەی کەلەئەرمەنیەکان کرابوو بەپێی بڕیاری حکومەتی تورکیا پێویستە ئەو کاربەدەستانەی کەهۆی ئەو کوشتارەبوون سزا بدرێن و ئەو ئەرمەنیانەش کەدەستیان هەبوو لەکوشتارو سەربڕینی ئیسلامەکاندا ئەوانیش سزابدرێن ئەو ژن و منداڵە ئیسلامانەی کە گیراون بەربدرێن و هەرچیەکیان لێ زەوت کراوە بیاندرێتەوەو هەوڵ بدرێت ناکۆکیەکانی نێوانیان نەهێلرێ.لەئەنجامی ئەمەدا سمکۆ زۆر خۆی لەحاکمی گشتی بەریتانیا نزیك کردەوە کەلەپێش شەڕیشدا یەکتریان ئەناسی .

بەلآم کە سمکۆ لەپەیوەندی پتەوی ئینگلیزو ئێران گەیشت ئیتر بوبە هۆی ئەوەی سمکۆ هیچ هیوایەکی بەوە نەمێنێت کە حکومەتی بەریتانیا یارمەتی بدات بێجگە لەوەی کە ترسی

ئەوەشی هەبوو کەسزا بدرێت بەرامبەر بەو کارانەی کەبەعیسابیەکانی کردبوو کە ئەمە وای لەسمکۆ کرد خۆی لەتورکەکان نزیك بکاتەوەو بچێتە ژێر سایەیانەوە(73).

لەدوای ئەوەی لەسالی 1921 (سێر پێرسی کۆکس)مەندوبی سامی بەریتانیا لەبەغدا چووە تاران و لەگەڵ ئێرانیەکان دا کەوتە گفتوگۆکردن وسەرۆك وەزیرانی ئێران (وثوق الدولة)پەیمانێکی لەگەڵ ئینگلیزەکان مۆرکرد ئاشکرابوو کە دوای هاتنی (زیائەدینی تەباتەبائی)و کودەتاکەی مانگی شوباتی 1921ئیتر مەسەلەی وولات ڕەنگ و ڕوویەکی تازەی بەخۆیەوە دی و دەولەتی ئێران و ئینگلیز لەیەك نزیك بوونەوە.سمکۆلەمانگی حوزەیرانی 1921بۆی دەرکەوت کە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ کاربەدەستێکی ئینگلیزدا لەشاری شنۆو بەدوای ئەوە لەگەڵ (سێرپێرسی کۆکس) لەمانگی ئابی 1921دا یەکتریان بینی و لەوچاوپێکەوتنەدا بەپێویستی زانی کەدوو شتی بەباشی بۆ ڕوون ببێتەوە بۆ ئەوەی بزانێت.

1-ئایا کوردستان چی بەسەردێت؟و ئایا کێشەی کورد لەسالی 1914دا کەلەبەرچاوی دەولەتانی تورك و سۆڤیەتدا بووە بەکوێ دەگا؟

2-دەیەوێت لەوەش بگات، کەئایا لەناوچوونی تەخت و تاجی پاشایەتی قاجارو هاتنی ڕەزاخان دەبێتە هۆی ئەوەی کەسوودی کوردی تێدا بێت؟ئایا لەو بابەتەوە هیچ مەترسی یەك لەئارادا نی یە؟

ئایا ئەگەر دەولەتێك کوردەکان لەژێر بالی خۆیدا ڕانەگرێ چۆن کورد خۆی بەتاقی تەنیا لەچنگی ئێران و تورك ڕزگاری دەبێت؟

پێشنیارەکانی سمکۆ بۆ ئینگلیزەکان ترسێك نەبوو بۆ گیانی خۆی بەلکو ترسێك بوو بۆ داهاتووی نەتەوەکەی و نیشتیمانەکەی دەنا سمکۆ لەگیانبازیدا زۆر لەوە ناسراوترە تەنانەت هێندە جەنگاوەرێکی لێهاتوو بوو کە ڕەزاخان

بەدل لێی دەترسا(74).لەدیدارێکدا مسەفاپاشای نێردراوی یانەکانی کوردی ئەستەمبول لەگەل سمکۆ کە دەیەوێت لەنیازو نیەتی ئەو حالی ببێ لێی دەپرسێ ئایا ڕێکخراوێکی هەیە.بەتەمایە

چۆن ئەو ناوچانەی ژێر دەسەلاتی بەڕێوەبەریێ؟ئایا ئالای هەیە؟سمکۆ لەوەلامدا دەڵێ(لەحالی حازردا ڕێکخراوێکی تایبەتیم نیە من تاقە کەسێکی کوردستانم گرنگ ڕزگارکردنی وولاتە گرنگ نیە کێ حوکمی بکات من لەم ڕووەوە چ تەماح و تەمایەکم نیە.سەبارەت بەئالاو بەیداخ و ئەم جۆرە شتانە پێموایێ پێویست بەم شتانە ناکات.وەکو بەخۆت ئەبینی هەر تیرەو تایەفەی شکاکان بەیداخ و ئالای خۆیان هەیە(75).سمکۆ لەسالی 1921دا پەیوەندی بە(سێر پێرسی کۆکس)ەوە کرد کەتازە لەکاری گفتوگۆ گەڕابۆوە لەسەر پەیمان بەستن لەگەڵ ئێران دا هاتبۆوە بەغدا وەزع و حالی گۆڕابوو چونکە پەیمانی ناوبراو هەر کەلەگەڵ(وثوق الدولة)ئیمزا کرا جەماوەری خەڵك ڕوویەڕوی بونەوەو سەرئەنجام لەلایەن دەوڵەتی (سە ید زیائەدین تەباتەبائی)یەوە لە1921/2/20بەزەبری کودەتایەك هاتە سەرکارو پەیمانەکە هەڵوەشێنرایەوە(76). لەکانونی دووەمی سالی 1921کاتێ سمکۆ ڕایگەیاند کەئامادەیە بۆ دیداری کاربەدەستێکی ئینگلیز تا شنۆ بڕوات تا(قەرارێك تەرتیب بکات کە بەقەزانجی هەردوولابێت)،وتبوی (بەرلەهەموو شتێك ئارەزووی ئەوە دەکات کەپەیوەندی یەك لەگەڵ بەریتانیا دروست بکات)ئەوسا (سێر پێرسی کۆکس) لە1921/8/19دا پەیوەندیەکەی سمکۆی پەسەندکرد کەئەم پەیوەندی یە لەداهاتوودا لەسەری دەدوێین.......

لەگەڵ ئەم هەموو هەوڵ وتەقەلایەی کە سمکۆدابووی ئەوەی بتوانێ گرەنتییەکی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە چنگ بکەوێ تەنانەت لەوەلامی پرسیاری مستەفا پاشای یامولکی سەبارەت بەتورکە کەمالیەکان سمکۆ دەڵێ:(منیش زۆر ڕقم لەتورکە قەومیەکانەو بەدوژمنێکی گەورەتریان دائەنێم لەفارسەکان بەلأم من چەند جارێك نامەم ناردووە بۆ ئینگلیزەکان و ئاگادارم کردون کە من نامەوێ دژی سیاسەتی ئەوان هیچ بکەم هەمیشە پێویستمان بەیارمەتی دانی بەریتانیا هەیە بائەوان هەستی خۆیان بەرامبەر بەکورد دەربڕن ئەوسا منیش ئامادەم بەئارەزووی ئەوان بجوڵێمەوە ئێمە پێویستمان بەچەك و فیشەك هەیە ئەگەر ئەوەم فریا نەکەوێ تووشی گرفتێکی زۆر دەبم بۆئەوەی ئینگلیزەکان دڵنیابکەم کەئەمەوێ بەڕاستی لەگەڵ

سیاسەتی ئەواندابم سەید تەهام نارد بۆ بەغداد بەلام ئەو چوونەش هیچ سودو ئامانجێکی نەبوو.ئەوا من و سەید تەها تۆ ئەکەین بەوەکیلی خۆمان ئەگەر حکومەتی بەریتانیا ڕاستەوخۆ یاخود بەهۆی دۆستە دڵسۆزەکانیەوە لەناوپشدەردا بتوانێت یارمەتی چەك و جبەخانەمان بدات و بێ ئەوەی بمانخاتە ژێر ڕەحمەتی ئەفسەرەکانییەوە ئەگەر ئەمانە بکات ئەوا ئەتوانین(وان و ئەرزیرۆم و سیواس و هەکاری)پاك بکەینەوە لەتورك ئەوسا ئەتوانین دەرسێکی گەورەش فێری ئەوانەی ڕەواندز بکەین(مەبەست ئۆزدەمیر)و ئەوانەی تریش کەلەشوێنەکانی تردان سمکۆ بەمستەفا پاشا دەڵێ ئەمە پێشنیازی ئێمەیە و تۆ ئەتوانی دڵنیایان بکەی کە ئێمە ڕاست و پاکین ئەتوانین(ئەنکەرە)بگرین و ئەگەر ئینگلیزەکان بێ دەنگ بن ئەوا ئەتوانین شاری(سنە)ش لەماوەیەکی کەمدابگرین)(77)......

# (شەڕی مهاباد و ڕۆڵی سمکۆ)

له1921/10/6هێرشی سمکۆی شکاك بۆ شاری سابلاخ(مهاباد)و گرتنی لەلایەن هێزەکانی سمکۆوه قسەو باسی زۆری لەسەر کراوەو ڕەنگە کۆمەڵێك کاری نادروست و بێ بەها ئاراستەی سمکۆو هێزەکەی کرابێت(ئیگلتن)(78). دەڵێت: سمکۆ لەساڵی 1921بەهێزێکەوە پەلاماری شاری مهابادی دا کەنزیکەی 600جەندرمەی ئێرانی تێدابوو لەو شەڕەدا ئەو هێزەی ئێران هەموو کوژران و سەربڕان هەندێ لە مسیۆنێرەکانی(لوثە ر)ی ئەمەریکییش هەر بەو دەردەچوون.مارتن ڤان برۆنسن(79). لەنوسینەکانیدا دەربارەی شەڕی مهاباد وتویەتی ساڵێك سمکۆ مهابادی گرت نزیکی(2000)کوشتارو برینداری لەو شەڕەدا هەبوو لەناوهێزەکانی حکومەتی ئێراندا گەلێك تالأنیش کرا .کەسمکۆ مهابادی گرت کردی بەپایتەختی خۆی بەلأم خۆی تیا دانەنیشت بەڵکو هەمزەئاغای مامشی کرد بەفەرمانداری سابلاخ و شارەکانی وەك(میانداو)(مراغە)(بیناب) دانیشتوەکانی هەموو بەناردنی نامە بۆ سمکۆ لایەنگری خۆیان دەربری دەربارەی ڕێبەرایەتی سمکۆ لەسابلاخ دا. ساتێك هێزی سمکۆ چووە مهابادەوە لەگەڵ ئەوەشدا کەدانیشتوانەکانی هەموو کوردبوون بەلأم گەلێك دەست درێژیان کرایە سەرو بەرامبەر بەو ڕوودواوە کوردە نیشتیمان پەروەرەکان زۆر بێزاری و ناڕەزایی خۆیان دەربڕی بۆ سمکۆو پێیان ووتبوو ئەو ڕەفتارە لەسوودی دوژمن زیاتر هیچ سوودێکی میللەتی کوردی تێدانیە.

کریس کۆچێرا لەلاپەرە(53)ی کتێبەکەیدا دەڵێ: هێزەکانی سمکۆ دوای گرتنی مهاباد کەوتنە تالأنکردنی شارو ئەم کارەش بووە هۆی ئەوەی کەبەشێکی زۆری خەڵکەکە لێ ی دوربکەونەوە لەئەنجامی شەڕدا یەکێك لە گەورە پیاوانی شار بەناوی قازی لەتیف و ماڵی هەموو گەورە پیاوانی دیکەش تالأنکران دوای چەند هەفتەیەك سمکۆ لە گفتوگۆیەکی دا لەگەڵ مستەفا پاشا یامولکی دا نێردەی یانەی کوردی لەقوستەنتینە(ئەستەمبوڵ)باسی ئەم ڕوداوانەی کرد بەوتەی

ئەو كاتێ كەلەمهاباد نزیك بوونەوە ناردی بەشوێن سەران و گەورە پیاوانی شاردا كەبێن بۆلای بەلآم ئەوان نەچوون.خەڵكی شاریش تەنانەت نوێنەرێكی خۆیان بۆلای نەنارد سمكۆ لەسەری دەڕوات و دەڵێ كەئێرانیەكان شاریان كرد بەشەرگەو خۆیان دایە پەنای دیوارەكانی شارو لەئەنجام دا شاربەزەبری هێرش و پەلامار گیرا خەڵكی شار بوونە قوربانی ئەم كارە ئەوەبوو شكاكەكانیش زەرەرو زیانیان دا.بەلآم سەبارەت بەتالآنكردنی شار سمكۆ پێی وایە هەرچەندە ئەو رازی نەبووە بەلآم ئەمە كاتێك بوو ڕێ ی لێ نەگیرا و دەڵێ(هەوڵ دەدەم دڵی خەڵكەكە بدەمەوەو ئەمەیان لەدڵ دەربێنم)*. سمكۆ لەشوێنێكی تردا لەسەر تالآنی مهاباد دەڵێ (هەموو خەتای جەندرمەكان بوو كەئەوان دەستیان لێمان كردەوە و چەكدارەكانی ئێمەش ناچاربوون بۆ پاراستنی خۆیان وەلآمیان بدەنەوە.بێجگە لەوەش لەكاتێكی وادا تواناو دەسەلآتی ئەوەم نەبوو كە رێگە لەو دەست درێژی كردنە بگرم كەلەسەرو هەموو شتێكەوە ,من بەگومان بووم لەعەشایەری مەنگوڕو دیبوكری كەلەدەوروپشتی مهابادبوون)

لە چاوپێكەوتنەكەی مستەفا پاشا یامولكی دا لەكاتێكدا دەپرسێ :

—ئێوە بەتەواوی دەڵێن بۆ نیشتیمان هەوڵ دەدەین بەلآم ئەی بۆچی كە (سابلآخ)تان گرت دوكانەكانیان تالآن كران و هەندێكیشیان كوژران لەناو ئەوانەدا قازی لەتیف كەپیاوێكی ڕێز لێ گیراو بوو؟ ئایا ئەو جۆرە ڕووداوانە ئێرانیەكان دڵخۆش ناكاو بۆ سوودی ئەوان نی یە ؟وەكو بیستم ماڵی حاجی ئێلخانی سەرۆكی ناسراوی دیبوكری تالآن كراوە لەبەرئەوە هیچ دوورنییە كەبەشێك لەمەنگوڕو بەگزادەی گەورك و ناوچەی سەقز دژی تۆ یەكبگرن.

سمكۆ لەوەلآمدا دەڵێ (وەختێك ڕوومان كردە سابلآخ ناردمان بەشوێن هەموو سەركردەكاندا بەلآم نەهاتن هیچ نوێنەرێكی سەقز یا نێردراوێكیان نەهات ئێرانیەكانیش لەناوشاردا شەڕیان دەكرد شەڕەكە دوو ڕۆژ درێژەی كێشا ئەوە بوو لەئەنجام دا ناوشارگیراو هەندێك كەس كوژران شكاكیشیان تێدابوو لەو شەڕەدا دانیشتوانی شارو عەشایەر تێكەڵ بوون و تێكڕژان بوو ڕەشاش و تۆپیشی تێدا بەكارهێنرا لەحاڵەتێكی وادا ناتوانرێت ڕێگا لەتالآن و بڕۆ بگیرێت

ئەگەرچی من بۆخۆم دژی ئەوە بووم .ئێمە گومانمان لەعەشیرەتی مەنگوڕ و دیبوکری هەبوو بەڵام گوێشمان نەدایە حاجی ئێلخانی بەوەشەوە نەوەستا کەهەر بێتە لایەنگری ئێرانییەکان بەڵکو بەناوی کوردەوە داوای لەخەڵکی دەکرد کەبچنە پاڵی و شەڕمان لەگەڵ بکەن.عەشیرەتی مامش زۆر دڵسۆزی ئێمەن کوڕی خوالێ خۆشبوو محمود ئاغای هەمزە ئاغامان کردە حاکمی سابڵاخ و کەریم ئاغای برای بەموفەتیشی(ناوچەی حمە جان و ناوچەی بانەلێس)و گەوڕکی دراوسێی.دوای گرتنی سابڵاخ توانیان فارسەکان لەسەقز دەربکەن بەڵام لەسەر داوای خەڵکی سەقز دەوڵەت 300–400جەندرمەی خۆی لەسنەوە ناردو بانەلێس یان گرتەوە)*

هەژاری شاعیریش لەکتێبەکەیدا بەناوی چێشتی میجەوردا نوسیویەتی:

کاتێك کە هاتمە دنیا ئاخرو ئۆخری بەهاری 1300شەمسی بوو و لەپێناسەکەمدا حەوت ساڵ دوای لەدایك بوونم وەرگیراوە ڕۆژی لەدایك بوونم هەژدەی جەوزا واتا مانگی پوشپەڕ لەپایزی ئەو ساڵەدا لەشکری (سمایل ئاغای سمکۆ)بۆ شەڕی عەجەم (سابڵاخ) ی داگیرکردووە شکاك ڕژاونەتە شارو ملیان لەتالانی کوردان ناوە.وا دیارە سمکۆ هەروەك ویستویە لەچنگ عەجەم ڕزگارمان کا ویستویە لەو ماڵەش کەدەبەر پێی عەجەم دا پەیداکراوە ڕزگارمان کا ! جا ئەگەر خەڵکی شار کەم تا زۆرێك ماڵی خۆیان شاردبێتەوە لەتالانیان پاراستبێ.باوکی من بەو ئومێدە کە کاك هەمزەی برای قەرەنی ئاغای مامش برادەریەتی و ڕاوێژکاری سمایل ئاغاشە.ناهێڵێ تالان بکرێ دەستی لەهیچ ئاشتەبایەك نەداوە.بۆ نەگبەتی برادەر نەهاتووە.شکاك ڕژاونەتە ماڵ هەرچی بووە بردوویانە تەنانەت دەسرازەو پەڕۆ پاڵی لانکی منیشیان بردووەو منیان لەسەر خۆڵەمێش بەڕووت و قووتی فڕێ داوە بابم دڵخۆشی دایکمی داوەتەوە کە خەم مەخۆ ماڵی دنیا پەیدا دەبێتەوە.دایکم زریکاندویە من خەمی هیچم نیە تەنیا خەمی ئەوەمە
کوڕەکەم ڕووتە چی تێوە بپێچم؟!. ئەو تالانی شکاکەکانەیش بۆتە چیرۆکێکی سەیر لەناو خەڵکی سابڵاخ دا ژنیان ڕووت کردن و بەڵام ڕوویان وەرگێڕاوە و وتوویانە(خوشکا من دەرپێ

خۆ بدە من ئەز ل نانهێرم خودێ قەبول ناکە)جگە لەوەش کە هەموو کەس مالیان تالآن کراوە پیاوەکانی خەلکی شاریشیان بەبێگار گرتووە تا مالی تالآنی بۆ بنکە ڕاگوێزن مەلا مارفی شاعیر لەو باسەدا دەلێ:

ئاوالْ کراسی کیژو ژن و خانمی وەتەن

دایان ڕنین ئەوانی سەبابانی فون ترۆلْ

قازی و مەلاو تاجرو ئەسنافی خەلکی شار

گیران بەسوغرە کەوتنە ژێر باری داروکۆلْ

شکاک کوردی سابلآخیان هەر تالآن کردووە نەیان کوشتوون بەلآم هەر تورك زمانێکیان وەبەرپەل هاتووە کوشتوویانە یەکێك لەو تورکە ئازەریانە برادەری بابم بووە خۆی و ژنەکەی پەنایان بۆمالی هێناوە و حەواونەتەوە ژنی کەربەلای فەتحوللآ زەنگانی ساوای لەبەربووەو شیری زۆربووەو یاریدەی دایکمی داوەو شیری داومێ کەزۆر

سالآن بەجەحێلی تا منی دەدیت دەگریا و منی وەکو کوڕی خۆی خۆشدەویست)(80).خوێنەری بەڕێز ئەگەر سەرنج بدەینە نوسیەکەی مامۆستای خوالێخۆشبوو هەژار بۆمان ڕوون دەبێتەوە هەژار لەزمانی خەلکی ترەوە دەیگێڕێتەوە خۆی هێندە مندالْ بووە لەناو بێشکەدا بووە بەچاوی خۆی نەیبینیوە تەنیا بیستویەتی لەگێڕانەوەکەیدا دیارە وەك کینەو تۆمەت خستنەپالْ لەشێوەی نوکتەدا لێی ئەدوێ تاسەرنجی خوێنەری بۆ زیادبکا.ڕاستە کە سمکۆ هێرشی ڕزگارکردنی شاری مهابادی دەست پێکرد تەنها هێزەکەی بریتی نەبووە لەشکاکەکان بەلکو عەشیرەتەکانی ناو سابلاخ و دەوروبەری سابلآخیشی تیابووە وەك خودی سمکۆ کە نەیشاردۆتەوە کەتالآنی کراوە بەلآم دەلێ ئێمە شکمان لەعەشیرەتی مەنگوڕو دیبوکری بووە کە زیاتر ئەوان شارەزاو خەلکی شاریان ناسیوەو زانیویانە کێ کێ یەو لایەنگری شۆڕشە یان سەربە عەجەمانە.هەرچەندە شەڕەکە دوو ڕۆژی خایاندووە و وەك سمکۆ دەلێ تۆپ و ڕەشاشی تیابەکارهاتووە کەس بەکەس بووە پێکهاتەی هێزەکەش هەمەچەشن

بووە لەناو هێزی سەركەوتووش دا بۆتە كلتورێك جگە لە كوشتارتاڵانیشی تێ دەكەوێ.شۆڕشی فەرەنسا زۆر خراپتر تاڵانی و كوشتاری تیاكرا من بەرگری لە هیچ جۆرێك لەو كارانە ناكەم بەڵام لەكاتی ڕووخانی ڕژێمی عێراق دا چ لەكوردستان چ لەبەشەكانی تری عێراق .

.................................

*سمكۆ ئیسماعیل ئاغای شكاك و بزوتنەوەی نەتەوەی كورد،محمد ڕەسوڵ هاوار لاپەرە 435چاپی دووەم2005

*كوردو عەجەم:نەوشیروان مستەفا چاپی سێ یەم 2005 ل431-432.

ئەگەر مالێك سەر بەڕژێم بوونایە ئەوا نەك ئەو مالە بەتەنیا بگرە چەند مالْ ئـەملاو ئـەولای بـەر هێرشـی تـالأنی دەکـەوتن کەواتـە گشـت میللـەتانی دنیـا بەئەورووپیەکانیشـەوە بـەم قۆناغـەدا تێپەڕیون مامۆستا محمد ڕەسولْ هاوار لەنووسینەکانیدا لەزمانی کریس کۆچێراوە دەلێ: سـەید تەهای شەمزینی کەزاوای سمکۆیە لەپێشدا هێزەکەی ئەو چۆتە مهابادەوە. هـەروەها مامۆسـتا هاوار باسی ئەو نامەیە دەکات لە حەمەی حمە باقی لە1993/6/30لەسەقزەوە بۆی نـاردووە دەربـارەی بـیرەوەری یـەکانی کاك(موەفەقی)کـەخاوەنی کتێبخانـەی (موەفـەقی) یەلـەمهاباد کەپەیوەندی بەو ڕۆژانەوە هەیە کەسمکۆ و چەکدارەکانی مهابادیان داگیرکـردووە لـەو نامەیـەدا ووتراوە:

(لەبەرئەوەی سمکۆ لەڕۆژانی هێرش بردنیا بۆ سەر موکریان و لە داگیرکردنی سـابلاخ دا گـەلێك بەسەر هـات و بـیرەوەری لای دانیشـتوانی ئـەو ناوچـەیەی بـەجێ هێشـتووە لەبەرئـەوە ئەگـەر بیانەوێدەنگوباسی سمکۆ دەربارەی داگیرکردنی سابلاخ کۆبکرێتەوە دەفتەری سـنگی خـەڵکی یادگاری و بیرەوەری تیادایە لەناوهەنـدێ نووسـراوی دوژمنانـدا لەسـەر سمکـۆ وا بـاس دەکـرێ کەلەپەلاماردانی شاری مهاباددا پیاوەکانی سمکۆ بەفـەرمانی سمکـۆ تـالأن و بڕییـەکی زۆریـان لەدانیشـتوان کـردووە کەئەمـەش لای نـەوەی نـوێ شـوێنەوارێکی شـیرینی نـی یـە بـۆ ئەمـەش بەندە(حمـەی حمـە باقی)*بەتایبـەتی لەگـەلْ ڕونـاکبیرێکی بەسالأچووی مهابـاددا قسـەم کـرد کەهـــەتا ئێســـتەش لەژیانـــدا مـــاوە لەشـــاری مهابـــاد کتێبخانـــەی هەیـــە بـــەناوی (موەفەقی)،کەکتێبخانەکـەی بـەناوی خۆیەوەیـە لـەوەلأمی ئـەو پرسـیارەی کـەلێم کردبـوو فەرمووی: ڕاستە لەگەلْ هێرش هێنانی سمکۆدا بۆسەر مهاباد دانیشتوانی شـارەکە تـالأن کـران بەلأم بناوانی کارەکە لەخاڵێکی زۆر نهێنی و گرنگدایە و هەتا ئێستاش هەموو کەسێك نایزانێـت کەبریتی یەلەوەی کە سمکۆ زاوای سەید تەهای شەمزینی بووە ئەو سەید تەهایە چونکە لەدلْ و دەروونیـــدا بنەماڵـــەی خۆیـــانی بەبـــەناوبانگتر زانیـــوە لەچـــاو بنەماڵـــەی سمکـــۆدا بۆیـــە بۆکەمکردنەوەی ناوبانگ و شانو شکۆی سمکۆ سـەید تـەها هـەوڵی دابـوو بەهـەر نرخێك بێـت

ناوبانگی سمکۆ بزرێنێت و بیشێوێنێت ئەوەندەش کە پەیوەندی بەتالآن و برۆی مهابادەوە هەیە لەپیرەکانی ئەو سەردەمەم بیستووە (قسەی موفەقی یە) کەسەید تەها لەبنەوە چەکدارەکانی خۆی هانداوە کەتالآن و برۆی مهاباد بکەن کاك حەمەی حمە باقی ئەلێ: کاك موەفەقی خوێنەوارو ڕوناکبیرو زیرەك و وردبینە بۆیە قسەکەی کەبۆمنی کرد جێی باوەڕو متمانەیە و ئەو قسەیەش بەئامادەبوونی نوسەری هێژای مهابادی سەید محەمەدی سەمەدی و کاك عەبدولآی سەمەدی بوو.

........................................................

*حمەی حمە باقی یەکێکە لەنوسەرە ناسراوو دیارەکانی کورد خاوەنی چەندین بابەتی گرنگی هەیە.

لێرەدا من دەگەڕێمەوە سەر باسەکەی هەژار کە دەڵێ دەسترازەو پەڕۆی منداڵیم بـراوە لێـرەدا دەپرسم هێزی شکاك کەلە چهریق و سۆماو برادۆست و سەڵماس و خۆی یەوە هاتوون ئەو ماوە دووردرێـژە کـەزیاتر لـە 200کیلۆمـەتر دەبێـت بەسواری وئەسـپ ولەگـەڵ هەنـدێ فیشـەك و تفەنگێك لەگەڵ توێشەبەرەیەك نـان و بـە پرتـاو بەسـواریی بەرەوشـاری مهابـادو دوای مەسـت بوونی سـەرکەوتن دەکرێـت شـکاکێك لـەبیری ئـەوەدا بـێ پـەڕۆ و پـاڵی منـاڵی سـاواو دەرپێـی ئافرەت بەزۆر داکەنێ لەوێشەوە بیباتەوە بۆناو ماڵ و مناڵی لەسۆماو برادۆسـت و چـارێ هـیچ سوارێك نیە کەتەنانەت لەسواربوونی سەرپشتی ئەسپەکەی خۆشـی ماندونـەبووبێ ئایـا ئێسـتا دەی پەرژێتە سەرئەو جۆرەکارانە کە بیکات؟یان زیاتر بۆ سوك کردنـی بزوتنەوەکـەی سمکـۆ و ئامانجەکانیەتی کەبەدەست هێنانی سەربەخۆیی کوردستانە بەمەبەسـتی ئـەوەی کـە ئامـانجی سمکۆ تەنها تالأنی یە و هیچی تر خـۆ دەبـوو ئەگـەر وابوایـە ئـەوا سمکـۆ دەیتـوانی چ لـەئێران یـاخود لەتورکـەکان یـان لەهـەر وولأتێکـی خـاوەن بەرژەوەنـدی لـەو ناوچـانەدا زۆر زیـاتر دەسـتکەوتی بـۆ خـۆی و بـۆ عێلەکەشـی دەبوو.ئەمـەش لـەدەمی دوژمنـانی کـوردەوە بڵاودەکرایەوەو پروپاگەندەیان بۆ دەکرد لەڕێگەی پیاوەکانیانەوە. ئایا داب و نـەریتی کوردانـە رێگە بەکاری وادەدات کەدەرپێ لەپێ ی کچ وژن.داکەنن بیبەن بۆخۆیان کەئەمە جێگای بـاوەڕ نییە.خۆ هەتا ساڵی حەفتاکانی سەدەی ڕابردووش لەناو خەڵکدا چەکدارەکانی شـێخ مـەحمود بەچەتەی شێخ مەحمود ناسرابوون ئایا شێخ مەحموود چەکدارەکانی نـارد بـوو ڕێگـە لەخـەڵك بگرن و ڕووتیان بکەنەوە یاخود شەو بدەن بەسەر ماڵێکدا و تالأنی بکەن؟

کاك کەریمی حسامی دەڵێ دوای ئەوەی حکومەتی ئێران هاتووچۆی نێوان تـەورێزو ورمـێ ی لێ گیرابوو ئەیویست لەڕێگەی سابڵاخەوە لەشکربنێرێ.

کـە بـە فەرمانـدەیی (مەلـەك زادە)لەگـەڵ (800)سـوارە لـە مەراغـەو میانـداوو سـابڵاخەوە بۆسەرکوتکردنی سمکۆ دەکەوێتەڕێ بەپاڵپشتی هێزەکانی قەرەباغی سـندوس چـونکە لەکۆنـدا شاعەباسی سەفەوی ئەوانەی لەقەفقاسەوە هێنابوو بۆ ناوچـە کـوردی یـەکان بـۆ بەریـەرەکانی

کردنی کوردو هەمیشە داردەست و خزمەتکاری ئێران بوون دژی کورد. مەلەك زادەش بەو نیازە هاتبوو .

کاتێك سمکۆ بەمە دەزانێ سەیدتەها دەنێرێ بۆ چەك کردنیان هەر لە (دزە دۆڵێ)دەبێت سەیدتەها جواب دەنێرێ کە نابێت هیچ کەسێك لە (سندوس ) دا چەکی پێ بێت ئەوانیش کە زانییان بەربەرەکانی سمکۆیان پێ ناکرێ بەناچاری پێشوازیان لەسەید تەها کرد و چەکەکانیان دانا.سمکۆ بەهێزێکەوە دەچێتە مهاباد و کوشتارێکی باشی ژاندارمەکان دەکات و مەلەك زادەش یەخسیر دەکات دوای ئەم سەرکەوتنەی سمکۆ ئیتر عەشیرەتەکانی زەرزاو مامش و دیبوکری و مەنگوڕ بەگزادەو گەورك سەر بۆ سمکۆ دائەنوێنن لە(خۆی و سەڵماس)ەوە تا بانەو دیواندەرە دەکەونە ژێر دەستی هێزەکانی سمکۆ.بەلام بەهۆی ئەو تالانی و ڕاو ڕوتەوە تائێستاش لەناوچەی موکریان شکاك بەتالانچی ناودەبرێ(81).کاك عومەری فاروقی هەندێك یاداشتی میرزا کەریمی بارام بەگی ئامادەکردووە بۆ چاپ(82). دەڵێ: ڕاپەڕینی سمکۆ لەماوەیەکی کەمدا هەموو کوردستانی ئێرانی گرتەوە لەماکۆو ورمێ یەو سنورەکانی ئێران و تورکیە هەتا مەهاباد و سەقزو بۆکانی گرتەوە.هاورێ لەگەڵ سمکۆ سەید تەها ئەفەندی کەپێشەوای مەزهەبی ناوچەکە بوو هاوکاری دەکرد هەر ئەو ڕاپەڕینەی سمکۆی پشت ئەستورتر دەکرد(لە بەهاری 1300هەتاوی) دا(1921زایینی) بوو کەمن برێك ئاردو دانەوێلەم بارکردبوو لەگەڵ چەند کەسێك بەرەو مهاباد چووین تاکو بەوانی بفرۆشم و پێداویستی ماڵی ئاغای پێ بکرم و بگەڕێمەوە بۆ (نیسك ئاباد)لەو کاتەدا سەرهەنگ مەلەك زادە ئامر هێزی سوپای دەوڵەتی بوولەمهاباد کاتێك گەیشتمە شار هەموو شتەکانم لەمەیدانا فرۆشت بۆشەوەکەی چومە ماڵی میرزا عەلی مازوچی .بڕیار وابوو بەیانی لەشار دەربچین بەلام ئەو ڕۆژەش هاوەڵەکانم نەیانتوانی و ڕۆژێکی تر ماینەوە و دیمان ئیعلانی نیزامی دەرچوو بەفەرمانی سەرهەنگ مەلەك زادە کە نابێ کەس لەماڵ دەربچێ و ڕاوەستان و کۆبوونەوە لەکوچەو کۆلان و شەقامدا قەدەغەکرابوو هەرکەسێك دەرکەوێ بەگوللە دەپێکرێت و

دەکوژرێت.بەبیستنی ئەو ئیعلانە هاوارو شیوەن جارێکی تر لە مهابادی لێقەوماوا بەرزبۆوە هەموو بەرەو ماڵی خۆیان و پەناگا ڕۆیشتن و مەعلووم بوو سوپای سمکۆ گەیشتۆتە نزیکی مهاباد.ئەو شەوە لەمێژووی مهاباد دا شەوێکی ئێجگار ترسهێنەر و بەخۆف بوو کەس نەیدەزانی چی بەسەردێت.بەڵام دەیانگوت شکاك هاتوونەتە ناو باخەکانی کێوی (غەزائی) لەو کاتەشدا تۆپی گەورەی ئەرتەش لەسەر کێوی (داشا مجید)دابەسترا بوو کەدیمان شکاك و ژەندرمە دەستیان کرد بەتەقەو قرمەو تابەیانی هیچ کەس لەبەر تەقەی گوللە خەوی لێ نەکەوت و کەسیش نەیدەزانی کێ فایەقەو کێ تێکشکاوە بەڵام لەتاریك و لێڵی بەیانیدا مەعلوم بوو شکاك دەستیان داوەتە ئەسیرکردنی هێزەکانی سوپای دەوڵەتی و زۆرترینیان بەدیل گرتبوون و هەموو تەجهیزات و چەك و تەقەمەنی ئەرتەشی کەوتە دەستی هێزەکانی سمکۆ .ئەو هێزەی سوپای ئێران بەتەواوی تەسلیم بوو. ئینجا شکاکی ناحاڵی دەستیان کرد بەتاڵانی شاری مهاباد و هەرکەس خۆی لەماڵی خەڵك دەخست و هەرچی هەبوو دەیانبردو ئیتر نازانم ئەمە چ شۆڕشێکی کوردی بوو.منی بەدبەختیش هەرچیم کڕیبوو لێیان سەندم و بردیان کاتێك هیچم نەما بەرەفیقەکانم ووت من دەچمە (محمود کانی)بزانم لەوێ چ باسە.ئەمەم ووت و بەرەو محمود کانی چووم.سەرنجم دا سێ شکاك بەکێوی (دا شامەجید)دا سەردەکەون تاکو تۆپەگەورەکەی سوپای ئێران داگیربکەن و ئەوانەیش کەلای تۆپەکە بوون بەترسەوە خۆیان دابەدەستەوە .بەڕاستی من لەدیتنی ئەو کارەساتە زۆر نیگەران بووم و ئەمانەم هەموو بە(براکوژی) و پیلانی ئیستیعمار دەزانی و ئەم فیرقەو دەسبازی یە بۆیە ئیجاد دەکەن تاخۆیان بەئامانج بگەن.بەهەر حاڵ کاتێك گەیشتمە بەرزاییەکانی(محمود کانی) چاوم کەوت بەسمکۆ تفەنگێکی سێتیری بەدەستەوە بوو بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد(مەلەك زادە)بەزیندویی بێنن و کەس حەقی نی یە ئازاری بدات.هەر لەو کاتەشدا ئۆردوی شکاك دیلەکانیان بەدەستەی 30و50نەفەری دەهێناو لەسەرجادەی (کەرێزە)بۆ لای ڕۆژهەڵات و بەرامبەر(محمود کانی)دایان دەنان و بەموسەلسەل و تفەنگ دەستڕێژیان لێ دەکردن و

دەیانکوشتن.لەو کاتەدا بەچاوی خۆم دیم یەکێك لەدیلەکان گوللەی بەرنەکەوتبوو هەڵساو سەراسیمە دەستی کرد بەهەڵهاتن وبۆ پەناگەیەك دەگەڕا خۆی تیا حەشار بدا- سمکۆو ئەو کەسانەی بۆ تاڵانی نەچووبون تەماشایان دەکرد لەو کاتەدا چەند کەس ئەو کابرایەیان دایە بەر گوللەو نەیگرت ئەوجا سمکۆ بۆخۆی بەتفەنگەکەی گوللەی تێ گرت و پێکای و لەکاتێکدا کابرا لەخوێنی خۆیدا دەگەوزا گوێم لێ بوو سمکۆ ووتی وەڕازی سەگباب لەولاشەوە ئۆردوی شکاك لەناوشاردا ڕەحمیان بەکەس نەکرد تەنانەت جل و بەرگی خەڵکیشیان لەبەر دادەکەندن بۆ وێنە کاتێك دەگەیشتن بەژنان دەیانوت ئێوە خوشکی ئێمەن پشتێنەکەمان بدەرێ(تۆ گوشکی منی شۆرەکی وەکە)لەو لاشەوە سمکۆ هەر هاواری دەکرد مەلەك زادەم بۆ بێنن خەڵك تاڵان مەکەن بەڵام سوودی نەبوو تاڵان هەر درێژەی دەکێشا هەرچەند سمکۆ بۆ خۆی چەند کەسێکی لەتاڵان کەران دایە بەر گوللە بەڵام هێشتا هەر دەرەقەت نەدەهات هی واشیان هەبوو کەچاویان بەسمکۆ دەکەوت هەرچی تاڵانیان کردبوو لەژێر دارو ئاوکونج و کەلێندا قایمیان دەکرد.میرزا کەریمی بارام بەگ درێژە ئەدات بەباسەکەی و ووتەکانی سمکۆ لەگەڵ مەلیکزادەو سەردار علی خانی بۆکان بەمجۆرەی خوارەوە دەیگرێتەوە:لەو کاتەدا سەرنجم دا مەلیکزادەیان هێنا کەچەند ئەفسەرێکی تریشی لەگەڵ دا بەدیل گیرابوو کەسمکۆ چاوی پێ یان کەوت پێشوازی لێ کردن و لەگەڵ هەموویان دەستی لێدا(تەوقەکردن) زۆر دڵنەوایی کردن مەلیکزادەو ئەفسەرەکان هەموو جل و بەرگی نیزامی شڕو کۆنەو پینەکراویان لەبەردابوو.بەڕاستی کاتێ سمکۆ لەگەڵ ئەوانەدا بەو چەشنە ڕەفتاری دەکرد لەدڵەوە ڕقم لەو هەڵپەرستانە هەڵگرت کەبەناوی شۆڕشی کوردەوە خۆیان خزاندبوە ڕیزی هەواداران وچەنگاوەرانی سمکۆ لەحاڵەتێکدا ئامانجی ئەوانە هەر تاڵان و کوشتارو بڕین بوو نەك کوردایەتی* بەڵام سمکۆ بۆخۆی بەو چەشنەی من بینیم سەردارێکی لێهاتوو کوردێکی بێ غەل و غەش بوو لێرەدا بۆ ئەوەی باش حاڵی ببم.لێیان نزیك بوومەوە سەرهەنگ مەلیکزادە کەسەرنجی تەرمی کوژراوەکانی دا چەند ئەفسەرێکی بینی کەتازە تەسلیم بوبون ڕووی کردە سمکۆ و پرسیاری کرد.ئەم بێچارانەت بۆچی

کوشـــــتووه ؟لەکام شـــــەڕدا دیـــــل کوژراون ؟سمکـــــۆ ووتـــــی ئەمانـــــە خـــــەڵکی (بوناب)و(مەڵکەندی)و(میانـدواو)بوون کەهەریـەکێك لەمانـە هـەتا ئێسـتا یـەك دووجـار بـەدیل گیرابوون و قسەم بۆ کردبوون و ئامۆژگاریم کردبوون کەخەریکی وەرزێـری و کشـتوکاڵی خۆیـان بن و چی یان داوه لەشەڕو گێرەو کێشە بەڵام بەقسەیان نەکردم پاش ئەوەی خـەرجی سـەفەرو جل و بـەرگم پێـدان دیسـانەوە جـارێکی تـر هاتنـەوە بـۆ شـەڕکردن لەگەڵمـدا ئـەوەبوو منـیش فەرمانی کوشتنی ئەوانەم دەرکرد.چـونکە بەقسـەیان نـەکردبووم.خۆمنیش دەوڵـەت نـیم هـەتا ئۆردوگاو زیندانم هەبێ و دیلەکان لەوێ ڕاگرم.دیارە تەنیا چارەی ئەوانە کوشتن بوو بەڵام مـن پرسیار لە تۆ دەکەم کە نوێنەری دەوڵەتی ئێرانی ، مەلیکزادە ووتی فەرموو سمکۆ پرسـی:ئەی ژاندرمـەکانی تـۆ بۆچـی لـەکاتی ئاسایشـدا دەچـنە بـەر دەرکـی حـەمامی ژنـان و سـەرپۆش و چادریان لەسەر ناموسی خەڵکی لائەدا بەژن و منداڵی کوردان بێ حورمەتییان دەکرد؟تەنانەت چەند کەسێکی ڕیش سپی و پیاو ماقوڵ هاتن و تکایان لێ کردن کـەئێوە مـەئموری دەوڵـەتن و دەبێ پارێزگاری لەناموسی خـەڵکی بکـەن و نابـێ بێحورمـەتی بکـەن بـەژن و کچـی خـەڵکیی و حیجابیان لەسەر لادەن بەڵام ژاندارمەکان لەوەڵامدا بێحورمەتییان بەرامبـەر بـەوانیش کـرد بـوو .ئێوە دەبێ بزانن کەکورد ئەم چەشنە بێ ناموسیانەی ئێوە قەبوڵ ناکەن ، بەڵکو ئەو چەشنە کارانەدەبێتە عەداوەت و دوژمنایەتی هەردوولا ئەوە بزانن کە هەرچەند کورد لـەناوخۆدا لەگـەڵ یەکتر خراپ بن بەڵام لـەڕۆژی تەنگانـەدا هـەموو یەکدەگرن مـەلیکزادە بەبیسـتنی ئـەم قسـانە سەری داخست و سمکۆ بانگی کردە سەید تەهاو داوای لێ کرد لەگەڵ مەلیکزادە و ئەفسەرەکان بێت تا خۆی بچێت بۆ سەرکەشی ئۆردوو کاتێك سمکۆ حەرەکـەتی کـرد علـی خـانی سـەرداری بۆکان پەیدابوو سڵاوی کرد سمکۆ سـەرنجی سـەرداری داو هـەواڵی پرسـی سـەردار ووتـی ئێمـە هەموو کوردین ئێوە بۆچی لەگەڵ ئێمە بێ موبالاتن؟ئێستا کە ئاغاواتی (شاروێران) و دیبوکری هاتوونەتە پێشوازی و وەفاداری خۆیان دەربڕیوە بەڵام ئێوە بێ ئەوەی قسـەیان لەگـەڵ بکـەن

هەموویانتان چەك كردووە تەنانەت ڕووتیشیان كردونەتەوە.ئێستاش ئەوەتا كزو سەرلەخوار وێستاون.

......................................

*لێرەدا نازانین میرزا كەریمی بارام بەگ مەبەستی كێ یەو كام عەشیرەت و كام دەستەیە دیارە میرزا یان ناوی بیستوون یان دەیانناسێ بەڵام ناوی نەهێناون.میرزاش دەیەوێ بڵێ لەپشتی سمكۆوە خەریكی كاری خۆیانن كە تاڵانی و كوشت و برینە(نوسەر)

سمکۆ ووتی هیچ کەسێك کاری بەوانەوە نی یە.ئەوانە بەچەکەوە لەسەر جادەبوون هێشتا جێگای شوکرە کەپێش قەرەوڵانی من نەیانداونەتە بەر گولله.ئێستاش هەموویان ئازادن بەڵام جەنابی سەردار وەك دەڵێن ئێوە پشتاوپشت سەردارو سالار بوون ئەی بۆچی ئەوەندە لەبەرامبەر غەیرەدا سەری تەسلیم بوون ڕادەخەیت؟دروستە میللەتی کورد ڕەگەزێکی حەیا بەخۆو غەریب نەوازو بەئەدەبن دەبیّ هەرکاریّ دوولایەنەبیّ؟من دەبینم کەس بە ڕیەی تۆ ناپێوێت و بەهیچت نازانن بەڵام تۆ هەر خەریکی کڕنوش و تەعزیم بۆ حکومەتی ئێرانی.بەڕاستی هەر ڕەفتاری پیاوی وەکو تۆیە کەخۆت ناوناوە سەردارو بوویتە هۆی سووکایەتی و بێقیمەتی کوردان و نۆکەری نامەردان دەکەیت ئەوان لە ( تاران) دا کاتیّ سەرداری کورد وابەسووکی دەبینن ئیتر هیچ حساب بۆ میللەتی کورد ناکەن . سەردار علی خان بەبیستنی ئەم قسانە هیچی پیّ نەماو سەری خەجاڵەتی داخست.لەم کاتەدا خەبەریان دا بەسمکۆ کەئەسپی تایبەتی سەردار کەوتۆتە دەستی شکاك سمکۆ فەرمانی دا ئەسپەکەی بدەنەوە سەردار ووتی قوربان پێشکەشی خۆتان بێت.سمکۆ ووتی نەخێر ئەسپی تۆ بەکاری من نایەت هەر لایەقی خۆتە...

سەردار تەعاروفی کرد کەفەرموون بچینە ناو شار سمکۆ لەوەڵامدا ووتی: من ماوەی ئەوەم نی یە بێم بۆ شار حکومەتی ( سابڵاخ) م داوەتە سەیدتەهاو کاك هەمزەی برای حاجی قەرەنی ئاغای مامش. بۆخۆشم دەگەڕێمەوە بۆ (ورمیّ) ئەمەی ووت و بانگی کرد خواحافیز لەگشتتان بێت ئەوجا سمکۆ لەگەڵ مەلیکزادەو ئەفسەرە دیلەکان و سوپا ئۆردویی خۆی بەرەو شاری (ورمیّ)حەرەکەتی کرد.ئەگەر سەرنج لەیاداشتەکەی بەڕێز میرزا کەریمی بارام بەگ بدەین زۆری باسەکەی بۆ جوامێری و بەئاگابونی سمکۆ تەرخانکردووە.ئەمەش بەڵگەیەکی مێژووییە کە سمکۆ خوازیاری تالآنی نەبووەو تەنانەت چەند تالآنچی یەکی گولله باران کردووە.

لەهەمان کاتیشدا دەڵێت سمکۆ وتویەتی دەسەڵاتی تەواوم نی یە بەسەر لەشکرەکەداویەلام ئەوەی جێکەی هەڵوێستەیە کە زۆربەی نووسینەکان ئاماژەیە(خوشکا من دەرپیّ خۆ بدەمن

ئـەزل تـە نـانهێرم خـودێ قـەبولّ ناکـا). بـەلاّم مـیرزا کـەریمی بـارام بـەگ بـەجۆرێکی تـر ئـەو دەستەواژەیە بەکار دەهێنێت کەوەك ئەوەی بیستبێتی ئەمیش وتوویەتیەوە بۆیـە ئـەو دەسـتە واژەیە سەرلەبەری بە هەڵبەستراو دێتە پێش چاوو گومانەکان زیاتر دەکات.

# گەڕانەوەی خێزانی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی

پـاش ئـەوەی سمکـۆی شـکاك سـەرکەوتنێکی گـەورەی تۆمـارکرد لـە مێـژووی پرشـکۆی شۆڕشەکەیدا ئیتر خێزانی شێخ محمـوود دووری بۆسـلێمانی و خەڵکەکـەی ئـۆقرەی لێ بڕیبـوون بۆیە کاکە حەمەی ژن برای شێخ محمود کەلەگەڵ خێزانیدا بوو کەوتە هەوڵ دان بۆ چارەیەك تا بتوانێت ئینگلیز ڕازی بکات کە خێزانەکەی شێخ بگەڕێنێتەوە بـۆ سـلێمانی دوای چـەند جارێك هاتووچۆ ئیتر میجەرسۆن ڕازی بوو کە بگەڕێنەوە بۆ ولآت بەلآم ئینگلیزەکـان مـەرجیان هـەبوو کە بریتی بوو لە.

1–دەبێت خێزانی شێخ محمود لە گوندی (داری کەلی)دانیشن و پیاوەکانیش لەژێر چاودێری دا بن.

2–هیچ کەسێك بۆی نیە دەست بەسەر مولك و ماڵەکەیاندا بگرن نابێت ئیشی پێ بکەن .

3–نابێ پەیوەندی بەکەسەوە بکەن و هاتوچۆی خەڵکیش قەدەغەیە.

4–نابێ هیچ ئەندامێکی ئەو خێزانە سەردانی سلێمانی بکەن .ئەگەر ڕەزامەندی حاکمی ڕامیاری لەسەر نەبێت ئەم فەرمانە منداڵیش دەگرێتەوە.

مێرجەرسۆن بەم شێوەیە ڕازی بوو کە خێزانەکە بگەڕێنـەوە و خێزانـی شـێخ مـەحمودیش بـەو مەرجانـە ڕازی بـوون.ئیتر گەڕانـەوە بـۆ سـلێمانی و لەگونـدی داریکـەلی دانیشـتن ئەمـەش وەك سزادانی خێزانی بوو.......

بەهاتنەوەی ئـەو خێزانـە خـەڵکی کوردسـتان بەتایبـەتی خـەڵکی بەشـەرەف و بـەش مەینـەتی سـلێمانی ئامێکیـان پێـدا هاتـەوە هـەموو خـەڵکی هیوایـەکیان پەیداکرد.بـەلآم دووری شـێخ مەحمود برسکی لەخەڵك بڕیبوو چونکە خۆشەویستی شێخ مەحمود بـێ سـنووربوو. ئـەم کـارە توندوتیژیەی ئینگلیزەکان وای لەخەڵکی کوردستان کرد کـەبێزاربوون لـەڕەفتارو هەڵسوکەوتی

ئینگلیزو هاتنی ئۆزدەمیریش بۆ ڕەواندوز و بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە دژی ئینگلیزو بزواندنی هەستی ئایینی خەڵك وای لەدانیشتوانی کوردستان کرد کەبیر لە ڕاپەڕین بکەنەوە.ڕاپەڕینی پشدەرییەکان لەڕانیە بەسەرۆکایەتی عباس محمود ئاغا و ڕووبەڕووبونەوەی خەڵك و تاکار گەیشتە کوشتنی حاکمی ئینگلیز لەچەند ناوچەیەکی کوردستان.

ئەم هۆیانە وای لەئینگلیز کرد سیاسەتی خۆیان لەکوردستان دا بگۆڕن حاکمە ئینگلیزەکان سەرلەنوێ پەیوەندییان لەگەڵ سەرۆك و منەووەرانی کوردا گرێ دایەوە و بەڵێنی سەربەخۆیی کوردستانی یان بەگوێ یاندا دا .ئەمەش بەدژی تورکەکان کەنەتوانن بەرهەڵستیان بکەن بۆ ئەم مەبەستە بڕیاریان دا شێخ مەحموود لەبەندیخانەوە دەربێنن و فەرمانی بەندی یەکەی بۆ بگۆڕن.بیگەڕێننەوە بۆ (کویت)(83). لەبەرئەوە ئینگلیزەکان ویستیان نەخشەی سیاسی خۆیان لەکوردستان بگۆڕن بۆیە لەڕۆژی 5ی ئەیلوولی 1922بڕیاریاندا لەدەشتی وەیس کۆبوونەوەیەك لەگەڵ خەڵکی سلێمانی دا ڕێکبخەن لەکۆبونەوەکەدا حاکمی ڕامیاری ئینگلیز لەووتارێکدا ووتی بۆنەمانی ساردی لەنێوانماندا حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا بڕیاری دا سلێمانی جێ بهێڵێ و گەلی کوردیش دەبێت خۆی دەزگایەکی حکومی دامەزرێنێ پارێزگاری لەئاسایشی شارەکە بکات و لێپرسراوێتی بخاتە ئەستۆی خۆی.پاشان مستەفاپاشاو شێخ محمد گولانی هەریەکەیان وتارێکی داو ئیتر بوو بەچەپڵە لێدان و داوای ئازادکردنی شێخ مەحمود کرا.ئەوانیش ووتیان داواکەتان دەگەیەنینە حاکمی گشتی.ئیتر گۆلد سمیس بەناوی حاکمی گشتی یەوە پێی ڕاگەیاندن کە ئیش و کاری خۆتان بالەلایەن خۆتانەوە بەڕێوە ببرێ و کلیلی دیوانی حکوومی تەسلیم بەمستەفا پاشاو ئامادەبووان کرا پاشان فەرمانی بەرەڵاکردنی شێخ مەحمود دەرچوو بۆ گەڕانەوەی لەکوێتەوە.ویلسن حاکمی گشتی عێراق بەڵێنی بەشێخ مەحمود دا لەکۆمەڵەی گەلاندا پشتگیری بکات بەمەرجێ شێخ مەحمود هەوڵ بدا نفوسی تورك لەناوچەکەدا نەهێڵێ.کاتێك شێخ مەحمودو شێخ حەمە غەریب هاتنەوەو گەیشتنە کفری دوای پێشوازی یەکی گەرم هەر لەکفری کۆنگرەیەك بەستراو لەڕۆژی17تا 19ی ئەیلولی/1922

کۆنگرەکە کۆتایی هات.بڕیاردرا کە شێخ مەحمود وەك مەلیکی کوردستان بناسرێ .پاشان بەبروسکەیەك سوپاسگوزاری حکومەتی بەریتانیابوون هەموو خەڵکی کوردستان لەخۆشی و شادی یا بوون زۆری خەڵك بۆ پێشوازی وای کرد لەکۆتایی مانگی ئەیلولدا شێخ مەحمود گەیشتەوە شاری سلێمانی لەئاپۆرایەکی جەماوەری زۆر گەورەدا بەدانیشتوانە بەوەفاکەی شادبۆوە زۆر لەشاعیرە نیشتیمان پەروەرەکان شیعریان بۆ شێخ ووتووە وەك دەربڕینی سۆزو وەفا.

**حەمدی ساحێبقران دەڵێ:**

**کەڕۆیشتی بەجارێ دڵ و جەرگ و هەناوم کەوت**
**کەچویتە تانە تانە سەر گلێنەی هەردوو چاوم کەوت**
**ئەڵێن هاتویتە کوێت بلێ قوربانی کوێتی کەم**
**کەنۆبەت بەرسەری ئەحسی شکاوی بێ کڵاوم کەوت**

**یان بێخودی شاعیر دەڵێ:**

**واتێ مەگە دورم لەتۆ ئەی ساحێبی خاتەم**
**هەر هود هودەکەی بەزمی سلێمانی کووەیتم**
**خەڵکینە لەبەر گەوهەری تاجی سەری کوردە**
**قوربانی موحیتی عەرەبستانی کووەیت**

**ناری شاعیریش دەڵێت :**

**مژدە ئەی ئەهلی موحیببەت شاهی جانی هاتەوە**
**حوجەتی موڵك و نیشاطی جاویدانی هاتەوە**
**تا نەبێ بێ نازو جیلوە خانەدانی ئەحمەدی**
**جیلوە بەخشی حوسنی باغی دوودەمانی هاتەوە**

هەر بەهاتنەوەی شێخ مەحمود گۆرانکارییەکی گرنگ هاتەکایەوە و خەڵکی بەجۆش و خرۆشەوە چاوەڕوانی فەرمانی حوکمداری کوردستان بوون لەڕۆژی 10ی تشرینی یەکەمدا بۆئەم مەبەستە فەرمانی ژمارە یەکی حوکمداری کوردستان بلأوکرایەوە:

(مووەفەقەن هاتوومەتەوە لەئیمرۆوە دەستم کرد بەتەدویری پەروانەی حکومەت و موحافەزەی مەوجودیەت و ئیستقلالیەتی کوردستان)

**حوکمداری کوردستان**

**مەحمود**

هەروەها شێخ مەحمود لە10ی تشرینی دووەمی 1922دا بەناوی (تەشکیلاتی حکومەتی کوردستان)ەوە کابینەیەکی دامەزراند لەناوەڕاستی هەمان مانگدا ناوی خۆی بە (مەحمود- مەلیکی کوردستان)نیشان دا(84).

**بۆ جاری یەکەم تەشکیلی یەکەم کابینەی حکومەتی کوردستان کرا وەزارەتەکان بەم شێوەیە بوو:**

| | |
|---|---|
| 1-شێخ قادری حەفید | سەرۆك وەزیران |
| 2-عبدالکریمی عەلەکە | وەزیری دارایی |
| 3-مستەفا پاشای یامولکی | وەزیری فەرهەنگ |
| 4-شێخ حمە غەریب | وەزیری داخلیە |
| 5-صالح زەکی صاحێبقران | وەزیری هێزی میللی |
| 6-ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ | وەزیری گومرگ |
| 7-حمە ئاغای ئەورەحمان ئاغا | وەزیری نافیعە |
| 8-سەید ئەحمەدی بەرزنجی | سەرۆکی ئەمنی عام |
| 9-شێخ علی ئەفەندی قەرەداغ | وەزیری شەرع و عەدل |
| 10-سدیق القادری پاشا | موفەتیشی گشتی |

دوای ئەم تەشکیلاتە ئیتر حکومەت وورده ورده دەستی کرد بەکارەکانی و پولی پۆستە دانراو هەر وەزیرو بەرپرسێك بۆ کاری خۆی دەستنیشان کرا دەیانزانی کاریان چی یە ئەوەندە هەبووە کەئەم حکومەتە سنووری دەسەڵاتەکەی تەنها شاری سلێمانی و چواردەوری بووە بەڵام شێخ مەحمود ئارەزوویەکی تری هەبووە کەئەویش سەربەخۆیی کوردستان بوو(84). پاشان شێخ مەحمود کەوتە داواکردنی هەموو شارە کوردی یەکانی تر و ئەیویست هەمووی بخاتە سەر دەسەڵاتەکەی و لەژێر ئاڵای کوردستاندا بن.ئۆزدەمیریش هەوڵی ئەدا خۆی لەشێخ مەحمود نزیك بکاتەوە.لەو سەردەمەدا(مێجەرنوئێل)وەك راوێژکاری شێخ مەحمود وەکیلی مەندوبی سامی بەریتانیا لەسلێمانی بوو هەستی کرد کە ئۆزدەمیر نوێنەری ناردۆتە لای شێخ مەحمودو شتێك لەکایەدایە و لەسلێمانی بیرورای جیاواز هەبوو هەندێك لەگەڵ شێخ مەحمودو هەندێك دژی راوبۆچوونی شێخ بوون.شێخەکانی بەرزنجە وەك خزمایەتی لەگەڵ شێخ مەحمود دا ئەیانویست هەرچی ئیش و کارهەیە لەدەستی ئەواندا بێ و خوازیاری ئەوەبوون دەسەڵاتی تەواویان بەسەر حکومەتدا هەبێت تاوای لێهات کەس نامەی کەسی نەئەخوێندەوە.بەڵام رۆشنبیرەکان و ئەوانەی کەسەریان لەسیاسەت دەرئەچوو لەو باوەڕەدا بوون کەسیاسەت و خزمایەتی لەیەکەوە دوورن.بڕوایان وابووکە لەکوێ وە سودی هەبوو بۆکورد ڕوو لەوێ بکرێ و بەرژەوەندی وڵات پێش بەرژەوەندی تاکەکەسی یە.تێکچوونی دەوڵەتی عوسمانی و هاتنی ئینگلیز بۆ ناوچەکەو دامەزراندنی یەکەم کابینەی حکومەتی کوردی بەپشتی ئینگلیز بەپێویستی یان ئەزانی ڕوو لەئینگلیز بکرێ چاکترەو بەسوودترە.بەڵام بەپێچەوانەوە هەندێکی تر ڕایان وابوو کەدەبێ ڕوو لەتورك بکرێ لەبەرئەوەی حکومەتی تورك ئیسلامەو ئەبێ کورد لەژێر فەرمانی خەلیفەدا بێ.شێخ مەحمودیش پیاوێك بوو لەچاکە زیاتری هیچی تری نەدەویست بۆخەڵك لەڕەوشت و هەڵسوکەوتدا ئەوپەڕی دیموکراتی پەیرەو دەکرد هەموو کەس ئەیتوانی شێخ مەحمود ببینێ و شێخ مەحمودیش هەمیشە لەناوخەڵك دابووە جا پیاوێکی وەکو شێخ مەحمود لەناوشەپۆلی ئەم هەموو بیرورا جیاوازەدا ئەبێ چی بکات؟چۆن سەردەرکاو

چۆن بگاتە ئەو ئامانجەی کەچەند ساڵ بوو خەباتی بۆ کردبوو تاقەناعەتی بەکۆمەڵێك دەکرد کۆمەڵێکی تری لێ ڕاست دەبۆوە .مێجەرنوئێل زۆر کۆششی کرد کە مەلیك مەحمود لەهەندێ بیروڕا پاشگەز بکاتەوە و نەکەوێتە داوی فروفێڵی ئۆزدەمیرەوە بەڵام بەپێی نوسینەکانی علاء الدین سوجادی بێ هیچی کەڵکی نەبووە.ئەمەش وای لەشێخ مەحمود کرد(چەپەن)بکات بە وەکیلی خۆی لەسلێمانی خۆشی سلێمانی بەجێهێشت .بەڵام شێخ مەحمود کەوتبووە نێوان دوولایەنی دژیەیەك هەرلایەکیان لەڕێی پیاوەکانیانەوە دەیانویست حکومەتەکەی شێخ بۆخۆیان و بەرژەوەندی یەکانیان بەکاربهێنن لەگەڵ ئەوەشدا هیچیان خێریان بۆ کورد نەبوو.خۆ ئینگلیزەکان نەهاتن پاڵپشتیەکی ڕاستەقینەی شێخ بکەن تاوەك فەیسەڵ بیکەنە ئەو حکومەتەی کەلەعێراق دایانەزراند خۆیەکەم کابینەی حکومەتی عێراقی بەسەرۆکایەتی عبدالرحمان گەیلانی نەقیب.لە 1920/11/11تا 1920/11/20 بەردەوام بوو واتە 9ڕۆژ دوای ئەوە بەپاڵپشتی ئینگلیزەکان کابینەکە درێژەی کێشا ئینگلیزەکان ڕێ و شوێنیان بۆ دانان وچونکە مەبەستیان بوو. بەڵام لەکوردستان تەنیا کاتیان بە شێخ مەحمود بەسەر ئەبرد و مەبەستیان نەبوو شتێك بۆ کورد بکەن و دەیانویست لەگەڵ ئەوەشدا شێخ مەحمود وەکو پیاوی خۆیان بەکاربهێنن بەڵام شێخ مەحمود ئەمەی قبوڵ نەدەکرد و ناچاریش بوو ڕوو لەتورك بکات تورکیش لەناوچەکەدا هیچ دەسەڵاتی نەبوو تەنها دەمی پیاوەکانی نەبێ.بۆیە شێخ مەحمود ناچاربوو سلێمانی جێبهێڵێ هەر لەوسەردەمەدا لەسلێمانی دا دووپارتی سیاسی هەبوون بەناوی :

1–پارتی نیشتیمانی کوردی

2–پارتی ئیسلامی کوردی

پارتی ئیسلامی کوردی دژی ئینگلیز بوو حەزی دەکرد لەگەڵ تورك دا ڕێك بکەون بەمەرجێك دان بەسەربەخۆیی کوردستاندا بنێن بەڵام لەنەخشەکەدا سەرنەکەوتن داخوازیەکانیشی بۆ سەربەخۆیی کوردستان جێ بەجێ نەبوو.ئەم پارتە ئەندامەکانیان زیاتر لەعەشایەرو پیاوانی

ئایینی بوون ژمارەیەك ئەفسەری کوردی نێوسوپای تورك و دۆستی نزیك بەشێخ مەحمود بوون لەوانە(عەباس محمود ئاغا،سەید عبداللەی حاجی سید حەسەن و ،سەید محمدی مفتی،کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند،ئەحمەد بەگی سەعید بەگ،ئەحمەد تەقی تاهیر ئەفەندی،ئەمین ئەفەندی)پارتی نیشتیمانی کوردیش کەشێخ لەتیف ناوی نەهێناون ڕەنگە هەر منەوەرەکان بووبن کەئەمانیش کۆمەڵێ خەڵکی ڕۆشنبیرو ئاگادار لەسیاسەتی دنیابوون . کردەوەو خواستەکانی شێخ مەحمودیش لەگەڵ ئۆزدەمیر بەهۆی هەولەکانی تورك خوارەکانەوە هەر زیادی ئەکرد ئەم زیادکردنەش ئینگلیزەکانی توورەکردبوو بەتایبەتی (چەپمەن)ئەویش کەوتەخۆو دەستەو دائیرەیەکی بۆ خۆی دروست کرد هەولی دا بۆ ڕووخاندنی حکومەتەکەی شێخ مەحمود تەنانەت وای لەشێخ مەحمود کرد کەبیر لەپەلاماردانی کەرکوك بکاتەوە و سەرۆکی عەشیرەتەکانی کۆکردەوە و کەوتە گفتو بەڵام وەك ووتمان هەندێك بەپێچەوانەی شێخ بیریان دەکردەوە ئیتر ئەمە ڕووی نەدا. لەگەڵ ئەوەشدا شێخ مەحمود هەنگاوی بەرەو پێشەوە دەنا حکومەتی ڕاسپارد کەزمانی کوردی زمانی فەرمی بێت دەستکرا بە ڕێکخستنی پرۆسەی خوێندن هەردوو ڕۆژنامەی بانگی کوردستان( ندله کوردستان)تاماوەیەك بڵاودەبوونەوە.دوای ئەمەش ئەم ڕۆژنامانە دەرچوون(ئومێدی ئیستیقلال)(أمل الاستقلال)(ڕۆژی کوردستان)(شمس الکردستان)لەکۆتایی ساڵی 1922حکومەتی شێخ مەحمود نوێنەری خۆی نارد بۆ بەغداد بۆ ووتوێژ دەربارەی ئەو بابەتانەی تایبەتن بەبەڕێوەبردنی خۆجێ یەتی کورد بەڵام لایەنی ئەنگلو عێراقی زانی کە ئەو بابەتانەی کەتایبەتن بەبەڕێوەبردنی سەرکردە کوردەکان دەربارەی بەڕێوبەرێتی خۆجێ یەتی کەداوای دەکەن زۆر زۆرەو ئیتر ووتوێژو دانوستانەکان گەیشتنە بن بەست(86).بەهەمان شێوە لەڕۆژهەڵاتی کوردستانیش پیلانەکان بەردەوام بوو بۆ لێدانی شۆڕشی ڕەوای کوردستان و کۆتایی هێنان بەو بەربەستەی کەڕێگر بوو لەمەرامەکانیان بۆئەم مەبەستەش پەنایان بۆ وولاتانی زلهێزی تر دەبرد بۆ هاوکاری کردنیان تابتوانن سەرکەوتن بەدەست بهێنن.ڕێکەوتنی(سۆڤیەت و ئێران)(87). سەرەتایەك بوو بۆ کۆتایی هاتنی کاری

سمکۆ.شای ئایندەی ئێران ئیتر هەموو هەولێکی خۆی بۆ ئەو کارە تەرخان دەکات کەلەئەستۆی گرتووە.کەبریتی یە لەوەی هەموو تیرەکان بێنێتە ژێر دەسەلأتی ناوەندی و چەك کردنیان و تێك شکاندنی هێزو توانای سەرانی تەقلیدی ئەو تیرانە ڕەزاخان لەمانگی 1921/1وە سوپا تازە دەکاتەوە پرچەکی دەکات هێزی قوزاق و هێزی ژەندرمەو هێزە ناوچەیی یەکان کەئەو کاتە بریتی بوون لەیەکەی جۆراوجۆرو سەریەخۆ و ڕەزاخان توانی یەکیان بخات و بەڵێنی دابوو کەکۆتایی بەسمکۆ بهێنێ پێی وابوو سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی سمکۆ زیاتر لەبێ توانیی فەرماندەکانی ناوچەکەوە بووە لەبری هێزی گەورە هێزی بچوکی یان ناردۆتە شەڕی سمکۆ ئەویش یەك لەدوای یەك تێکیشکاندون.

ابراهیم خواجە نوری لەکتێبەکەیە(114) دەنوسێ.

ڕەزا شای گەورە بۆ ئەوەی دەسەلأتی دەولەت پیشانی خەلکی ناوچەی ئازەربایجان بدات ڕۆژێك لەسالی 1304(کەدەکاتە (1925–1926زایینی)دا لەڕێگەی تەورێزەوە لەگەل ئەو هێزەی کە هەبوو چوو بۆ (سەرەند)(خۆی)و (ماکۆ)لەوێوە بەرەو شاپور ڕۆیشت.(ئەوبەروارەی کە ئیبراهیم خواجە نوری نوسیویەتی هەلەیە بەلکو ئەو سەردانەی ڕەزاخان بۆ لای سمکۆ سەرە تای سالی 1922 بووە ) بەر لەوەی بگاتە ئەوێ داوا لەسەرۆك عەشیرەتەکان کرابوو کەپێشوازی لەسەرداری سوپا بکەن لەو ڕۆژانەدا عەبدوللای تهماسپی لێپرسراوی سەربازی تەورێز بووە ئیسماعیل ئاغا(بەخۆی 1200 سوارەوە گەیشتە (میانجق)وچاوەڕوانی گەیشتنی سەرداری سوپای دەکرد.سمکۆ سوارەکانی خۆی کردبوو بەسێ بەشەوە .بەشی یەکەم ئەو سوارانەبوون کە هەموو ئەسپەکانیان سپی و.بەرگەکانیشیان ڕانگ و چۆغەی سپی بوو دەستەی دووەم ئەسپەکانیان (سور)و سوارەکانیش بەرگەکانیان سور بوو دەستەی سێ هەم ئەسپەکانیان ڕەش و سوارەکانیشیان ڕانگ و چۆغەی ڕەشیان لەبەردابوو.

سمکۆو سەرکردەی عەشایرەکان ڕانك و چۆغەی شێروانیان لەبەردابوو کە ڕەزا شاو سمکۆ یەك ئەبینن.ڕەزاشا لەئوتۆمبیلەکەی دێتەخوارەوە و سوارەکانی سمکۆ بەو شێوەیە ئەبینێت

کەهەریەکەیان جۆرە شەدەیەکیان بەستووە پشتێن لەقەدو دەمانچە بەلایدا شۆڕبۆتەوە لەدڵی شاو لەسەر لێوو ڕوخسار یان نیشانەی ڕق و پەستی ئەبینرا.

ڕەزاشا لەو دیمەنە تەواو نیگەران بوو ڕوو ئەکاتە عەبدوڵلای تهماسپی و ئەڵێ ئایا ئەمانە هەر ئەو کوردانە نین کەکاتی خۆی خەنجەرەکانیان لەپشتێنەکانیان دەرئەهێناو پرچی ژنان و کچانیان پێ ئەبڕی و خەنجەرەکانیان ئاراستەی سنگی پیاوەکانمان دەکرد؟

ڕەزاشا وسمکۆ بەیەك ئەگەن سمکۆ لەئەسپەکەی دێتە خوارەوەو سڵاو بۆ ڕەزاشا دەکات.ڕەزاشا دەڵێ:ئەو کارە بێ بەزەیی و دڵڕقانەی تۆکردوتە لەمێژوودا وێنەیان نیە.بەلام مادام لەلایەن سەردارانی سوپاوە دڵنیاکرابووە پێی ووت کە هیچت لێ ناکرێ و بەمەرجێك واز لەکردەوەکانی پیشووی بهێنێت.

کەڕەزاشا چوو بۆ ئەو ناوچەیە تەنها (42)نەفەری لەگەڵدابوو.لەکاتێکدا سمکۆ (1200)چەکداری لەگەڵدابوو.هەروەکو ئاغای (ڕەزا ڕەفیع)ووتویەتی سمکۆ نزیکی چوار هەزار چەکداری تریشی لەدوورەوە لەو دەوروبەرانەدا کۆکردبۆوە سەرداری سوپا زۆر بەسارديەوە لەگەڵ سمکۆدا جوولایەوە و بڕیاریاندا کەڕووبکەنە (کۆنەشار)سمکۆ شوێنێکی ئامادەکردبوو کورسی و مێزی لێ دانابوو هەتا ڕەزا شا ئیسراحەت بکا. ڕەزاخان لەسەر کورسی یەك ڕووبەڕووی سمکۆ دانیشت.سەرداری سوپاو هاوڕێکانی ترسی ئەوەیان لێ نیشت کەچەکدارەکانی سمکۆ لەناکاو پەلاماریان بدەن.

دوای نان خواردن لەهەمان شوێندا چەند ژوورێك بۆ ئیسراحەت ئامادە کرابوو.هەرکەسەو چووە ژوری خۆی.یەکێك لە ڕەوشتەکانی(خان) ئەوە بوو هەموو شەوێك دەست و قاچی دەشت ئەوسا ئەچووە ناو جێگاو ئەنووست بەلام بە(ڕەزای ڕەفیعی) دەڵێ من لەم کابرا دڕندەو بەخوێن تینووە دڵنیانیم چونکە هەر ئامازەیەکی بچووکی ئەو بەسە بۆ ئەوەی کارەساتێکی جەرگ بڕمان بەسەردابێت(ڕەزا رەفیع)پێی دەڵێ لەم ڕووەوە عەبدوڵلا تەهماسپی پێشبینی خۆی کردووە و هەمیشە لەگەڵیان ئاگاداری یەکترن.

بۆئەوەی سمکۆ بەشتێکەوە خەریك بکرێ ئاغای(بزورگ ئیبراهیمی)نائیبی یەکەم ڕاسپێردرا کەبەقسەوە خۆی لەگەڵ سمکۆ خەریك بکا بەیاری تاوڵەکردن لەگەڵیا شەو ببەنەسەر وابکا لەو یاری کردنەدا پارەشی پێ بدۆڕێنێ ئیبراهیم ناچاربوو تابەیانی بەتاوڵەکردنەوە سمکۆ بخلافێنێ بەیانی زوو سەرداری سوپا و هاوڕێکانی کەهەتا بەیانی چاویان نەچووبوە خەو لەترسا سواری ئوتومبیلەکەیان بوون و بەبێ ماڵئاوایی کردن لەسمکۆ کۆنەشاریان بەجێهێشت و ڕوویان کردە ورمێ و لەڕێگا خێرا لێیان ئەخوڕی و زوو زوو ئاوڕیان ئەدایەوە بۆئەوەی بزانن ئایا سوارەکانی سمکۆ دوایان نەکەوتوون. بۆ ئانەوەی هەرایەك یان نا.سمکۆ کاتێك بەخۆی زانی مەل لەقەفەز رایکرد ئەگەرچی هەزاران تمەنیشی بردبوەوە بەلأم لەو ماڵئاوای نەکردنە زۆر لای گران و زۆر پەست بوو.ئەوەندەی تر قینی بەدڵداچوو دژی دەوڵەت.

سمکۆ هەڵەیەکی مێژوویی کرد کە ڕەزاخان و هاوەڵەکانی نەکوشت کە دوای ڕۆیشتنیان ئینجا بیری کردەوە کەئەبوایە بیکوشتایە چونکە دوای ئەوە خودی خۆی چەند جار دەیوتەوە کەمادام من ڕەزاخانم نەکوشت سەرئەنجام ئەو من دەکوژێت.یەکێکی تر لەخەسڵەتەکانی عەشیرەتی شکاك ئەوەیە دوای دوژمنی هەلأتوو ناکەون ئەگەر سەیری گشت شەرەکانی سمکۆ بکەین هیچ کاتێك دوای لەشکری بەزیوو نەکەوتوون دەنا ئەگەر سمکۆ بیویستایە ئەیتوانی هەر بەسوارەکانی پێش لەڕەزاخان و هاوەڵەکانی بگرێ چونکە سوارچاکی و شارەزایی شکاکەکان بێ وێنەبووە. بەلأم وەکو باسمان کرد شکاك دوای کەسانی هەلأتوو ناکەون.

# (شەڕی میاندواو)

ژەنەڕاڵ شەیبانی لەمانگی نیسانی 1921دا پێنج سەد چەکداری پێشووی شۆڕشگێڕانی گەیلانی بەسەرۆکایەتی خالۆ قوربان لەمیاندواو کۆکردەوە تالەوێوە پەلاماری مەهاباد بدات و لەو کاتەدا هێزەکانی سمکۆ لەبەرەبەیاندا هێرش دەکەنە سەریان و چەکدارانی خالۆ قوربان هەرزوو هەڵدێن و خالۆ قوربانیش دەکوژرێ.ئەم کارەش نزیکەی چەند مانگێك بەم شێوە دەمێنێتەوە ئیتر دوای تێکشکاندنی میاندواو خەڵکی عەشایەر خۆیان لەشەڕی کورد لائەدا.ڕەزاخان وەزیری جەنگی ئێران بەپاشکۆی عەسکەری ئینگلیز دەڵێ گیروگرفتی ئێمە تەنها نەبوونی پارەیە.ئەگەر بەئەندازەی پێویست پارەمان هەبێت دەتوانم لەماوەی چەند هەفتەیەکدا  سمکۆ تەفرو تونا بکەم.

سمکۆش لای خۆیەوە ناتوانێ سود لەم وەزعە وەربگرێ کەبۆی ڕەخساوە ئەویش کەمی تەقەمەنی تەنگی پێ هەڵچنیوە جگە لەکێشەی ناوخۆیی کەنەیئەتوانی زیاتر دەسەڵاتی خۆی لەباشوردا پەرە پێ بدات.سمکۆ لەحوزەیرانی 1922دا لەشەمزینان لەگەڵ حیدر بەگی والی جارانی موسڵ کەسەرۆکی شاندی تورك دەبێت یەکتر دەبینن ئیتر ئەم دیدارە تەواو دەسەڵاتداری ئینگلیزەکانی عێراقی سەغڵەت کردبوو.لەمانگی تەمووزی 1922دا هێزەکانی تاران گەیشتنە ناوچەکەو لەگەڵ هێزەکانی دیکەی ئێران یەکیان گرتوە بەفەرماندەیی جیهانبانی*و تیپێکی تەورێز کەپێکهاتبوو لەچەند یەکەیەکی لە شکری ئازەربایجان و بەتالیونێکی خۆبەخشی ئەرمەنی بەفەرماندەیی سەرهەنگ بەگ زۆرابوفی ئەفسەری جارانی تەزاری بەهەرحاڵ ئەو 8000چەکدارەی ئێران لەئامادەباشیدابوون بۆ هێرش بردن.

..............................................

*ژەنەڕاڵ ئامان الله خانی جیهانبانی یەکێکە لەئەفسەرە هەرە بەئەزمون و بەتواناکانی سوپای ئێران لە ڕوسیا خوێندنی تەواوکردبوو بەفەرماندەی ئەو هێزە گەورەیە دیاری کرابوو.

# (شەڕی شەکریازی)

لە1922/7/23 هێزەکانی ئێران ئامادەی هێرش بوون(88) بەڵام بە پێچەوانەوە پێش قەرەوڵەکانی کاروانە کە لەکاتژمێرەشتی بەیانی کەوتنە بەر پەلاماری هێزەکانی سمکۆ ئەو کاتە نزیکەی دەهەزار چەکداری عەشایەری
دەبوو لەمهابادەوە تا(قتور)لەژێر فەرمانیدا بوو ژمارەیەکی کوردی تورکیاشی لەگەڵ دابوو سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە کوردەکان چوار جار هێرشیان کردە سەر هێزەکانی ئێران و توانیان لەباسکی باشوری (بوزداغ)خۆیان بگەیەننە پێش قەرەوڵەکان بەپێچەوانەی هێرشەکانی پێشوویان بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لەچەکەکانیان کەڵکیان وەرنەگرت ئەوجا بە خەنجەر شەڕیان لەگەڵ کردن ئەم جۆرە پەلاماردانە لەناو عەشیرەتەکاندا شتێکی نوێ بوو زۆرجار ناچاربوون پاشەکشە بکەن زیانێکی زۆر لەهەردوولا کەوت دوای ئەوە کوردەکان هەوڵیان دا بەسواری ئەسپ
هێرش بکەن بۆسەر باسکی ڕاستی یەکەکانی پێش قەراوڵ ویستیان بەناو دۆڵێکی پێنج میللی دا پەلکێشیان کەن و کە ئەوانەش پێش قەرەوڵەکانی تەورێزدا بوون بەو شێوەیە ویستییان مەبەستی خۆیان بەئەنجام بگەیەنن بەڵام
یەکەکانی سوارەی ئێرانی لەئەسپەکانیان دابەزیبون و لەسەنگەردابوون ئیتر کوردەکانیان ناچارکرد پاشەکشە بکەن لەنێویاندا تۆپخانەی کوردەکان کە تۆپچی تورکەکانیان لەسەربوو باش کاریان دەکرد.بەڵام گوللە تۆپەکان کەدەهاوێژران نەدەتەقینەوە ناچار کوردەکان تۆپخانەکانیان پێچایەوەو پاشەکشەیان کرد.سوارەی ئێرانی دوایان کەوتن و سێ تۆپی شاخاوی لێ گرتن و تۆپچییەکانیان بەدیل گرت دوایی ئەوانیان تەسلیمی دەوڵەتی تورکیا کردەوە.یەکەکانی سوپای ئێرانی چوونە ناو شاری سەڵماس و دانیشتوانی ئەوشارە لەچەند

هەزار کەسەوە هاتبووە سەر چەند سەدکەسێك هێزە دە هەزار کەسییەکەی سمکۆش هاتبووە سەر شکاکەکانی کەلەگەڵیا بوون ئەوانی تر کە هاوپەیمانی سمکۆبوون گەڕانەوە سەر کارەکانیان و ووتیان سمکۆ فریوی داوین و داوای لێبوردنیان کرد.

کریس کۆچێرا لەنوسیەکانیدا دەڵێ:هۆی تێکشکانی سمکۆ زۆری هێزەکانی و بالآدەستی هێزەکانی ئێران بوو،پاشان هێزەکانی ئێران بەرەو شاری ورمێ درێژەیان بەپێشڕەوی داو لەمانگی ئابدا چوونە ناو شارەکەوە پاش ئەوەی ماوەی چوار ساڵ لەژێر دەسەلآتی کورددا بوو دوابەدوای ئەو سەرکەوتنە هێزی ئێرانی بەرەو چەهریقی بارەگای سمکۆ بەڕێ کەوتن یەکەیەك لەو هێزانە چوونە سەر سنوور تاداوا لەتورکیا بکەن کە هەر چەکدارێکی سمکۆ لەسنوور پەڕیەوە چەکی بکەن.

# (شەڕی سەری تاش)

لەمانگی ئابی 1922دا هێزەکانی ئێران بەفەرماندەیی جیهانبانی عەمەلیاتی خێرای دەست پێکرد لەهەموو لایەکەوە شەڕ بەگەرمی هەڵگیرسابوو لەبەرزای یەکانی(قزل داغ)(89). یاخود سەری تاش شەڕێکی سەخت لەنێوان ستوونی هەنگەکانی گاردو هێزەکانی سمکۆ ڕووی دا هێزە کوردی یەکان توانیان کەرتەکانی ئەو هێزە لەیەك دابڕن و درزێکی گەورە بخەنە ڕیزەکانیانەوە جیهانبانی ستوونی سواری وەك هێزێکی احتیاط بۆ ڕووداوی کتوپڕ لەبەردەستی خۆیا گل دابووەوە. دەست بەجێ فەرمانی دا بەهێزی احتیاط ئەو کەلێنەی کوردەکان کردبوویانە هێزەکانی گاردەوە پڕیکەنەوە.تێکهەڵچون شەوڕۆژێکی خایاند هێزەکانی کورد لەوە زیاتر بەرەنگاریان پێ نەکراو بەتێکشکاوی کشانەوە سەلماس و چەهریق هێزەکانی ئێران نەیانهێشت هێزەکانی کورد ماوەی خۆڕێکخستنەوەو خۆکۆکردنەوەیان هەبێت لەبەرئەوە جیهانبانی فەرمانی دواکەوتنی هێزی کوردەکانی دا .لەپاش دووڕۆژ بەرهەڵستی کوردەکان (سەڵماس)یان بەرداو بەرەو چەهریق کشانەوە سەرتیپ جیهانبانی بۆئەوەی ئەو سەرکەوتنەی بەدەستی هێنابوو بیقۆزێتەوە.نەهێڵێ هێزەکانی دوژمن فریای پشودان و خۆڕێکخستنەوە بکەون فەرمانی بەهەموو هێزەکان دا هەل لەدەست نەدەن و هەموو هێرش بەرن بۆسەر چەهریق هێزەکانی ئێران لەپاش برینی 8فرسەخ ڕێگەی سەختی شاخاوی قۆناغ لەدوای قۆناغ بەرهەڵستی پچڕ پچڕی شۆڕشگێڕانی کورد تێك بشکێنن و بگەنە داوێنی قەڵای چەهریق و گەمارۆی بدەن لەڕۆژی 20ی مردادی 1301مانگی 1922/9قەڵای چەهریق یان گرت و هێزەکانی سمکۆ بەتێکشکاوی کشانەوە ناوخاکی تورکیا.

جهانبانی مژدەی ئەم سەرکەوتنەی بە بروسکەیەك دا ڕەزاخان:

لە چەهریقەوە :ژ641

مەقامی مەنیعی بەندەگانی حضرە تی اشرەف وەزیری جەنگ و فەرماندەی گشتی قشون دام عظمتە :

بەدوای راپۆرتی ژ171 بەعەرزی حضوری موبارەك ئەگەیەنێ هێزەکانی ئێمە بەدوای دوژمنەوە ئەمرۆ 20هەمی بورجی ئەسەد سەعات 11ی بەیانی قەلآی (چەهریق)ی گرت و ئەو تۆپ و موسەلسەلانەی لەماوەی رابردوودا لەهێزەکانی دەولەتی گرتبوویان.دەستمان کەوتەوە دوژمن بەلێقەوماوی رای کردو موتەواری بوو هێزەکانی ئێمە بۆ راونانی بەخێرایی لەپێشرەوی دان .

فەرماندەی هێزەکانی ئازەربایجان
سەرتیپ ئامان الله

دوای ئەوەی سمکۆ لە شەڕی دژ بە ئێران دا شکستی خواردوو نەچووە ناو خاکی تورکیاوە بەڵکو لە هەندێ ناوچەی سنووریی دا دەیویست رۆژگار بە سەر ببات بەلأم تورکە کەمالییەکان هەتا سەر پابەند نەبوون بە بەلێنی پێشکەش کردنی یارمەتی بۆ کوردەکانی ئێران بەڵکو لە دژوارترین هەلومەرجدا ناپاکی یان لەگەلْ سمکۆدا کرد وەك پێشتر باسمان کرد* تەنانەت هەولی لە ناو بردنیشیان دا کاتێ کە لە سنوورەکانی تورکیادا نزیك کەوتەوە ئەویش بە ناردنی هێزێك کە بە نهێنی دزەی کرد بۆ ئەو شوێنەی کە سمکۆی لێ بوو ، چونکە سمکۆ زۆر دلْنیا بوو لە تورکەکان ، بەلأم لە شەبەیخونێکی نامەردانەدا توانیان چەند کەسێك لە چەکدارانی بکوژن و

* بزافی رزگاری خوازی نیشتمانی لە کوردستانی رۆژهەلات ، ل84 ، د. سەعدی هەپوتی .

خەسرەوی کوڕیشی کە منداڵ بوو بە دیل بگرن و جەواهیر خانی خێزانی سمکۆش شەهید بوو موعتەبەر خانی خێزانی دووەمی سمکۆش دەست بەسەر دەکرێ لای تورکەکان . بە دەرباز بوونی سمکۆ لەو شەبەیخونەدا تەواوی پیلانە گلاوەکەیان شکستی خوارد ، لەگەڵ ئەوەشدا خێزانی سێهەم و چوارەمی سمکۆ بە ناوەکانی نازدار خان و زارا خان ، دەربەدەر بوون لەگەڵ منداڵەکانیاندا ، کەبریتی بوون لە قوباد خان . تاهیرخان ، هەدیە. فاتمە. ماسیا ، هندە، سەفیەو سورمێ و جگە لە بابە خان کە ئەو کاتە لە دایك نەبووە هەروەها خەسرەویش کە دیل بوو لای تورکەکان .

هەرچی سامان و زێڕی هەبوو هەمووی کەوتە دەست تورکەکان ، ئەمەش ڕووی ڕاستەقینەی تورکەکانی زیاتر دەرخست کە ناکرێ باوەڕیان پێ بکرێت سمکۆش بە ناچاری ڕووی لە باشووری کوردستان کرد .

موعتەبەرخانم خێزانی سمکۆ تەلگرافیك بۆ کمال ئەتاتورك دەنێرێ . بۆ ئەنقەرەو دەڵێت : ( دەوڵەتی تورکیا لە ڕێگای فەرماندەیەکی سوپای تورکیاوە بە ناوی ( جاوید بەگ ) کە ئێستا نوێنەرە لە پەرلەمانی تورکیا چەك و تەقەمەنی داوە بە سمکۆ بۆ ڕێکخستنی ڕاپەڕین دژی دەوڵەتی ئێران . ئێستاش دوای تێکشکانی سمکۆ لە ئێران تورکیاش دوایین زەبری لێدا . بۆیە ناچار بوو هەڵبێت و پەنا بباتە بەر کێوەکان . لە وەڵامی ئەم تەلەگرافەدا ئەنقەرە دوو سەد لیرەی زێڕیان بۆ ناردووە و خەسرەوی کوڕی سمکۆش لەگەڵ دوو خزمەتکاری لە شاری (قامیش)ە لە 1922/12/12 دەنێرنە ( قەرەگیسار ) بۆ لای ( موعتەبەرخانم ) کە نامەی فەرماندەی هێزەکانی تورکی لە شاری ( قامیش ) ی پێ دەبێت لەم نامەیەدا بە ژنی سمکۆ ڕادەگەیەنێت کە سمکۆ دەکەوێتە بەر لێبوردن ئەگەر خۆی تەسلیمی تورکیا بکات ، دەوڵەت دەستور دەدات ئەو ماڵ و سامانەی لەلایەن تورکانەوە لەم شەڕانەی دواییدا دەستی بە سەردا گیراوە پێ ی دەدرێتەوە ، لە نامەکەدا داوا لە موعتەبەرخانم دەکات سمکۆ ئاگادار بکات و ئەم پێشنیارە پەسەند بکاو پێی بڵێ چارەنووسی ژن و کوڕەکەی بەوەوە بەستراوەتەوە ) .

سمکۆش لە باشوری کوردستان بەدوای پشتگیری یەکی ئینگلیزەکاندا دەگەڕێ تا بەهۆی ئینگلیزەکانەوە بتوانێ بە هێزەکەیەوە بگەڕێتەوە بۆ ناوچەکەی خۆی و شەڕ دژی ئێران ڕا بگەیەنێتەوە لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکانی کونسوڵی سۆڤیەتدا لە ئەرزڕووم هاتووە لەسەرزاری خالید بەگی جوبرانلی کە یەکێك بووە لەسەرکردەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازی باکووری کوردستان دەڵێ : بزوتنەوەی کورد لە ژێر دروشمی کوردستانی ئازاد و سەربەخۆدا بووە لەسەردەمی مستەفا کمال داو لە ساڵی ( 1918 ) دا کاتێك بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی ئەنادۆڵ دەستی پێ کرد بەشێك لە ڕوناکبیران بە دانانی مەرج بۆ پێك هێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان چوونە ڕیزی ئەو بزوتنەوەیەوە .

لە کۆبونەوەیەکی ڕێبەرانی بزوتنەوەکە لە ئەرزڕووم بڕیاریان دا یارمەتی شۆڕشگێڕانی تورکیا بدرێت و ئەگەر دەوڵەت دان بەسەربەخۆیی گەلی کوردا نەنێت هەوڵ بدرێت لە هەموو ناوچەکانی کوردستانیش ڕاپەڕین دەست پێ بکات ئەم بڕیارە بە یەکێك لە سەرکردەکانی کورد بەناوی سمکۆ سپێردرا کە جێ بەجێی بکات لەم کاتەدا لە ژێر کاریگەرێتی دەنگو باسی شۆڕشەکانی تورکیاو ڕوسیا ژمارەیەك لە کوردەکان لە دوودڵی دا بوون بە پێچەوانەی بڕیاری لە سەردراو و کۆبوونەوە نهێنی یەکەی ئەرزڕوم کە پێکەوە لە گەڵ شۆڕشگێڕانی تورك هەنگاو هەڵگرن سمکۆ بڕیار دەدات پێشنیاری ئینگلیزەکان سەبارەت بە یارمەتی دانی بۆ گەیشتن بە کوردستانی سەربەخۆ و ڕزگاربوون لە دەست زوڵم و زۆرو دیکتاتۆریەت پەسەند بکات پاشان دوای چەندجار ووتوویێژ لەگەڵ فەرماندەی سوپای تورك و ڕوونکردنەوەی دەوری ڕاستەقینەی ئینگلیز کوردەکان بە سەرۆکایەتی سمکۆ لە ئێران ڕاپەڕین. بۆ جێ بە جێ کردنی دوو ئەرك :

یەکێکیان ڕزگار بوون بوو لە دەست ڕژێمی ئێران و دووەمیان جێ بەجێ کردنی ئەو ئەرکە بوو کە تورکەکان نەخشەیان بۆ کێشابوو ئەویش تێکدانی ئەو دەستە چەکدارە ئاشووری یە بوو کە ئینگلیزەکان پێکیان هێنابوو. بۆ جێ بەجێکردنی ئەرکی دووەم سمکۆ لە بەرامبەر سوپای ئێراندا بە سەختی شکاو کشایەوە بۆ ناو خاکی تورکیا لێرەوە خالید بەگی جوبرانلی دەڵێ:

ئەگەر سمکۆش بکوژرێ ئەوا بیری سەربەخۆیی کوردستان هەر دەمێنێت بۆیە لە ڕێگای کۆمیتەکانی باکووری کوردستانەوە هەوڵ دەدرا کە پەیوەندی یەکان لەگەڵ سۆسیالستەکانی تورك پەرە پێبدرێت کە لە بەرنامەیاندایە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان مسۆگەر بکەن ، چونکە کەمالیەکان لە کوردستان هەموو جۆرە چەکێکی نوێ یان بەکار هێناوەو هەموو ڕێگایەکی خوێنڕێژی و پیاو کوشتنی یان گرتۆتە بەر تا بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد خەفە بکەن بە تۆپ هەموو گوندەکانیان خاپور کردووەو دانیشتوانەکەی قەتڵ و عام کراون ، بێ ئەوەی جیاوازی لە نێوان چەکدارو بێ چەك و منداڵ و پیردا بکەن ، دەتوانین ئەم ڕاستیانە لەگەڵ ووتەکانی سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتەی تورکیا بەراوورد بکەین کە ( سیڤاس ) وتبووی ( لەم وولاتەدا تەنها ڕەگەزی تورك مافی ئەوەی هەیە داوای مافە میللی یەکانی خۆی بکات ) *

---

* بڕوانە کوردستان و شۆڕەکەی ، ل 75 ، د. جەمال نەبەز

# هاتنی سمکۆ بۆ باشووری کوردستان

دوای ئەوەی سمکۆ لەشەبەیخونێکی تورکەکاندا بەفەلاکەت لەگەڵ ئەحمەد ئاغای برای و دەستەیەك لەچەکدارەکانی دەرچوون و جەواهیرخانمی خێزانی شەهید بوو خەسرەوی کوڕیشی کەمنداڵبوو کەوتە دەستی تورکەکان بەناچاری ڕوویان کردە گوندی(دێرێ) لەسەروو شاری هەولێر.هەرچەندە پێشتر مستەفا پاشای یامولکی چووە لای سمکۆ لەمانگی تشرینی 1921دا بەمەبەستی ئەوەی بتوانێ کاریگەرییەکانی لەسەر سمکۆ دابنێ و خۆی لەتورکەکان نزیك نەکاتەوەولەگەڵ ئەوەشدا پشتیوانی خەڵکی باشووری کوردستانی پێ ڕاگەیاند و داوای لەسمکۆ کرد کەبزوتنەوەکەی گۆڕانکارییەکی گشتگیری بەبەردابکات و دورکەوێتەوە لەهەندێ داب و نەریتی خێڵەکی و بزوتنەوەکەش لەچوارچێوەی ڕێکخراوێکی سیاسی نەتەوەیی دا کۆبکاتەوە.بەڵام هێرشی بەربڵاوی ئەرتەشی ئێران ئەو بوارانەی نەدا ناچار بە پاشەکشەو هاتنە ناو سنووری تورکەکان کرا . پاشان بۆ باشووری کوردستان کە ئەو کاتە ئینگلیزەکان تەواوی عێراقیان داگیرکردبوو تەنها سلێمانی لەژێر فەرمانڕەوایی شێخ مەحمود دابوو. بۆیە تورکەکان دەیانویست ئاشووب بۆ ئینگلیزەکان دروست بکەن و هێزێکی بچووکی یان ناردبووە ناو ڕەواندوز بەمەبەستی گەڕانەوەی وویلایەتی موسڵ بۆ سەر تورکیا ئەمەش ئینگلیزەکانی نارەحەت کردبوو ئینگلیزەکانیش دەیانویست ویلایەتی موسڵ بخەنە سەر عێراق. مامەڵەی ئینگلیزەکان لەگەڵ تورك مامەڵەی هێزێکی سەرکەوتوبوو لەگەڵ هێزێکی شکست خواردووی دۆڕاو لەجەنگ دابوو بۆیە ئینگلیزەکان دەیانویست هاتنی سمکۆ بقۆزنەوەو والەسمکۆ بکەن کە بگەڕێتەوە و ئاژاوە لەناوچە کوردی یەکانی باکوری کوردستاندا دروست بکات یاخود بیکەن بەگژ ئەو هێزەی کە ئۆزدەمیر (محەمەد عەلی شەفیق)سەرکردایەتی دەکرد لەڕەواندزدا.

بۆ ئەم مەبەستە سمکۆیان بانگ کرد بۆ هەولێر. کە ئەو کاتە لەبەحرکە کە گوندێکی عەشیرەتی گەردی یە ماوەتەوەو میوانداریيان لێ کردووە.ئینگلیزەکان داوایان لەسمکۆ کرد سەردانی هەولێر بکات بەڵام سمکۆ نەچووەو لەبەحرکە مایەوە.ئەدمۆنس لەگەڵ کاپتن(لاین) بە فرۆکە چوونە کۆیەو لەرۆژی دواتر لەگەڵ ئەحمەد تەقی بەئوتومبیل دەچنە هەولێرو لەوێوە بۆ بەحرکە. ئەحمەد تەقی گفتوگۆکان بەمجۆرە دەگێڕێتەوە .سمکۆ( ووتی ئینگلیزەکان و تورکەکان هەردوولایان درۆمان لەگەڵ ئەکەن بۆ سەربەخۆیی کوردستان هەربەڵێن و قسەیەك دەکەن درۆ ئەکەن و هەڵماندەخەڵەتێنن ئینگلیزەکان دەیانەوێ هەموو کوردێك وەك نۆکەر ئیشیان پێ بکەن و وەك مەیمون هەڵمانپەرێنن بەکەیفی خۆیان و لای نەتەوەکەشمان شەرمەزارمان بکەن.لەکاتێکدا من لەشوێنی خۆم رامکردوو تورکەکان هێرشیان هێنایە سەرم و لەسەر قسەی سەید تەها من هاتم بۆ (دێرێ) لەلیوای هەولێر حاکمی سیاسی ئینگلیزەکان لەگەڵ سەید تەها هاتنە (دێرێ) بۆ دیدەنیم و دووروودرێژ قسەمان کرد پێم ووتن من کوردم و لێم قەوماوە و دوژمنی حکومەتی فارسم لەئێران ئەوا ئەمجارەش بوومە دوژمنی تورك و ژنیان کوشتم و کوریان بەدیل بردم ئێوەش.

گەلێ قسەتان کردووە لەگەڵ (کۆمەڵی کورد) لەئەستەمبولێ وەبەڵێنی زۆرتان داونەتێ هیچتان بەجێ نەهێناوە لەبەرئەوە کوردەکان لەگەڵ مستەفا کەمال رێکەوتن.ئێوەش لەباشوور حکومەتی شێخ مەحمودتان تێك داوە.

ئەوانیش ناچاربوون لەگەڵ کەمالیەکان رێك بکەون هاوکارییان کردن کە هاتن بۆ رەواندوز لەخوارووی کوردستان .ئێستاش من لەجیاتی هەموو کوردێك لەکوردستان پێتان ئەڵێم ئەگەر ئێوە ئامادەبن و راست ئەکەن و بەراستی بێنە پێشەوە بۆپێدانی سەربەخۆیی بەکوردستان من ئامادەم و بەڵێن ئەدەم کوردتان لەگەڵ رێك بخەم ئەگەر ئەمەش ناکەن داواتان لێ دەکەم یاریدەم بدەن بچمەوە جێگای خۆم یان بەشەر کردن لەگەڵ ئێران یان بەئاشت بوونەوە لەسەر بەڵێن و گفتی ئێوە).

حاکمی سیاسی ئینگلیز لەوەلأمدا ووتی جارێ حەزئەکەم بزانم ئێوە کۆچتان کردووە.چەند پارەتان پێویستە؟

سمکۆ وەلأمی دایەوەو ووتی هیچ جۆرە پێویستیەکمان نی یە من میوانی برا کوردەکانم تازە شێخ مەحمودی بەڕێز 500 لیرەی ئالتونی بۆ ناردووم.حاکمی ئینگلیز ووتی ئەی چۆنە لاتان کەسەید تەها بکەین بەحاکمی ڕەواندوزو حەریرو ئەحمەد ئاغای برات بەحاکمی بادینان؟سمکۆ لەم پرسیارەی حاکمی ئینگلیز زۆر دلگیر بوو ووتی من وسەید تەها کۆچەرین لە (دێرێ)دانیشتوین ئەم ناوچەیە لەگەڵ ئێوە لەشۆڕش دان من لەپێشەوە بۆم ڕوونکردنەوە ئەگەر ڕاست ئەکەن ئەبێ لەپێش هەموو شتێکەوە سەربەخۆیی و ئازادی کوردستان بخەنە پێش چاو. تەشکیلات و دانانی خەڵك ئەبێ بەپێی ئارەزووی دانیشتوانی وولأتەکەبێت نەك بەئارەزووی من و تۆ.لام وایە ئێوە نیازتان وایە بەقبوڵکردنی ئەم داواکردنانە ئێمە بکەن بەدوژمنی کوردەکانی خواروو و سووکمان بکەن لەناویانا بۆ لەبریتی پرسی دانانی حاکمێ بۆ ڕەواندوز و حەریر باسی تەرتیبات و تەشکیلاتی دامەزراندنی سەربەخۆیی کوردستان ناکەن و نوێنەر نانێرن بۆ لای شێخ مەحمود کەبەشدار ببێ لەم یەکێتی یەدا؟بەداخەوەو زۆر بەئەندێشەوە دەڵێم داواکردنەکانتان لەجێی خۆیدا نی یە.پاشان حاکمی سیاسی دوای بێ دەنگ بوون دەڵێ ئەو داواکاریانەی ئێوەش بەمن قبووڵ ناکرێ چونکە لەدەسەلأتی من دا نی یە بابچین بۆ هەولێر لەوێوە نوێنەری سامی بەغدا دەهێنین بۆ گفتوگۆکردن).

لەدۆکیۆمێنتی ژمارە*(Fo.731/5068)سالی 1922دا ڕاپۆرتێکی کاپتن های باسی چۆنیەتی هاتنی سمکۆ دەکات بۆ خوارووی کوردستان دەڵێ کاتێك سمکۆ لەشەڕەکانیدا لەگەڵ ئێران دا شکاو تورکەکانیش لەناو خاکی خۆیان ڕاویان نا.ئیتر بەناچاری ڕووی کردە کوردستانی عێراق بەهیوای ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا پەیدا بکاو بتوانێ بەهۆی ئەوەوە یارمەتی دەسگیربخات و پشتیوانی لێ بکرێ دەستی کرد بەپەیوەندی کردن لەهەمان سالدا ناوچەکانی خۆشناوەتی وسورچی ئالۆزبوو.

لەو ڕۆژانەدا سەید تەهای شەمزینی کە هاوکاری شێخ مەحمود بوو هاتبووە ناوچەکە پەیوەندی سەید تەها لەگەڵ ئینگلیزەکاندا باش بوو بۆیە ئینگلیزەکان بڕیان کردبۆوە کەسەید تەها لەجێگای شێخ مەحمود بکەن بەحوکمداری کوردستان و ڕەواندوزیش بخرێتە ژێر دەسەلاتی ئەو.بەڵام بەووتەکانی کاپتن (های) زیاتر دەرئەکەوێ کە سەرکەوتنەکانی سمکۆ ناوبانگی سەید تەهای کزکردبوو.کە سمکۆ هات بۆ ئەو ناوچەیە چوار ڕۆژ مایەوە لە (باداوە)لەماڵی مەلا ئەفەندی هەولێری.هەندێك باس لەچوونی سمکۆ دەکەن بۆ ناو هەولێر بەڵام سمکۆ داغڵ بەناو شاری هەولێر نەبووە هەر لەگەڵ مەلا ئەفەندی دا سمکۆ سەردانی کاپتن (های) کردبوو یەکیان بینی بوو (های) دەڵێ کە سمکۆهات بەنیازی ئەوەی بەپارەو سەرباز یارمەتی بدەین بۆ ئەوەی کوردستانێکی سەربەخۆ دابمەزرێنێ.سمکۆ ووتویەتی کە پروپاگەندەی بەریتانیا لەناوکوردستانی ئێراندا زۆر کزو بێ کاریگەرە بەپێچەوانەی پروپاگەندەو چالاکیەکانی تورکە قەومی یەکان). ڕاستە سمکۆ لەناچاریدا هاتە خوارووی کوردستان لەکاتێکدا سمکۆ لەشەڕەکانی ئێراندا شکستی خوارد بەو شکستەوە هاتە سنوورەکانی تورکیا و تورکەکانیش نامەردانە لەپشتەوە لێیان داو بێ ئەوەی ماندویەتی بحەوێتەوە ناچار کرا بێتە خوارووی کوردستان لێرەش ئینگلیزەکان دەیانویست بەهەر شێوەیەك بێت گۆڵمەزێکی بۆ دروست بکەن.تەنانەت کاپتن (لاین) لەیادەشتەکانیدا (کە دکتۆر یاسین سەردەشتی وەریگێڕاوە)دەڵێت ویستمان سمکۆ بنێرین بۆ موسڵ کە زۆربەی کارمەندو پاسەوانەکانی فرۆکەخانەی مووسڵ لەئاسووری یەکان بوون بەمەش ئەگەر سمکۆ بچوایە بۆ ئەوێ لەلایەن ئاسوری یەکانەوە

دەکوژراو ئێمەش بەم کارە دەمانتوانی دڵی چل هەزار ئاسووری بەلا ی خۆماندا ڕابکێشین لەلایەکی ترەوە سەرۆك وەزیرانی ئێران داوا لەئینگلیزەکان دەکات کەهەرچی چۆنێك بێت سمکۆ دەربکەن یاخود ئەگەر کەوتە دەست بەریتانیەکان ئەو ا بیگرن و ڕادەستی ئێرانی بکەنەوە (سێرپێرسی کۆکس)ی مەندوبی سامیی لەبەغداد لەگەڵ ئەوەدایە کەنابێ بەهیچ جۆرێك ماوە بەسمکۆ بدرێ کەکارێکی وابکات کەدژی حکومەتی ئێران بێت.

لەگـەڵ ئەوەشـدا ئینگلیزەکـان ئومێـدیان بـەسمکۆ هـەبوو ئەگـەر لەسـنووری ئێـران تورکیـادا پشـێوی دروست بکات دژی تورکەکان تا بەقازانجی ئینگلیزەکان بشـکێتەوە.کاتێکیش تورکـەکان(ئۆزدەمیر)یان نارد بۆ ڕەوانـدوز ئینگلیزەکـان بەرامبـەر بـەوە (عبـدالرحمن ئاغـای شـەرناخ)(92) یـان هانـدابوو دژی تورکەکان بجولێتەوە هـەروەك چۆن ئـۆزدەمیر لەڕەوانـدوز دەزگایـەکی تایبـەتی دامەزرانـدبوو هەنـدێ لەسەرۆك عەشیرەتەکانی خوارووی کوردسـتان کـە داخ لـەدڵ بـوون دژی ڕەفتـاری ئینگلیـزو ئەفسـەرە سیاسیەکانیان لـەخوارووی کوردسـتان بـەو جـۆرە عبـدالرحمن ئاغـای شـەرناخیش دام و دەزگایـەکیان دامەزراندبوو لەگەڵ ئەنجومـەنێك کاروبـاری ڕاپەڕینەکـەی ئـەبرد بـەڕێوە دژی کەمالیەکان.عبـدالرحمن ئاغا داوای لەئینگلیزەکان کردبوو بەپەلە لەزاخۆ کۆبونەوەیەك لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ بکەین بەمەبەستی دروست کردنی دەوڵەتێکی بچووك کە هاوسێ بێ لەگەڵ ئەو دەوڵەتـەی کـەسمکۆ دروسـتی دەکات.ئەمەش بۆئەوەی دەرفەت لەلاوازی تورك و ئێران وەربگرن.

سمکۆ دوای ئەوەی چەند تەلەگرافێك دەنێرێ بۆ شێخ مەحمود.وراوبۆچـوونی یـەك وەرەگـرن وەك لـەم بروسکەیەدا هاتووە.

بروسکە

**لەهەولێرەوە.**

**سلێمانی- حاکمی کوردستان**

گەورەم.ئەمرۆ هەموو کاروبارێکی کورد بەدەستی تۆیە وامان بەباش زانی دەست نەدەینـە هـیچ کارێك بێ پرسی تۆ تکام وایە دڵت بۆ ئێمـەی لێقـەوماویش بسـوتێت و بـۆ ڕزگـاری کوردسـتانی گەورە یارمەتیمان بدەیت.

**سمکۆ**

**(دڵسۆزت)**

**14 کانونی یەکەمی 1922**

---

*بروانە سمکۆو بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لاپەڕە 566 محمد ڕەسوڵ هاوار

**وەڵامی بروسکە**

**لەشێخ مەحمودەوە بۆ سمکۆ**

**بۆ قارەمانی کوردستان سمایل خانی سمکۆ-هەولێر**

**ئێوە دەزانن بۆ بەدەست هێنانی مافی نەتەوەیەتیمان گەلێك چەرمەسەری و ناخۆشی هاتە ڕێگەم ئەمڕۆ کەلەخۆشی دا دەمبینن ئەوەی لەتوانادابێت درێغی ناکەم بۆ یارمەتیدانتان بەلام ئەگەر بمانەوێت کارێکی تازە دەست بدەینێ و بەبێ پاڵپشتێك ئەوا گەلەکەمان دەخەینە نارەحەتی یەوە هەتا ئێستاش بەشێوەیەکی ڕەسمی بەیانی سەربەخۆیی کوردستانیان دەرنەکردووە تاکو بتوانین بەرهەڵستی دەوڵەتە دراوسێکانمان بکەین لەگەڵ ئەوەشدا چەند جارێك هەڵخەڵەتاین بەلام لەداواکردنی مافمان دەست هەڵناگرم وا سێ مانگ بەسەر ئەو پەیمانەی حکومەتی بەریتانیا کە دابووی دەربارەی مەسەلەی کورد ڕابورد تاکو ئێستا هیچ بەندێکی جێ بەجێ نەکراوە تابۆ گەلەکەمانی بلاویکەینەوە لەبەرئەوە من ئامادەم بۆ جاری دووەم لەپێناوی حەقدا شەڕیکەمەوە ناشمەوێ خوێنی گەلەکەم هەروا بەفیڕۆ بڕوات ئەگەر توانیمان مافی ڕەوامان بەدەست بخەین ئەوا لەدوژمنەکانمان دووردەکەوینەوە لەسەر فەرمانەکانی دەوڵەتی بەریتانیاش لەسنووری یاسادا جێ بەجێی دەکەین ئەگەر دەتانەوێ لەسەر باسەکە زیاتر بڕۆین ئەوا دەتوانن بێنە سلێمانی و چاوتان پێمان بکەوێ.**

**مەحمود**

**( سلێمانی )**

**14ی کانونی یەکەمی 1922**

**بروسکەیەکی دیکە لەسمکۆوە**

**سلێمانی-حاکمی کوردستان**

مـن وائـەبینم جگـە لـەئینگلیز کـەس مافمـان ناداتێ.شـتێکی سروشـتی یـە ئـەوانیش چـاوەڕێی پاداشـت بکـەن ئەگـەر بـەڕێزتان بەباشـی دەزانـن ئامـادەم بـێ خـوێن ڕشـتن مافمـان وەربگـرین-باشتریشـە دوژمـن لەخاکمانـدا دەربکـەین و داوای یارمـەتیش لەعەرەب و ئینگلیز بکەین.

**سمکۆ**

**دڵسۆزت**

**وەڵام:**

**لەمەلیکی کوردستانەوە بۆ قارەمانی کوردستان سمایل خانی سمکۆ.**

**هەولێر**

هـەموو بەدەسـتهێنانێك سوپاسـی دەوێت.بـەڵام خـۆ بەکوشـت دان لـەڕێی بێگانـەدا بـەخۆڕایی دەڕوات من لەگەڵتام جگە لەئینگلیزەکان کەس مافمان ناداتێ و هەرخۆشیان هاتنـە پێشـەوەو بڵاویان کردەوە کە مافمان دەدەنێ لەگەڵتام ئەوەی کۆسپ بخاتە ڕێمـان بـۆ بەدەست هێنـانی مافمان پێویستە بەرهەڵستی بکەین ئەگەر ئـەوان ئامـادەن مافمـان بـدەنێ منـیش ئامـادەم بـۆ پاداشت دانەوەیان تاکو ئێستا نازانم کێ دوژمنمانەو ئەو دەوڵەتە کامەیە کەمافمان دەداتێ یان لەگەڵ کێ بین مافی لێ وەربگرین؟ یان بۆچی دەبێت شەڕیکەین؟بۆئەوەی زیاتر خـوێن نـەڕژێت و دوژمنایەتی لەگەڵ کەسدا نەکەین وای بەباش دەزانم ئێستا هەروا بمێنینەوە.

**(مەحمود)**

ئەگەر سەرنج لەهەردوو بروسکەکەی سمکۆ بدەین کەبۆ شێخ مەحمودی حوکمداری کوردستانی ناردووە بەتایبەتی بروسکەی یەکەم دەردەکەوێ سمکۆ هیچ نائومێد نەبووە بەڵکو زۆر بەبڕوا بەخۆبوونەوە داوا لەشێخ مەحمود دەکات کەیارمەتی بدات بۆ ڕزگاری کوردستانی گەورە کە خۆی بەتەنیا بەبەرگری کاری ئەم کارە زانیوە.لەبروسکەی دووەمیشدا سمکۆ تاکە هیوایەك کە هەیەتی تەنها ئینگلیزەکانە چونکە سمکۆ باش دەیزانی کە کاروباری ناوچەکە لەدەست ئینگلیزدایە هەر ئەوان ئەتوانن بڕیاربدەن خۆ سمکۆ پێشتر دەیزانی پەیماننامەی نێوان ئێران و بەریتانیا لەساڵی 1919دا کۆتایی بەهەموو شتێك هێناوە ئینگلیزەکانیش پەیوەستن بەو پەیمانەوە.بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا سمکۆ هەر وویستویەتی هەرچۆنێك بێت لەگەڵ ئینگلیزەکاندا ڕێك بکەوێت و بۆبەرژەوەندی کورد پەیوەندییان لەگەڵ دروست بکات سمکۆ وابەستەیەکی ئەخلاقی بووە کە چۆن بەڕێزەوە لەشێخ مەحمودی ڕوانیوە کەلەدوای ئەو شکستە گەورەیەی بەسەریاهات هێشتا لەگەڵ ئینگلیزەکاندا نەڕووبەڕوو نەبەنامە هیچ نەرمی یەکی نەنواندو هیچ جۆرە سازشێکی نەکرد بەڵکو وەك سەرکردەیەکی خاوەن ماف خۆی نیشانی ئینگلیزەکان داوە.پاشان دوای چەند بروسکەیەك سمکۆ بڕیاری دا سەردانی سلێمانی بکات. سەرەتا چووە ناوچەی پشدەر لای بابکر ئاغا لەگوندی(گردە سپیان)بەلآم لەبەر ئینگلیزەکان بابکر ئاغا نەیتوانی میوانداری سمکۆ بکاو ناردی بە لای بابکری هۆمەر ئاغای ئامۆزای لەگوندی (دێگە)پاشان لەوێ وە بۆ سلێمانی هات بەمەبەستی پشتیوانی کردن لەسمکۆ وەك سەرکردەیەکی نەتەوەیی حوکمداری کوردستان هەیئەتێکی پێشوازی کردنی بەسەرۆکایەتی تایەر ئەفەندی سەرۆکی دیوانی مەلیکی نارد بۆ ئەوەی هاوڕێیەتی میوانی گەورە بکات(93) شێخ لەتیف دەڵێ من لەو کاتەدا منداڵ بووم بەلآم بەبیستنی هەواڵەکە زۆر دڵخۆش بووم لەڕۆژی1923/1/8 هەواڵ گەیشت کە سمکۆی قارەمان گەیشتە ناوچەی قەیوان لەوێشەوە بەرەو سلێمانی دێت کاتێك هەواڵەکەم بیست سواری ئوتومبیلی دەوڵەتی بووم تاپشتی (کانی بەردینە)کەدەکەوێتە دامێنی چیای قەیوانەوە لەوێ چاوم بەپێشەوای ئەو سوپایە کەوت کە بۆ

پێشوازیکردنی سەرۆکی قارەمان سمایل خانی سمکۆ هاتبوون.پێشەوا سمایل خانی سمکۆو عەباسی محمودئاغاو بابەکری سەلیم ئاغای پشدەری دەبینران کەسمایل خان چاوی پێمکەوت لەئەسپەکەی دابەزی و ماچی کردم.....پێم ووت وەرە لەگەڵما با بەئوتومبێلەکەم برۆین وەلامی دامەوەو ووتی چۆن دەبێت هاورێکانم بەجێ بهێڵم بەلام محمودئاغاو بابەکرئاغا بە سمکۆیان ووت سوار بەلەگەڵیا بادڵی نەشکێت.ئەویش رازی بوو.تاچایخانەکەی کانی بەردینە لەتەکما هات منیش بەمە زۆر دڵخۆش بووم لەوێ وە بەئوتومبێلەکەم گەرامەوە.هەواڵم گەیاند کەسمکۆی پێشەوا دوای سەعات و نیوێکی تر دەگاتە ئاوشار.سوارەی پیادەی کورد هەردوولای رێگەکەیان گرتبوو لەپێشیانەوە ئەفسەرانی کوردو پیاوە سیاسیەکان و خەڵکێکی زۆر وەستابوون و چاوەڕێ ی گەیشتنی کەژاوەی سەرۆك سمکۆیان دەکرد ئافرەتانیش بەچەپکە گوڵەوە چاوەڕوانی گەیشتنی سمکۆ بوون بۆ ئەوەی گوڵبارانی بکەن قوتابیانیش سروودی نەتەوەییان دەووت کاتێك گەیشتمە سلێمانی ئافرەتێکی زۆرم دی لەسەربانەکان وەستابوون کەلەماڵی عیرفانە فەنی نزیك بوومەوە هەیئەتی حکومیم بینی لەپێشوازی سمکۆدا وەستابوون بەباشم زانی لەگەڵیاندا بۆ کارێزە ووشك بگەرێمەوە کاتێك گەیشتمە شوێنی مەبەست میوانی گەورەمان گەیشت تۆپی حکومەتی کوردیش بەم بۆنەیەوە ئاگردرا کاتێك ئوتومبێلەکەی مەلیکی کوردستان بەئالای کوردستانەوە گەیشت شێخ دابەزی و بەپێ چەند هەنگاوێك رۆیشت هەردوو پێشەوا بەیەك گەیشتن و یەکتریان ماچ کرد دوایی بەرەو دوا بۆ ئەو شوێنەی بۆی تەرخان کرابوو لەگەڵ پێشوازی کەران دا گەڕانەوە مامۆستای شاعیر ئەحمەد حسێن لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ خوالێخۆشبوو (شاری) (علی عارف ئاغا)دا دەڵێ(شاری)شاعیر کەسێکی کراوەو بیرتیژ راستگۆو ئەرباب بوو لەگەرمەی دانیشتن دا ئەم پرسیارەم ئاراستەکرد مامۆستا ئایا جەنابت سەرکردەی لێهاتوو ئیسماعیل ئاغای شوکاك(سمکۆ)بینی دوای نەختێك رامان بەشێنەیی ووتی بەڵێ:بابگەرێمەوە بۆ سەرەتای بیستەکان ئەو دەمە لەپۆلی سێ یەم یان چوارەم بووم لەلایەن حکومەتی کوردستانەوە لەسەر خواستی مەلیك مەحمودی ئەوەل بانگهێشت کرابوو تەشریفی

بەخۆیی و 70-80 سوارێکەوە لەدەوروبەری گوندی (وێڵەدەرە)*وە هاتن بۆ ناوشار ئێمەش ئاگادارکراین و ئامادەبوین تێکڕای شاگردو (قوتابی)و مامۆستا و بەشێکی زۆر لەدانیشتوان بەرەو پیریان چووین سمکۆ زەلامێکی بۆ شناخ و بەهەیبەت بوو قاتێ شاڵ و شەپکی لەبەردابوو گەلێك سرودو گۆرانیمان بۆ ووتن شایانی باسە (ئەخۆل)ی شاعیر لەبەردەمی دا بەبەرگێکی قەشەنگەوە بەحەرەکەتەوە سرودێکی بۆ خوێندەوە.سمکۆ لە خۆشیدا دەگریا لەگەڵ مەلیك مەحمود دا ئافەرینی هەموومانیان کرد.ئیدی مەلیك مەحمودو سمکۆ دەستیان کردە ملی یەك جۆشی وەتەنیەت و قەومیەت لەئارادابوو دوایی بە مەراسیمەکەهات. ئیتر (شاری)بەهەناسەیەکی ساردەوە ووتی دەرێخ بۆ ئەو ڕۆژو زەمانە). هەر بەبۆنەی هاتنی سمکۆی شکاك بۆ سلێمانی کە ڕۆژێکی مێژوویی بووە. ئەو پێشوازی یە گەرمەی کە جەماوەری شاری سلێمانی لەسمکۆو هاوەڵەکانیان کرد لە ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان ژمارەی 8ی ساڵی یەکەمی ڕۆژی 10ی کانونی دووەمی 1923دا هاتووە:(هەفتەیە لەمەویەر جەنابی تاهیر ئەفەندی سەرکاتبی حەزرەتی ملوکانە بەهێزێکی سواری یەوە تەشریفی حەرەکەتی کرد بۆ پێشوازی حەزرەتی قارەمانی کوردستان

........................................

*ڕەنگە وێڵەدەر هەڵەبێ چونکە سمکۆ لەباکوری ڕۆژئاوای سلێمانی یەوە هات بڕوانە یاداشتەکانی شێخ لەتیف کەدەڵێ شێخ مەحمود بەئوتومبێلی مەلیکی یەوە هات بۆ کارێزە ووشك.(کارێزە ووشك)لەباکوری ڕۆژئاوای سلێمانی یە هەروەها شێخ لەتیف بۆ خۆی لەپێشوازی دا چووە کانی بەردینە و سمکۆ کەچاوی پێ دەکەوێ لەئەسپەکەی دائەبەزێ و ماچی دەکات.کەواتە وێڵەدەر هەڵەیە ڕەنگە لەگەڵ هاتنی محمود خانی دزلی لەساڵی 1919دا بۆ ڕزگارکردنی سلێمانی لێی تێك چووبێ بەهەڵەناوی وێڵەدەری هێناوە.بەلام محمود خانی دزلی لەوێ وە هێرشی هێنا لەکاتی هێرشدا مناڵ ناتوانن پێشوازی بکات (نوسەر).

جەنابی ئیسماعیل ئاغا ڕۆژی 7ی کانونی یەکەم کەجەنابی ئاغا قۆناغی نزیکی سلێمانی بووە حەزرەتی ڕەئیسولرۆئەسا جەنابی شێخ قادر ئەفەندی لەمەعیەتی موبارەکیدا قوماندان تابور وە ژاندرمە بەهێزێکی زۆرو گەلێ ئەشرافی مەملەکەت ئامادەبوون بۆ پێشوازی حەرەکەت فەرمان بوو نزیکی مەنزڵی تەشریفی چوو بەپیرەوە هەموو دائیرەکانی حکومەت تەعتیل کران ئەهالی دوکانیان هەڵگرت عومومی ساداتی کیرام و مەئموران و موڵکی و ڕووئەسا و ئەشراف و منەووەران و ئەهالی موعتەرەفە بۆ مەراسیم ئیستقبال نزیك نیو سەعات بەسوارەو بەپیادە حەرەکەت و ڕوویان لەڕێگای ئیستیقبال و چاوەڕێی جەنابی وەزیری داخلیە لەگەڵ جەنابی کاپتن (چەپمەن)وەکیلی فەخامەتی مەندوبی سامی دابوون بەئوتومبێل و سائیر ڕۆئەسای حکومەت قیسمەن بەسواری قیسمەن بەئوتومبیل تا سەعاتێ ڕێگا ئیستبقبالیان کرد هەرچەندە ڕۆئەسای عەشایەر کەلەسلێمانی ئامادەبوون هەر کەسە بەخۆیی و دەستەو دایەرەوە بەشێوەیەکی مونتەزەم و بێ جیاوازی داخڵی مەراسیمی پێشوازی بوون لەپاش تەرتیب و تەنزمی ئەم مەراسیمە گەردونەی حەزرەتی جەلالەتی مەلیکی گەورە (دامەشەوکەتوهو) سەعات شەشی کوردی لەشارەوە نزیکی نیو سەعات ڕێگا بۆ پێشوازی فەرموو لەجێگای ئامادەکراو بۆ چاوەڕێ پشوویان فەرموو کە تەشریفی موبارەکی حەزرەتی ئاغای نامدار نزیك بوەوەو لە ڕیاسەتی قوماندانی قیوای میللی دا عومومی قەتەعاتی سواری میللی ملووکانە سەعاتێ ڕێگا لەشار دوور تا کەنارشار لەهەردوولای ڕێگەدا سەف بەستەی ئیحترام سەلام و عەرزی تەعزیمات و تەبریکانیان کرد لەپاش قەدەرێ کە حەزرەتی ئاغای نامدار لەگەڵ جەنابی

ئەحمەد ئاغای برای موحتەرەمی و سایر خزمان و مەعیەتی موبارەکی و ڕۆئەسای کەرامی خاوەن ئیحترام و عەشیرەتی پشدەر جەنابی بابکر ئاغاو جەنابی عەباس ئاغاو سایر

ڕۆئەسای پشدەر مەنگوڕو ئەوجاغ لەخزمەتی جەنابی ڕەئیسولرۆئەسا حەزرەتی شێخ قادر ئەفەندی دا بەتەواوی نزیکی مەوقعی مەخسوسی جەلالەتی حەزرەتی مەلیك بوونەوە ئەوسا گەردوونەی حەزرەتی تاج داریش تۆزێ چووە پێشەوە هەردوولا دابەزین تەوقەو بەیانی خۆش

ئامەدی و تەبریکات و لەوازمی موحیبەت و حورمەتی فەوقە لعادە لەهەردوولا بەجێ هێنرا بەفەرمانی ملووکانە حەزرەتی ئاغای موحتەرەم لەگەردوونەی مەخسووسەی ملووکانەدا ئەخزی مەوقیعی فەرموو لەخزمەتی حەزرەتی مەلیکیدا گەڕانەوە بۆشارو ئومەراو ئەفسەران و عەساکیری مەنسوورەی کوردستانیش کە لەدەرەوەی شاردا.بەشێوەیەکی مونتەزەم سەف بەستەی ڕێزو سەلام بوون ڕاسیمەی تەعزیمات و سەلامیان ئیفاکراو گۆرانی وەتەنی خۆشیان خوێندەوە و دوعای پێشکەوتن و سەرکەوتنی حکوومەت و میللەتی کوردیان کرد لەتەرەف جەلالەتی حەزرەتی مەلیك و حەزرەتی ئاغای نامدارەوە تەفتیشی عەسکەرەکان کراو یەکە یەکە مەزهەری سەلام بوون.لەدوایی دا بەگشتی عەودەت کرایەوە بۆ خانووی مەخسووسی حەزرەتی ئاغای موحتەرەم لەبەردەمیا نوتقیان فەرموو لەوێ دا هەموو شاگردانی مەکتەب بەشێوەیەکی ڕێك و پێك لەسەفی حورمەت و چاوەڕێ دا ڕاوەستان گەڵێ گۆرانی و ئەشعاری کوردی وەتەنی بەسۆزیان خوێندەوە کەدڵی گوێ گرانیان ئەکرد بەئاو لەلایەن یەکێ لەشاگردانی مەکتەبەوە بەموناسەبەتی ئەو ڕۆژە موبارەکەو ئەو زاتە موحتەرەمەوە نوقتێکی جوان و ڕەوان خوێنرایەوە کە عەرزی خۆش ئامەدی حەزرەتی ئاغای نامدارو دوعای بەقای مۆفەقیەت و تەرەقی حەزرەتی مەلیك و میللەتی کوردبوو لەم پێشوازی یە ڕێك و پێکەو لەم دیمەنە موحتەشیمە عادەتەن عالەمی کوردی یەت و قەومی یەت ئەحیابووەوە لەپاشدا موسافیری موحتەرەمە لەخزمەتی جەلالەتی مەلیك دا تەشریفیان چووە مەقامی مەخسوسی خۆیان لەڕاستیدا ئەم ڕۆژە مێژوویی و زۆر پیرۆزە ئێمە ناتوانین دەرکی مەعالی و مەدح و سەنای و خەدەماتی وەتەن پەروەرانە و ئیقداماتی فیداکارانەی حەزرەتی ئاغای نامدار بکەین بەڵام بەناوی هەموو میللەتی کوردەوە عەرزی خۆش ئامەدیی و تەبریکاتی حەزرەتی ئەم قارەمانی کوردستانەو ڕەفیقانی موحتەرەمی ئەکەین بەتەشریف هاوردنیان ئیعلانی مەسارو ئیفتیخارو سەعادەت و مۆفەقیەتی هەموو قەومی کورد لەبارەگای گەورەیا ئیتسیرحام ئەکەین)

کەواتە هاتنی سمکۆ بۆ سلێمانی کارێکی سەرپێی نەبووە بەڵکو(چەپەمن)لەگەڵ دەستەو دایەرەکەی حکومەتی شێخ مەحمود دا لەپێشوازی دابووە.چونکە ئینگلیزەکان دەیانویست هەندێ کار بەسمکۆ بکەن تا لەبەرژەوەندی خۆیاندا بێ وەك دروست کردنی کاریگەری یەك لای شێخ مەحمود کە ئینگلیزەکان باشترن تاتورکەکان و خۆی بەدووربگرێ لەدۆستایەتی ئۆزدەمیرو پیاوەکانی بەڵکو وا لەشێخ مەحمود بکرێ بەلەشکرەوە بڕوات بۆ ڕەواندوز تورکەکان دەربکات. کە سمکۆ بەمە ڕازی نەبووە جگە لەوەش سەید تەهاو سمکۆش ئاگاداری ئینگلیزەکانیان کرد هیچ کارێك بێ ڕەزامەندی یەکتر نەکەن ئیتر ئینگلیزەکان هیچ چارێکی تریان نەماو لە 14ی کانونی دووەمی ساڵی 1922دا بەفرۆکە بەیانیان فڕێ دایە خوارەوە کەکورد دەتوانێ لەسنوورێکی دیاری کراودا حکومەتێك بۆ خۆیان
دابمەزرێنن.بۆئەم مەبەستەش شێخ مەحمود کۆبونەوەیەکی ئەنجام دا کە بۆ ڕێکخستنی بەرنامەی کاری هاوبەش لەنێوان کوردستان و عێراق و بەریتانیا پەیوەندی یەکانیان ڕێك بخەن. ئەو ماوەیەی کەسمکۆی شکاك لەسلێمانی مایەوە کە نزیکەی 19ڕۆژ بووە لەگەڵ شێخ مەحمود دا زۆربەی شوێنە حکومیەکانی بەسەرکردەوە. بۆ پشودان خانووەکەی سەید مستەفای نەقیب یان بۆ ئامادەکردبوو.سمکۆ زۆر دڵخۆش بوو بەو پێشوازی یە گەرمەی کەلەلایەن جەماوەری سلێمانی و حکومەتی شێخ مەحمودەوە لێی کرا و سوپاس گوزاری خۆی بۆ حکومەت و خەڵکی سلێمانی دەنێرێ و لەڕێ ی ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان)ەوە ژمارە 8ی (15)ی کانوونی دووەمی ساڵی 1923بڵاوکراوەتەوەو دەڵێ:
(لەسەر دەعوەت و فەرموودەی حەزرەتی جەلالەتی مەلیکی کوردستان و سەید ولسادات جەنابی مەلیك مەحمودی یەکەم دامەشەوکەتوهو.بەکەماڵی شەوق و شەتارەتەوە بۆ کەسبی شەرەفی زیارەتی حەزرەتی مەلیکی گەورە هاتمە سلێمانی.لەهەموو ڕوویەکەوە مەزهەری تەوەجوهات و عینایاتی حەزرەتی ملووکانە بووم لەبەرئەوە بەهەموو مەوجودیەتمەوە عەرزی تەشەکورو ئیفتیخار ئەکەم و لەشێوەی ئینسانیەت و حیسیاتی قەومیەت پەروەرانە

کەلەمەراسیمی پێشوازی دا لەتەرەف جەنابی ڕەئیسولڕوئەساو مەئمورانی عەسکەریی و موولْکی حکوومەت و ئەشراف و منەوەران و ئەهالی کوردستانەوە دەرهەق بەشەخسی من ڕەوا بینرا بوو گەلێ موتەشەکیرو موفتەخیرم بەڵکو هەر فەلاکەت و ئەزیەتێ کەلەڕێگای خزمەتی ئازادی و ڕزگاری ئەم میللەتەدا بەسەرماهاتووە لەبیرم چووەتەوە بەواسیتەی ڕۆژی کوردستانەوە بەیانی مەمنوونیەت و مەسروری لەهەموو برادەرانی کوردی سلێمانی ئەکەم خوا هەموو لایەکمان مۆفەق بکات).

کاتێك کە ئینگلیزەکان زانییان چوونی سمکۆ بۆ سلێمانی و کۆبوونەوەی لەگەڵ کاربەدەستانی حکوومەتی خوارووی کوردستاندا نەیتوانی شێخ مەحمود لەلایەنگری تورکەکان پەشیمان بکاتەوە ئینگلیزەکان 1923/1/23بەفڕۆکە نووسراویان لەسلێمانی فڕێدایە خوارەوە ئەگەر سەیری هەڵوێستی شێخ مەحمود بکەین ناهەقی نەبووە کە لایەنگری لەتۆزدەمیر بکات دژی ئینگلیزەکان چونکە ئینگلیزەکان هیچ جۆرە هاوکارییەکیان نەکردوو ئەو بەڵێنانەی کە دابویان پێشتر لەهەمووی پاشگەزبوونەوە. هەر ڕۆژەی کێشەیەکی تازەیان بۆ حکومەتەکەی شێخ دروست دەکرد.بۆیە سمکۆ لە 1923/1/28شاری سلێمانی بەجێ هێشت و ڕووی کردەوە ناوچەکانی سیدەکان و بەرەو سنوورەکانی ئێران کشا.لەسەر بەڵێنی تورکەکان چووە باشقەلا تا دانیشێ و بەمەرجێ ژن و کوڕەکەی و سامانەکەی کە20هەزار لیرەی زێڕ بوو بیدەنەوە دەنا سمکۆ لەدڵەوە زۆر ڕقی لەتورکەکان دەبۆوە بەڵام چاری نەبوو دەبوایە بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ تورکەکاندا بکات سمکۆ باش دەیزانی چی دەکات خۆ هێشتا خوێنی بەناهەق ڕژاوی جەواهیر خانمی خێزانی و کۆمەڵێك لەچەکدارەکانی ووشك نەببۆوە.

لەهەمان کتێبدا لەزمانی ڕەفیق حلمی یەوە دەڵێ کەمالیەکان ویستیان سمکۆ لەگەمەی سیاسی نێوان خۆیان و ئینگلیز دا لەکاتی ئاڵۆزانی کێشەی موسڵ دا لەبەرامبەر هەڕەشەی ئاسووری دا کەڵکی لێوەربگرن.کاربەدەستانی تورك لە (وان)داوایان لەسمکۆ کرد بچێتە مەرکەزی وویلایەت و سەر بۆحکومەت دابنەوێنێ و دڵسۆزیی خۆی بسەلمێنێ بەڵێنی شەرەفیان دابوویە

لەوچوونەدا بەسەلامەتی بگەڕێتەوە.بۆ دەربڕینی دۆستایەتی فەرماندەی ئۆردوی تورك لە(وان) دووسەد لیرەو هەندێ تفەنگ و فیشەکی بەئەحمەد تەقی و ڕەشید جەودەت و وەهبی بەگی یاوەری خۆیدا بەدیاری بۆ سمکۆی نارد. مەرجەکانی قبوڵ کرد خۆی و هەندێ لەپیادەکانی چوون بۆ (وان) کاربەدەستانی تورك بەڕێزەوە پێشوازییان لە سمکۆ کرد میوانی فەرماندەی ئۆردوو بوو.هەزار لیرەی تریان لەپارەکەی خۆی دایەوە لەگەڵ هەندێ چەکی تر.هەندێ سەرچاوەی تری کوردی ئەگێڕنەوە کەکاربەدەستانی تورك بەسمکۆیان ووتووە حکومەتی ئەنقەرە بڕیاری داوە هەزار سەربازی پڕ چەکی تورك بەجل و بەرگی کوردی یەوە بخەنە ژێر فەرماندەتانەوە لەگەڵ چەکدارەکانی خۆتان و چیتان پێویست بێ حکومەت بۆتان ئامادە دەکات.بەم هێزەوە بچنەوە ئێران و شوێن و جێگای خۆتان بگرنەوە لەوێ لەجێی خۆتان ئەحمەد ئاغای براتان بەوەکالەت دابنێ و خۆشتان بەو هێزەوە بچنە خوارووی کوردستان لای شێخ مەحمود لەگەڵ عباس ئاغا پێکەوە کاربکەن لەدژی ئینگلیز.سمکۆ بەو بڕیارە دڵخۆش دەبێت دوای ئەوەی ڕێگەی ئەدەن بڕواتەوە ناوچەکەو بارەگاکەی خۆی هەر چاوەڕوانی ئەو هەزار سەربازە دەبێ کەبۆی بنێرن بەڵام پاش ماوەیەك ئاگاداریان کرد بەهۆی باری سیاسی دەوڵەتانەوە مەسەلەکەیان دواخستووە).

لێرەدا دەرئەکەوێ کە تورکەکان بەهیچ جۆرێك متمانەیان بەسمکۆ نەکردووە چونکە بۆ گرەنتی گیانی سەربازە تورکەکان لەکاتێکدا کەدەچنە لای سمکۆ .ئەحمەد ئاغای برای وەك بارمتە دەبێت دابنرێ چونکە ترسی ئەوەیان هەبووە کە سمکۆ لەتۆڵەی شەبەیخونەکەدا تۆڵە لەسەربازەکانی تورك بکاتەوە.

لەولاشەوە ئینگلیزەکان کەزانیان سمکۆ چووەتەوە ناوچەکانی خۆی و شێخ مەحمودیش ناچێت بەگژ تورکەکاندا لەڕەواندوز ناچار ئینگلیزەکان پیلانێکیان داناو هێزێکی گەورەو تۆکمەیان لەکۆیەوە کەوتەڕێ بۆ سپیلك هێزەکەی ئۆزدەمیریش لەڕەواندوز هیچ ئاگاداری ئەو لەشکرکێشیە نەبوو کاتێکی زانی لەپشتەوە ڕێگای ڕەواندوزیان بڕیوە ئۆزدەمیر هەر هێندەی

پێ کرا ڕای کردوو لەساڵی 1923کۆتایی بەدەسەڵاتی تورك هات لەخوارووی کوردستانداو ئۆزدەمیریش هەر لەو ناوچە دوورە دەستانە مایەوە و هیچی بۆ نەکرا ئیتر ئینگلیزەکان خۆیان قایم کردو گوندی (دیانە)یان کرد بەبارەگای سەرەکی و فرۆکەخانەیەکیان تیاداکردەوە(94)

لەو ماوەیەدا سمکۆ لەسەر سنووری تورکیا و ئێران بوو(کۆمەڵی ئیستیقلالی کوردستان)بەسەرۆکایەتی خالید بەگی جوبرانلی خەریکی خۆئامادەکردن بوون بۆبەرپا کردنی شۆرش خالید بەگ سمکۆ ڕانەسپێرێت تاپەیوەندی لەگەڵ سۆڤیەتدا بکات و داوای پشتیوانی و یارمەتییان لێ بکات سمکۆ بۆ ئەو مەبەستە ئەحمەد تەقی دەنێرێت بۆ دیتنی کونسوڵی سۆڤیەت لە ورمێ و ڕاسپاردەکانی سمکۆ بۆ سۆڤیەت بریتی دەبێت لە دوو داواکاری.: یەکەمیان ئەگەر ڕووسیا قایل بێت ڕێك بکەوێت لەگەڵمان من ئامادەم هەموو کوردەکانی لەگەڵ ڕێك بخەم ئەمەش یارمەتیەکی سیاسی و دەسکەوتێکی باشە بۆ ڕووسیا .بەو مەرجەی ڕووسیاش ئامادەبێت بۆیارمەتیدانی کوردەکان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی و وەرگرتنی مافی نەتەوایەتیمان. دووەمیان ئەگەر ئەمەش ناکەن یارمەتی شەخسی خۆم بدەن بۆگەڕانەوەم بۆشوێن و جێگای خۆم لە ئێراندا لەسەر بەڵێن و لەژێر چاودێری ڕووسیا .کونسوڵی ڕووسیا لەوەڵامدا ووتبووی بە سمکۆ بڵێن داوای یەکەمی لەگەڵ سیاسەتی ئەمڕۆی ڕووسیادا ناگونجێت و ناشیانەوێت درۆی لەگەڵدا بکەن چونکە لەپاشە ڕۆژدا نابێت کورد و ڕووس ڕێکبکەون بۆیە نایانەوێت بێ بەڵێن بن بۆ داوای دووەمیش ئەگونجێت تێبکۆشین و هەوڵ بدەین .باسمکۆش پەیوەندی لەگەڵمان هەبێت چونکە تازە سۆڤیەت پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری لەگەڵ حکومەتەکانی ئێران و تورکیا بەستبوو وەبەڵێنیان دابوو بە یەکتری کەهاریکاری ویارمەتی دوژمنانی یەکتر نەدەن.

لە 24/ 7/ 1923 دا ڕێکەوتنی لۆزان لە نێوان نوێنەری بەریتانیا( سێرهۆراس رمبۆلد ) لەگەڵ تورکەکاندا پێك هاتن و ئیمزا لە سەر ئەو پەیمانە کرا کە تورکەکان واز لە هەموو مافەکانیان بهێنن لە عێراق و سوریاو فەلەستین و قوبرس و میسرو لیبیا بەو مەرجەی باکووری کوردستان و ئەرمینیای دەست بکەوێتەوە و لێی دانەبڕێت ، کە پێشتر لە پەیمانی سیڤەردا ئەو مافانەی دابوو بە کوردەکان و ئەرمەنەکان لە ڕێگای ڕاپرسی و زۆرینەی دانیشتوانەوە بڕیاری لەسەر بدرێت کە سەربەخۆ بن یا خود لەگەڵ تورکەکاندا بمێننەوە . بۆ نەمانی ئەو دڵە ڕاوکێ یە تورکەکان وازیان لە مافەکانیان هێنا لەو وولاتانەدا کە دەوڵەتی عوسمانی بۆ چەند سەدە حکومڕانی تێدا کردبوو ، لە پەیمان نامەکەدا هاتووە کە کەشتی یە بازرگانی یەکان دەتوانن بە ئازادانە بە گەرووە ئاویەکاندا هاتوو چۆ بکەن لەکاتی ئاشتیدا . هەروەها کەشتی وولاتە بێ لایەنەکانیش دەتوانن هاتو چۆ بکەن لەکاتی جەنگ دا . بەم پەیمانە تێکڕای خەونەکانی کورد بوونە بڵقی سەرئاو کوردیش نا ئومێد بوو هەروەها لە تورکیادا چاکسازی دەستی پێ کردو کاروباری ناوخۆی وولات لەکارە سەرەکی یەکانی چاکسازی بوو لە 29 تشرینی یەکەم 1923 بڕیار درا بە گۆڕینی خەلافەت بۆ ڕژێمی کۆماری بە شێوەیەکی فەرمیش مستەفا کمال بەسەرۆك هەڵبژێردرا جاری دووەم بڕیار درا تا کۆتایی ژیانی دەست بە کار بێت وەك سەرۆکی وولات . ڕژێمی خەلافەت لە 24 / 3/ 1924 لا درا و دوا خەلیفەی دەوڵەتی عوسمانی وولاتی تورکیای بەجێ هێشت و بەهەمان شێوە بڕیار درا دین لە دەوڵەت جیا بکرێتەوە هەروەها بەهێز کردنی بیری نەتەووایەتی و گەڕانەوە بۆ کەلتورو مێژووی تورك و هەوڵدان بۆ بە تورك کردنی نەتەوەی کوردو کەمە نەتەوەکانی تر یاخود توانەوەیان لە بۆتەی تورکایەتی دا ئەمەش بووە هۆی بێ هیوایی کوردو هەستی ڕۆشنبیرانی کوردی وا لێ کرد بیر لە ڕاپەڕین و شۆڕش بکەنەوە بۆ بەرگری کردن لەخاك و ناوی کوردستان چونکە ئەو بەڵێنانەی کە تورکەکان دابویان بە کوردەکان هەموویان لە بیر کردو کەوتنە توندو تیژی نواندن بۆ ئەم مەبەستە کوردەکان لە ڕێگای کۆمیتەکانی ئەستەمبوڵ و ئەرزڕوم و.ئامەدو .بەتلیسە وە .لەهەوڵی

بەدەست هێنانی پشتگیری رووسەکان دا بوون بە پێش کەش کردنی هاوکاری بۆ دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ لە ژێر چاودێری رووسەکاندا ، بۆیە لەم کاتەدا بزوتنەوە کوردیەکان مۆرکێکی رێکخراوەیی وەرگرت (90) ، ئەوەی کە رۆڵی سەرەکی بینی لەم چالاکی یەکانەدا ( کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان) بوو لە هوشیار کردنەوەی دانیشتوانی ناوچە کوردی یەکان ، پاشان لە ناو سوپاش دا کوردەکان رۆڵێکی گەورەیان بینی کەسایەتی یە نیشتمان پەروەرە باڵا دەستەکانیش بەتایبەتی بەرپرسەکانی ناو سوپا لە شوێنە هەستیارەکاندا پەیوەندی یان بەیەکەوە دەکرد ئەمەش رێخۆشکەر بوو بۆ سەرهەڵدانی شۆڕشی ساڵی 1925 .

# شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران

دوای ئەوەی خەڵکی نیشتیمان پەروەری کوردستان نائومێدبوون لە دەسەلأتی کاربەدەستانی تورك بەرامبەر بە جێبەجێکردنی پەیمانی سیڤەری ساڵی 1920 کەزۆربەی مافەکانی گەلی کوردی دەستەبەر دەکرد و بەرامبەر بە هاتنە کایەی پەیمانی لۆزان کەئەو مافانە بە کورد ڕەوا نابینێ و لە بەرژەوەندی داگیرکەراندا بوو . کورد ناچاربوو جارێکی تر خۆیان ڕێکبخەنەوە بۆبەدەستهێنانی مافەکانیان بە دروستکردنی ڕێکخراوێکی سیاسی نەتەوەیی کە ئەوەش ڕێکخراوی ئازادی کوردستان بوو . ڕێکخراوی ئازادی لە ساڵی 1923 لە تورکیا لە لایەن کۆمەڵێك ئەفسەری گەنج و خوێن گەرمی کورد لەناو سوپای تورك دا زۆر بەنهێنی دروست بوو بوو، بەدەر لە گشت ڕێکخراوە سیاسی یەکانی پێشتر . ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە خاوەنی ئەزمونێکی زۆربوون لە بواری سەربازیدا . بنکەی سەرەکی ڕێکخراوەکەش ئەرزرومی بارەگای تیپی هەشتەمی سوپای تورك بوو . دیارترین کەسایەتیەکانیش خالیدبەگی جبرانلی سەرۆکی تیپی ناوەندی ئەرزروم و کۆڕ حسێن پاشای حەیدەرلی و یوسف زیا بەگی کۆنەئەندامی پەرلەمان و سەرۆکی لقی بەتلیس و خالیدبەگی حەسەنان فەرماندەی سوارەی حەمیدییە و سەرۆکی لقی ڤارکۆ و ئەکرەم بەگی سەرۆکی لقی دیاربەکر و سەیدعبدالقادر ئەفەندی سەرۆکی لقی ئەستەنبوڵ . لە سەرۆك هۆزە بەشداربووەکانیش حاجی موسابەگی سەرۆکی هۆزی خۆیتی جەمیل چەتۆی محمود بەگی میلان و عبدالرحمان ئاغای سلێمان ئاغای شەرناخ بەلأم ئەوەی جێگای سەرنجە شێخ سعید وەك ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری ئەم ڕێکخراوە ناوی نەهاتووە . دەبێت دواتر وەك کەسایەتیەکی کاریگەر و شێخی تەریقەت بەشداری کردبێ پاشانیش چەند سەرۆك هۆزێکی تر پەیوەندیان کرد .

دروستبوونی ئەم رێکخراوە دەرئەنجامی سیاسەتی دژ بە کوردی تورکیا بوو وەك دەرکردنی یاسای نوێ ی کەمینەکان کە کوردەکان گومانیان لەگواستنەوەیان هەبوو بۆ رۆژئاواو پەرتەوازەکردنیان . لەگەڵ ئەوەشدا تەنها خەلافەت ئامرازی پێکەوە بەستنی کورد و تورك بوو ئەو ئامرازەش هەڵوەشایەوە . قەدەغەکردنی زمانی کوردی لە قوتابخانە و فەرمەنگەکاندا و ووشەی کوردستان وەك گوزارەیەکی جوگرافیایی بەکاردەهات ئەویش سڕایەوە. کاربەدەستانی بالآ لە کوردستان هەموو تورك بوون حکومەت بەمانەشەوە نەوەستا بەڵکو دەست وەردانی ئاشکرای هەبوو لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی دا دروستکردنی کێشە لەنێوان خانەوادەو هۆزە کوردییەکان دا . کرینەوەی موڵکی کوردەکان بە پارەی ئەڵمانەکان و لە دوای یشدا دەرکردنی یاسای ژمارە (1505) کە رێگەی ئەدا بە دەست بەسەراگرتنی موڵکی کوردەکان و لە جێگەیان دانانی جوتیاری هاوردەی تورك . ئەمانە بەشێکن لەو هۆکارانەی کە بووە هۆی دروستبوونی ئەم رێکخراوە و هەوڵدان بۆ بەستنی کۆنگرەی رێکخراو . دوای بەستنی کۆنگرە . ئامانج تەنها بەدەستهێنانی ئازادی بوو بۆ کوردستان . لە کۆنگرەدا دووبڕیار درا یەکەمیان دەبێت شۆڕشەکە گشت کوردستان بگرێتەوە . مانگی مایسی 1925 دیاری کرا بۆ دەستپێکردنی شۆڕش . خالی دووەم کۆمەك و یارمەتی بۆ شۆڕش لە سێ رێگاوە بەدەست دەهات یەکەم لە رێگەی فەرەنسیەکان لە سوریاوە. دووەم لە ئینگلیزەکان لە عێراقە وە . رێگای سێهەمیش رووسەکان بوو ، هەندێك سەرۆك هۆز رایان لەگەڵ هاوکاری وەرگرتن لە رووس نەبوو . بەو پێ یەی کە رووسەکان کافرن و تورك باشترە لە رووس لێرەدا شێخ سەعید ناوی دێت و دەڵێ : (( کۆمەکی کافر زۆر باشترە لە چارەنووسی تاڵ وەك ئەوەی بەسەرگەلی ئەرمەندا هات ... ))

بۆ ئەم مەبەستە گشت ئامادەکارییەك کرا بۆ شۆڕش. بەلآم ئەوەی کە زۆر گرنگەو تا ئێستا شاراوەیە سەرکردایەتی کردنی شۆڕش بە چ شێوەیەك رادەستی شێخ سەعید کرا تا ئەو کاتەی کە لە رێکخراوەکەدا تەنانەت ناویشی نەهاتووە .رەنگە دوای دەستگیرکردنی زۆربەی

سەرکردەکانی ڕێکخراوی ئازادی لە لایەن تورکیاوە ئەو هەل و مەرجەی هێنابێتە ئاراوە کە شێخ سەعید وەك سەرکردەیەکی متمانە پێکراو لەلایەن خەڵکەوە دەرکەوتبێت .
بەلام ڕۆڵ و کاریگەری شێخ سەعید نابێ لە بیر بکرێت . خاڵێکی تر کە زۆر گرنگە ، بەلام تا ئێستا ساغ نەبۆتەوە شۆڕشی ساڵی 1925 شۆڕشێکی دینی بوو یاخود شۆڕشێکی نەتەوەیی؟ بەهەرحاڵ لە مانگی یانزەی ساڵی 1924 شێخ سەعید بە خۆی و سەد سوارەوە لە ناوچەکانی دیاربەکر سەردانی عەشیرەتە کوردەکانی کرد ئەمەش هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ کۆکردنەوەی خەڵك و سەرۆك هۆزە کوردەکان بۆ هاوکاریکردنی شۆڕش . حکومەت لە نێوان ئیمزاکردنی پەیمانی لۆزان و لابردنی خەلافەت دا زنجیرەیەك کاری دژی کورد کرد . وەك لە پێشوتردا باسمان کرد کە زۆربەی نووسەران هاوڕان لەسەر ئەوەی کە سەرهەڵدانی شۆڕشی ساڵی 1925 دەرئەنجامی ئەوکارە خراپانەبووە.
بەلام ئەو وادەیەی دانرا بۆ شۆڕش ، پێشخرا بۆ 21 ی ئازاری 1925 ئەمەش هۆکاری هێنانی هێزی تورکیا بوو بۆ کوردستان و گوشار خستنە سەر دانیشتوانی کوردستان لە ڕۆژی 1925/2/15 ئاژانسی ئەنادۆلی تورکی بڵاوی کردەوە کە لە گوندی پیرانی نزیك ناوچەی (گەنج) مەفرەزەیەکی جەندرمە بۆتە دەمەقاڵەیان لەگەڵ پیاوێك بە ناوی شێخ سەعید کە نزیکەی 50 پیاوی لەگەڵ بووە لە ئەنجامدا دوو جەندرمە کوژران .
لە 23 / 2 / 1925 چاپەمەنیەکانی تورکیا بڵاویان کردەوە کە ئەمە کارێکی ڕێگرانەیە(91) .بڵاوکراوەیەکی سەربازی بەریتانیا لەقوستەنتەنیە دەڵێ کاریگەری وەها گرنگی نەبووە . بەڵکو تورکیا گەورەی دەکات لە 24 / 2 / 1925 وەزارەتی ناوخۆی تورکیا بڵاوی کردەوە ئەمە کارێکی بە بەرنامە و نەخشەیی یە . لە مانگی ئازاری داهاتوودا شۆڕشێکی گەورە سەرهەڵدەدات لایەنگرانی شێخ سەعید ژمارەیان دەگاتە (7000) حەوت هەزار چەکدار لە 26 / 2 / 1925 چاپەمەنیەکان ڕای دەگەیەنن و هەموو ناوچەکە لەژێر

کـۆنترۆڵی شۆڕشـگێراندایە بزوتنەوەکـەش لەبنەڕەتـدا شۆڕشـێکی ئـاینی یـە ئامـانجیش هێنـانەوەی یەکێك لەکوڕەکانی سـوڵتانە بۆ سـەر کورسی خەلافەت .

بۆ ئـەم مەبەستەش شۆڕش لە 21 / 3 / 1925 ڕاگەیـەنرا ئەمـەش بەهـاتنی هێزێکی تـورك بۆسـەر گوندی پیران و شـەڕو پێکدادان دەسـتی پێکرد لەئەنجامدا هێزی تورك شکستی خوارد . ئـەم شکستە و ئازاد کردنی دیار بەکرو دەورو بـەری بـووە هۆی بەئـاگا هاتنـەوەی تورکیـا و هەر زوو ئەنجومەنی نیشتیمانی تورکیا داوایـان کـرد کۆبوونەوەیەك ئەنجام بدرێ تابڕیـارێکی گرنگ و کۆتـایی بـدەن . کـە گرنگترینیـان دەرکردنـی حـوکمی عورفی لەگشـت ویلایەتـەکانی خۆرهـەلاتی تورکیـا واتـە کوردسـتان بـوو . نـاردنی هێزێکـی (25000 سـەربازی بەشـەمەندەفەر لەبـاکوری حەڵـەب و هـاوکاری کردنـی فەڕەنسـەکان بەکردنـەوەی سـنووری سـوریا و بانگهێشتکردنی لاوانی تورکی لەدایکبـووانی 18 سـاڵ تـا 28 سـاڵ. پاشـان دادگـای سـەربەخۆ دامـەزرا لەدیـار بـەکرو ئەنقەرە هەموو دەسـەلاتێکیـان پێدرا .

عیسمەت ئینینۆی سـەرۆك وەزیران هێزێکی گـەورەی مەشق پێکراو بەچـەکی نـوێ ی ڕۆژئـاوای نـاردە کوردستان ئـەم هێـزەش زیـاترلـە (25) هـەزار سەربـاز دەبـوون بـۆ ئـەم مەبەسـتە شـەڕ درێژەی کێشـا لـەنێوان هـەردوولادا دوا بنکەی شۆڕشگێڕان (دارەخـان ) بـوو کـوردەکـان شکستیـان هێنـاو شێخ سـەعید و دکتۆر فوئـاد و هـاوڕێکانیـان گـیران . لـەهـەمـان سـاڵیشدا بەدادگـایەکی نـادادپـەروەرانە لەسێدارەدران . خـاڵی شکستی شـۆڕش جـگە لـەنـابەرامبەری هێـزو ئـەو ئـامـادەبـاشیەی ئەنجومـەنی نیشـتمانی بـوو جـگە لەمەش پـێش دەسـتپێکردنی شـۆڕش زۆریـەی ئەفسـەرە کـوردەکـان لـەلایـەن تورکیـاوە گیران . لە هەمان کاتیشـدا یوسـف زیـا بـەگ سـەردانی تـەفلیس دەکـات وەك سـەرۆکی کۆمیتـەی کوردسـتانی بـۆ کۆمـەك و هـاوکاری لەنوێنـەرانی رووس (ئـاراڵۆف و شـاخۆڤیسـکی )بـەڵێنی تـەواوی پـێ دەدەن . کـە ئەوان دەسـەلاتی تەواویـان لەمۆسـکۆوە پێدراوەو بەڵێنەکانیش بریتی بـوو لـەهـاوکاری کـردن بـە پەنجـا هـەزار لـیرەو چـل هـەزار تفـەنگ ئەمـەش لەبەڵگەنـامەکان و ڕاپـۆرتی کونسوڵی

سۆڤیەت لەئەرزروم (پاڤلۆڤیسکی) لە 10 / 6 / 1923 ئەو بەلێنانەی بە (زیا بەگ و خالید بەگ ی سەرۆکی کۆمیتەی ئەرزروم درابوو وەك گاڵتە پێکردن و تەنانەت رایان وابوو بێ حورمەتی پێکردنە بۆ ئەو کەسانەی بروایان بە سەربەخۆیی کوردستان هەیەو هەوڵ دەدەن بۆ ئەو ئامانجە . (پاڤلۆڤیسکی) دەڵێ زیابەگ لێرە بەدواوە وتوێژ لەگەڵ ئارالۆف و شاخۆفیسکی بەمەبدەئی دانانێ و بەڵکو بەلایەوە سووکایەتی یە بەخۆی و بەکۆمیتەی کوردستانی کە ئەو دیاری کراوە بۆ وتوێژ لەگەڵ روسیا . . رووسەکان دەڵێن هێندە زیا بەگ نائومێد بوو لەڕوسیا گوێی لەوتەکانمان نەگرت و پێنج هەزار لیرەمان بۆ خۆی بەڵێن دابوو ، بەلأم ئاوڕی لێ نەدایەوە لیرەدا دەرئەکەوێت کە چەندە شێخ سەعید وەك شێخێکی تەریقەت لەهەوڵ دا بووبێ گرنگی کارەکان و قورسایی زیاتر لەسەر شانی یوسف زیا بەگ و خالید بەگی جوبران و ئەوانی تر بووە . دەرئەنجامیش تێدەگەین کە شۆڕشی سالی 1925هەرچەندە شۆڕشێکی ئاینی بووبێ زیاتر لەلای کەسایەتی یە ناسراو و باوەڕپێکراوەکانی تری کۆمیتە کوردستانی یەکان کەسەر بەڕێکخراوی ئازادی بوون شۆڕشێکی نەتەوەیی بووە ئامانج لای کۆمیتەکان تەنها سەربەخۆیی کوردستان بووە.

بەلأم دوای ئەوەی سالأنی 1923 – 1924 کۆمیتەکانی کوردستان . لەهەوڵ و تەقەلای بەدەست هێنانی پشتگیری ڕوسەکاندا بوون . بەو پێ یەی دوژمنی هاوبەشیان کۆیان دەکاتەوە کە ئەویش دەولەتی تورکیایە . دوای نائومێد بوون لەبەڵێنەکانی نوێنەرانی رووسیاو پێش خستنی بەرژەوەندی یە بالأکانی تریان لەهەولی سەرقالْ کردنی کوردەکاندا بوون کە شۆڕش بەناچاری دەستی پێ کرد . چونکە هیچ هاوکاری و پشتیوانی یەك نەبوو کە وەك بەڵێن درابوو . پەیمانی لۆزانیش لەبەرژەوەندی تورکدا بوو . کەواتە دەگەڕێینەوە بۆ ئەو خالەی کەدەڵێن ئایا شۆڕشی سالی 1925 شۆڕشێکی دینی بووە یاخود نەتەوەیی ئەمەش دەرئەنجامەکان دەری دەخەن کە ئەو شۆڕشەی دەستی پێکرد شۆڕشێکی نەتەوەیی و دینیی بووە و هەرچەندە دەرەنجامی شۆڕش بەشکست و لەناوچوونی

گیانی خۆیـان کۆتایی هــات ، بــەڵام بـیری نەتــەوەیی ڕۆژ لــەدوای ڕۆژ لەهەڵکشـاندابــوو . دوای کۆتایی هاتنی شۆڕشی شێخ سەعید حکومەتی باشـوری کوردسـتانیش وەك ئـەوەی کەنوێنـەران و سـەرکردەکانی لـە دەرەبـەگ و موڵکـدار و بورژوازیـەکان پێـك هـاتبوو لەگـەڵ ئەوەشـدا پەرۆشـی پەرەپێدان و پێشکەوتنی کوردستان بوون.ئەم حکومەتە ڕەوشێکی باشی خوڵقاند بۆ پێشـکەوتنی وڵات لەڕووی ڕۆشنبیری و ئابورییەوە .هەروەهارۆڵی هەبوو لەپێك هێنانی هێزی پێشـکەوتنخوازی و سیاسـی کـورد.(95) ڕاگەیانـدنی ئۆتۆنـۆمی باشـوری کوردسـتان هاوکـات بـوو لەگـەڵ بەسـتنی پەیماننامەی ئنگلۆ–عێراقی لەتشرینی یەکەمی ساڵی 1922مەرجەکانی ئەم پەیماننامەیـە لەسـەر عێراق زۆر توندبوون.مەبەستیش ئەوەبوو کەبەریتانیا کۆنترۆڵی سیاسی و ئابوری عێراق بکات بۆیە ئەم پەیماننامەیە تورەی و بێزاری خەڵکی هێنایە کایـەوە هـەروەها ئـەو پەیماننامەیـە بێـزاری لای سەرجەم خەڵکی کوردستان دروسـت کـرد مـاددەی سـێیەمی ئـەم پەیماننامەیـە کەپەیوەسـتە بـە (ئازادیی ویژدان و یەکسانیی نەتەوەکان) هیچ ئومێدو ئاسودەییەکی نەبەخشی بـەهێزە نەتـەوەیی یـەکانی کـورد کـەبۆ بـەدیهێنانی مـافی چارەنوسـی نەتـەوەیی تێدەکۆشـا.هەروەها پەیماننامەکـە لەئاست (خۆبەڕێوەبردنی کورد بێ دەنگ بوو).لەکۆتایی ساڵی 1922دا حکومەتی شێخ مـەحمود چەندین نوێنەری خۆی ڕەوانەی بەغداد کرد بۆباسکردنی ئەو پرسانەی کەپەیوەسـتن بـەئۆتۆنۆمی بۆ کورد بەڵام لایەنی ئینگلۆ–عێراقی داوا ڕەواکانی سەرکردەکانی کوردی لەبارەی خۆ بەڕێوەبردن بەگران وەسف کرد،بۆیە وتوێژەکان بەبن بەست گەیشت،هەروەکو ئەنجامی وتوێـژەکان نوێنـەرانی حکومەتی سلێمانی تۆفیق بەگ و عبدالرحمن ئاغا و عیـزەت بـەگی جـاف و مسـتەف پاشـا لەگـەڵ ئەدمۆنس دا. ئەدمۆنس لەیاداشتێکدا نوسیویەتی: زۆر سەرسام بووم،کاتێ کورد بەناوی ئەندامانی حکومـەتی کـاتی کـوردی قسـەیان دەکـرد(96). دوای ئـەوەی شـێخ مـەحمود دڵنیـا بـوو لـەوەی کەئینگلیز هەروەکو ساڵی 1919مامەڵەی لەگەڵ دا دەکەن، ئـەویش دەگـەڕا بـەدوای هاوپـەیمانی نوێ دا لەگەڵ ئەوانەی کە بڕوایان بەخەباتی ڕەوای کورد هەبوو تا ئەو لایەنگریانە بەدەست بهێنێت . پەیوەندی کردنی شێخ مەحمود بەعەرەبەکانی عێراق بۆ شۆڕشی سەرتاسەری دژی بەریتانیا وای کـرد کەسـەرکردەی ئـەرکانی هێزەکـانی ئاسمـانی بەریتانیا(سـالمۆند)لەڕاپۆرتێکدا لـە22ئـاداری

1923* بۆ وەزیری هێزی ئاسمانی لە(لەندەن)ناردووە و نوسیویەتی کورد بەیەکەوە لەگەڵ ناسیۆنالیستانی عەرەب لەعێراق کارناکەن بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی سەرتاسەری لەیەك کاتدا . بەڵکو پەیوەندی یان لەگەڵ تورکیش دا هەیە لەو هەلومەرجەدا شێخ مەحمود بۆ روونکردنەوەی ئەم خاڵە بانگهێشتی بەغدا کرا بەڵام ئەو چوونی بۆ بەغداد رەتکردەوە. دەرئەنجامی هێزی ئاسمانی بەریتانیا دژی کورد بەکارهێنرا.لە3ئاداری 1923 شاری سلێمانی لەلایەن فڕۆکەکانی ئینگلیزەوە بۆردومان کرا.

هەر لەپێش هاتنەوەی سوپای ئینگلیز حکومەتی شێخ مەحمود بڕیاری دا بەگواستنەوەی بارەگای حکومەت و ئۆردوی کوردستان بۆ سورداش ئیتر سلێمانی چۆڵکراو ئۆردوی کوردستان بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود لەجاسەنە مۆڵی خوارد.لەراپۆرتێکی سالح زەکی بەگ فەرماندەی بەرگری بەرەی دەربەندی بازیانی پێ سپێردرابوو دەڵێ (دوژمن جێگا گرنگەکانی دەربەندی گرتووە.منیش فەرمانم دا کەهێزی پیادەو سوارە شەڕی بەرامبەر نەکەن و بکشێنەوە ئەو عەشایەرانەی کەلەوێ بوون هەموو دزیان لەگەڵ کردین بەبێ شەڕ رێگاکەیان بۆ دوژمن چۆڵ کرد. دوژمن بەهێزێکی زۆرەوە بەرەو دۆڵی سورداش هات لەبەرئەوە بارەگای لەشکرمان گواستەوە بۆ هەڵەدن و خێزانەکانیشمان روویان کردە گەلای ماوەت و دێ ی سەفرەو

............................................

*22ئاداری 1923ئەم بەروارە رەنگە هەڵەبێ چونکە دوای نوسینی راپۆرتەکە سلێمانی بۆردومان کرا ئیتر چۆن لە3ئادار سلێمانی بۆردومان دەکرێ .رەنگە 22ی شوبات بێت

لەکۆتایی مانگی ئاداری 1923 هێزەکانی بەریتانیا چەندین پەلاماری فراوانی کردە سەرکورد لەئاکامدا بەشێکی زۆری خوارووی کوردستان ی داگیرکرد.

زەروون و لەوێ نیشتەجێ بوون.(97) هەموو ڕۆژێك فڕۆکەکانی ئینگلیز بۆردومانی ناوچەکانی سلێمانیان دەکردو ژن و منداڵ و خەڵکی سڤیلیان دەکوشت و گوندەکانیان دەسوتاند. لەناوچەکانی سلێمانی و کەرکوك لەشکری شێخ مەحمود پەلاماری سوپای ئینگلیزیان ئەداو شەڕی پارتیزانیان دەکرد. دوای ئەمانە شێخ مەحموود بەباشی زانی بارەگای لەشکری کوردستان بگوێزێتەوە بۆ قەلاچوالان و ئەوێ بکات بەبارەگای سەرەکی.

لەناوەڕاستی تەمووزی 1923دا ئەنجومەنی عێراقی ئەم بەیاننامەیەی دەرکرد.

1-حکومەتی عێراقی بەنیاز نی یە فەرمانبەر لەناوچە کوردییەکان دابمەزرێنێ.بێجگە لەکادێرانی تەکنیکی.

2-حکومەت بەنیاز نی یە دانیشتوان ناچار بکات زمانی عەرەبی لەدۆسیە فەرمی یەکاندا بەکاربهێنێ.

3-ئازادی داب و نەریتە ئاینییەکان لەناوچە کوردییەکان دەستەبەردەکا.

حکومەت ئەم بەیاننامەیەی لەبەرچەند هۆکارێکی تەکنیکی دەرکردهەروەها بەمەبەستی پەرتەوازەکردنی هێزە ناسیۆنالیستەکانی کوردی.بەلام لەناو جەماوەری کوردی دا هیچ بایەخێکی نەبوو لەپاڵ ئەمەشدا چەکدارانی کورد لەهەڵەبجەو قەرەداغ و ناوچەکانی تر ئامادەیی خۆیان بۆ شەڕ لەپاڵ شێخ مەحمود دژی داگیرکەران ڕاگەیاند.لە16ئاب سەرلەنوێ شاری سلێمانی بەدڕندەیی لەلایەن فڕۆکەکانی بەریتانیاوە بۆردومان کرایەوە لەئاکامدا ژمارەیەکی زۆر ژن و منداڵ و پیرو پەککەوتە بونە قوربانی. تورکیاش دژی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردستانی خواروو وەستا ئەوەبوو لەزستانی ساڵی 1923دا هێزەکانی لەناوچەکانی سەرسنوری ویلایەتی موسڵ زێدەتر کرد(98).

کاپتن لاین لەیاداشتەکانیدا دەڵێت: دانیشتوانی سلێمانی چونکە کوردی نەتەوەیی بوون و لەهەڵبژاردنی مەلیك فەیسەڵ دا ڕاوێژیان پێنەکرا، لەکاتێکدا خەڵکی کەرکوك ڕەگەزە تورکەکە باڵادەست بوو، بەئاشکرا فەیسەڵیان ڕەتکردەوە.ڕاستە ژمارەیەك عەرەب لەلیوای کەرکوك

هەبوون بەتایبەتی عەشیرەتی عوبێدی کۆچەریی کەلەدەشتی نێوان تەپۆلکە کوردی یەکان و دیجلەدا دەژیان .

هەروەها جەبووری یە سوزەنەکاویەکان* کەتامەزرۆی ڕاوە جرجی ڕووبارەکە بوون تاکەنارەکە نیشتەجیٚ بوون-وێرای کوردەکان ژمارەیان زۆر زیاتر بوو کەچی تورکمانەکان کاریگەری سیاسیان بەهێزتربوو،بەوەش هەرچەندە ئەوانە بەتورکمان دەناسران،لەکوردو عەرەب زیاتر ملکەچی یاسابوون. بەلأم کەلینێکی ئاشکرایان بۆ ئێمە سەبارەت بەبانگەشەی ئێمە بۆ هێشتنەوەی ولایەتی موسڵ لەبندەستی خۆماندا پێك هێنا کەبەردەوام ململانێی لەسەربوو. خۆشبەختانە لیوای کەرکوك سنوری نەبوو،بەلأم لەڕۆژهەلأتەوە قەزای چەمچەماڵ ولیوای سلێمانی هەبوون.

کوردەکان هەر لەسەرەتای داگیرکردنی خوارووی کوردستانەوە سوپای بەریتانیایان بەڕزگارکەر تەماشا دەکرد خۆشحاڵ بوون بەهاتنی سوپای ئینگلیز چونکە زۆر نەهامەتیان چەشتبوو بەدەست تورکە عوسمانیەکانەوە بەلأم دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت ئینگلیزەکانیش هیچیان پێ نیە بۆکورد ئیتر بۆبەرگری لەخۆکردن لەڕووی ئینگلیزەکاندا وەستانەوە. هەرلەم پێناوەشدا لەمانگی مارتی 1919دا کوردەکانی ناوچەی زاخۆ کاپتن (پێرسن)یان کوشت لە14ی تەمووزیشدا کاپتن(ئوللی)لەئامێدی کوژرا پاشان لەسەرەتای مانگی نۆڤەمبەرداکوردەکانی ئاکرێ و زێبار ڕاپەڕین و سەرئەنجام کاپتن(سکوت)وکاپتن(بێل) کوژران(99). شۆڕش و پاشاگەردانی کوردستانی گرتەوە.ویلسن لەراپۆرتێکدا کەبۆحکومەتی بەریتانیای نوسیبووی.

.......................................

*سوزەنەکاویەکان:جۆرە نەخۆشیەکە دەرئەنجامی کاری ناسروشتی سێکسی توشی ئەندامی نێرینە دەبێت دیارە ئەو جۆرە نەخۆشی یە باوبووە لەناو ئەو عەشیرەتەدا.بڕوانە یاداشتەکانی کاپتن لاین(کوردو عەرەب بەریتانیەکان وەرگێڕانی دکتۆر یاسین سەردەشتی ل103.

دەڵێ(هەراو گێرەشێوێنی هەموو سنوری گرتۆتەوە)لە14ی تەمووزی 1919دا کوردەکانی بادینان ڕاپەڕین و ناوچەی ئامێدی یان لەئینگلیزەکان سەندەوە ئەفسەرە سیاسیەکانی ئینگلیز کوژران.هێزێکی تیپی 13بەسەرکردایەتی (نەیتنگڵ)لەدوری 25میل لەشاری ئامێدی جێگیرکرا بۆ هێرش بردنە سەر کوردو خۆیی سازدا لەماوەی 15ڕۆژدا ئینگلیزەکان هێزی تریان کۆکردەوە وپاشان هێرشیان بردە سەر کوردەکان لەسەرەتای ئابدا سوپای ئینگلیز سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ڕاپەڕینەکەی کوژاندەوە وهەموو ڕابەرەکانی بەدیل گرت بەڵام ئەم سەرکەوتنەی ئینگلیز کوردی لەخەبات ڕانەگرت لەحوزەیرانی 1920دا کوردەکان لەگەڵ (مزیرکان)300سەربازی ئینگلیزیان کوشت(100).

لەناوچەکانی دەوروبەری سلێمانی و شارباژێر لەسەرەتای بەهاری 1925بەفەرمانی شێخ مەحمود لەشکرێکی زۆر کۆکرایەوە بەرەو ناوچەکانی سلێمانی و کەرکوك.بەئامانجی هێرش بردن و پەلاماردان–هێزێکی لیڤی گەورە بەیارمەتی چەند فڕۆکەیەك دوای شەڕێکی سەخت هاتنە چوارتا و لەوێشەوە هێرشیان هێنا بۆ(کەناروێ)کەبارەگای شێخی لێ بوو.پاش شەڕێکی خوێناوی،فڕۆکەیەکی دوژمن پێکراو خرایە خوارەوە و زیانێکی زۆر بەر سوپای دوژمن کەوت سوپای کوردیش دەستکەوتێکی باشی هەبوو.لەشکری داگیرکەر بەشکاوی بەرەو (چوارتا)گەڕایەوە.بەڵام بەداخەوە هەست بەئازایەتی کردن وای لە(کەریم بەگی فەتاح بەگ)ی هەمەوەند و(شێخ محەمەد سەییدە بچکۆلە)کرد کەڕێگای ئەزمڕ لەسوپای دوژمن بگرن و دوای سێ ڕۆژ شەڕی خوێناوی لەشکری کورد کشایەوە و دوژمن (کەناروێ)ی سووتاند،لەم شەڕەدا دوژمن گەمارۆی شێخ مەحمودیاندا. ماجد مستەفا و یونس عبدالقادر.داوایان لەشێخ کرد بچێتە دواوە تاکو ژیانی لەمەترسی ڕزگاربێت دوای ئەو شەڕە شێخ مەحمود گەڕایەوە بۆ دێی (کەنەسوورە)ی نزیك ناوچەی (بانە)(101).

هەر لەم سەروبەندەدا کاربەدەستانی تورك زۆر دڕندانە مامەڵەیان لەگەڵ کوردانی ڕاپەڕیوی باکوردا دەکرد دوای کۆتایی هاتنی شۆڕش ئیتر کەوتنە قەڵاچۆکردنیان، کوردانی گشت

پارچـەکانی نیگـەرانی و نـاڕەزایی یـان دەربـڕی بـۆ ئـەم مەبەسـتە سمکـۆ گشـت لایـەك ئاگاداردەکاتەوە لەدڕندەیی تورکەکان و ئەو مامەڵە نادروستەی کەبەرامبەر بەڕابەرانی شۆڕشی ساڵی 1925کرا .

مێژوونوسـی گـەورە دکتـۆر کـەمال مەزهـەر لـەگۆڤاری ڕەنگـین ژمـارە 16دا نامەیـەکی نێـوان سمکۆی شکاك بۆ بابکر ئاغای پشدەر بڵاودەکاتەوە کەبەبۆنەی لەسـێدارەدانی شـێخ سـەعیدی پیران و هاوڕێکانی یەوە،لەئەرشیفی بەریتانیا هاتووە.

لەدەوروبـەری سـاڵی 1914وە نـاوی سمکـۆ بۆتـە یـەکێك لـەناوە ناسـراوەکان لای دەزگـا دیبلۆماسـیەکانی ڕووسـیاو بـەریتانیاو ئێـران و تورکیا.لەباڵوێزخانـەی هەریـەك لـەوەزارەتی هەندەرانیان دۆسیەکی گـەورە بۆسمکـۆ تـەرخانکراوە.دکتۆر کمـال دەڵێـت ئەم(قسـەیە تـەواو ڕاست و دروستە تەنها من بۆ خۆم بەسەدان و سەدان جار ناوی سمکۆم لەناو بەڵگەنامـە نهێنـی یـەکانی بـەریتانیاوعێراق دا بینیـوە بەڵگەنامـەی ئـەوتۆیان تێدایـە پـتر لـەدوو سـێ لاپـەڕەی پڕکردۆتەوە ئەمەش ژمارەیەکی گەورەیە. چونکە بەڵگەنامەی دبلۆماسی بەچڕو پـڕی بـۆ تاکـە ڕووداوێك یا دیاردەیەك تەرخان دەکرێت هەر لەبەر ئەوەشە کەسمکۆ شوێنێکی دیاری لەناو ئەو بەرهەمانەدا بەردەکەوێت کە بـۆ لێکدانـەوەی مێـژووی هاوچـەرخی کـورد تـەرخان کراوە.تـەنها لازاریف لەبەرهەمە نازدارەکەی خۆیدا (( زۆرانبازی لەسەر کوردستان)) کە تەنها بۆ دوا دەساڵی سەدەی نۆزدەهەمین و سەرەتای سەدەی بیستەمی تەرخان کردووە بەلایەنی کەمەوە بیست و هەشت جاران ناوی سمکۆی هێناوە بابـەکر ئاغـای پشـدەریش لـەسمکۆ کـەمتر ناسـراوە بـەڵام ئەویش کەم نەبووە پیاوێکی زۆرزان و زیرەك و داناو دووربین بلیمەت و هۆشیاربوو.

بابکر ئاغا هەر زوو لەوە تێگەیشت کەکەمالیەکانی تورکیا لەگەڵ نەتەوەیی کورددا نیازپاك نـین لەبەرئـەوە بەگفتـەکانیان هەڵنەخەڵـەتاو دژی تورکخواکـانی کوردسـتان وەسـتا ئەوەنـدە زۆری نەبرد لەناو کورددا ڕیسوا بوون بەتەوسەوە خـەڵکی کوردسـتان ناویـان لێ نان(جـل خوارەکـان) بابکر ئاغا پێی وابوو لەوانەیە کورد بتوانن لەڕێگەی ئینگلیزەوە شتێك بۆخۆیان هەڵکرێنن بەڵام

لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژێك لەڕۆژان دژی شێخ مەحموود نەوەستا. لەگەڵ کۆتایی هاتنی شۆڕشەکەی شێخ سەعیددا ڕەفتاری بێ ئەندازە دڕندانەی کەمالی یەکان بەرامبەر بەڕابەرانی کورد لە باکوردا هەموو ئەو کوردانەی بەخەبەر هێنا کەتورك دەستخەڕۆی کردبوون حوزەیرانی سالی 1925 بڕیاری خنکاندنی شێخ سەعیدی پیران و دکتۆر فوادو نزیکەی پەنجا نیشتمان پەروەری دڵسۆزی هەژاند.کوردی بەغداد ڕۆژی 26/حوزەیران/1925کۆبونەوەیەکی گەورەیان لەپارکی(مۆد)سازکردو بروسکەی ناڕەزایی خۆیان دایە کۆمەڵەی نەتەوەکان و گشت دەوڵەتە گەورەکان وادیارە ئەم بەسەرهاتە دڵتەزێنانە سمکۆیان بەجارێك شێتگیرکردووە پاڵیان پێوە ناوە بەرامبەر تورك بەهەڵوێستی خۆیدا بچێتەوە .سمکۆ زوو دەبزوا زوو بڕیاری دەداو دەست و برد ئەوەی دەکرد کەبەڕاستی دەزانی و پێ ی دەکرا.

لەوکاتەدا لەناوهەمواندا دووربینی بابکر ئاغای پشدەر دێتەوە یاد یەکسەر نامەیەکی تایبەت بۆ ئەوو لەڕێگەی ئەویشەوە ژمارەیەك نامەی تر بۆ ڕابەرانی کورد بەڕەشید جەودەت دادەنێرێت.سمکۆ زۆر بڕواو متمانەی بەڕەشید جەودەتی برای مەحمود جەودەت بوو دەیزانی کوردپەروەرێکی بێ غەل و غەشە بۆیە ئەوی بۆ ئەو کارە هەڵبژارد.ڕەشید جەودەتیش کەدەرچووی فێرگەی سەربازی عوسمانی بوو بڕوای تەواوی بەکوردایەتی سمکۆ بوو.ڕەشید جەودەت تامرد بەڕێزەوە ناوی سمکۆی دەهێنا کوڕە گەورەکەی بەناوی خەسرەوی کوڕی ئەوەوە ناونا.

ئینگلیزەکان وێنەی ئەو نامەیان دەستکەوتووە کەڕۆژی26/حوزەیران1925سمکۆ ناردویەتی بۆ بابکر ئاغای پشدەری واتە لەو ڕۆژانەدا کەلە دیاریەکر بڕیاری خنکاندنی شێخ سەعیدی پیران و هاوەڵەکانی دەردەچێت.ئینگلیزەکان یەکسەر نامەکە دەکەن بەئینگلیزی و وێنەی لێ دەنێرن بۆ لەندەن و بەغداد دانەیەك لەو نامەیە بەئینگلیزی لەسەر ئەو فایلە نوسراوە (کەسایەتیەکان.سمکۆ)ئەمەش دەقی وەرگێراوی ئەو نامەیەیە کەخۆی لەخۆیدا بەڵگەنامەیەکی مێژوویی بایەخداری پڕ لەدەرس و پەندە

"سۆما

26ی حوزەیران 1925

بۆ بابکرئاغا

برای بەڕێزم

پتر لەجارێك باسی دروستی و تێگەیشتنی خۆمم کردوە دەربارەی ئەو سیاسەتەی ئێوە چەند ساڵێکە لەپێناوی بەرژەوەندی و بەرەو پێشچوونی نەتەوەکەماندا پەیڕەوی دەکەن ڕەفتاری دڵڕەق و دڕندەی تورك لەگەڵ گەلەکەماندا.بەتایبەت لەم چەند مانگەی ڕابردوودا لەوانەی گەیاندین کەباوەڕمان پێ یان بوو.لەوە دڵنیام لەمەودوا لەسەر ڕێبازی خۆت سورتر دەبیت و کۆششێکی زۆر بۆ ڕزگارکردنی نەتەوەکەمان دەکەیت تورکەکان هەمیشە نەیارمان بوون.ئەویش نەك تەنها لەبەر ئەوەی بڕیاریان داوە نەتەوەکەمان قڕبکەن.بەڵکو لەبەرئەوەیش کەبەتەواوەتی دەستبەرداری ئیسلام بوون و تەخت و تاراجی خەلافەتیان هەڵتەکاندووە.نامەی نەسیحەتم بۆ ژمارەیەك هاوڕێ هەڵخەڵەتاوەکانمان نوسی وە ئەوانەی باوەڕیان بە تورکەو تائێستاش هەرخزمەتی دوژمنی باوەکوشتەی ئاین و نەتەوەکەمان دەکەن.ڕەشید جەودەت ئەفەندی ئەو نامانەتان بۆ دەهێنێت ئێوەش بۆیانی ڕەوانەبکەن.ئەو نامانە سەرنجیان بۆ ئەو ڕاستیانە ڕادەکێشن کەبۆمان شیکردوونەتەوە لەسەر تۆش پێویستە لەمەودوا خۆتیانی لێ نزیك بکەیتەوە و وایان لێ بکەیت لەدیوی ناوەوەی ئەو سیاسەتە تێبگەن کەتۆ پەیڕەوی دەکەیت بەو

جۆرەش ئێوەو ئەوان دەتوانن بەرەیەکی گەورەی ئەوتۆ پێکهێنن کەببێتە پاڵپشتمان بۆ سەندنی تۆڵەی شەهیدەکانمان و ئەوانەی خۆبەخت دەکەن.من تەواو لەگەڵ سیاسەتی تۆدام.چونکە ئەو ڕێگە دروستەی تێدا بەدی دەکەم کەبۆی هەیە بمانگەیەنێتە ڕزگاری گەلەکەمان.ڕەشید جەودەت ئەفەندی بەدورودرێژی باسی دڕندەیی تورکەکانت بەرامبەر بەکورد پێ ڕادەگەیەنێ لەگەڵ ڕێزی زۆرم.

## ئیمزا
## سمکۆ

کریس کۆچێرا لەکتێبەکەیدا لاپەڕە104دا دەڵێ:کەسمکۆ لەلایەن ئێرانیەکانەوە شکاو چووە خواروی کوردستان لەوێوە دووبارە گەڕایەوە بۆ ناو خاکی تورکیا وە ماوەی ساڵێك لە(تورکیا)خۆی حەشاردا،لەساڵی 1924دا هاتەوە ناو خاکی ئێرانەوە لەگەڵ سەرلەشکر(عەبدڵڵای تەهماسبی)کە سەرکردەی هێزی شیمالی ئێران بوو چاویان بەیەکتری کەوت و دوای ئەوە پاش ساڵێك لەساڵی 1925چووە(چەهریق)و (ڕەزاشاە) دڵنەوایی کردو ئەویش سوێندی خوارد کە هەتا ماوە بێدەنگ دانیشێت.بەڵام لەپاش ساڵێك دووبارە سەری بەرزکردەوەو بەیارمەتی چەند کەسێك لەعەشیرەتی هەرکی هێرشیان بردە سەر شاری (سەڵماس)و گەمارۆی شارەکەیان دا بەڵام ئەو جارەش شکاو هەتا سنوری تورکیا کشایە دواوە لەوێ تورکەکان گەمارۆیان داو چەکیان کرد لەکۆتایی ساڵی 1926دا چووە ناو خاکی عێراقەوە لەساڵی 1927 دووبارە چووە ناوخاکی تورکیاوە سەرلەنوێ لەساڵی 1928دا لەگەڵ چەند پیاوێکی خۆیدا چووە ناوخاکی عێراقەوە لەو کاتەی کەحکومەتی ئێران داوای سمکۆی

کرد لەعێراق.حکومەتی عێراق لەوەڵامدا ووتی سمکۆ پەنابەری سیاسی یە دووبارە پاش چەند مانگێك گەڕایەوە بۆناوخاکی ئێران و بوو بەحاکمی شنۆ*

لەخوارووی کوردستانیش لەکانوونی دووەمی 1925کۆمەڵەی گەلان،وەفدێکی نارده کوردستان راپرسیەك بەئەنجام بگەیەنن(102). چونکە ئینگلیزو تورك نەیانتوانی بەگفتوگۆ کێشەی ویلایەتی موسڵ بەلادا بخەن .لەو راپرسیەدا کوردی سلێمانی و کەرکوك دژی لکاندنی بەعێراقەوە دەنگیان دا.کوردی هەولێرو موسڵ لەگەڵ ئەوەدابوون بەعێراقەوە بلکێنرێ بەمەرجێ ئۆتۆنۆمیان لەچوارچێوەی عێراق دا بۆ دەستەبەربکرێت.شێخ مەحمود دوور لەسلێمانی سەرەوکاری شەڕی چەکدارانەی دژی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی دەکرد،بۆیە مەندوبی سامی بەریتانیا لە13ی حوزەیرانی 1925دا خەلاتێکی(6000)رووپیێ یی بۆ سەری شێخ تەرخان دەکات.لەگەڵ ئەو هەموو بەرهەڵستکاری و بەرەنگاری یەی کورددا وەفدەکەی کۆمەڵەی گەلان لە16ی تەمووزی 1925بڕیاری لکاندنی وویلایەتی موسڵ (خوارووی کوردستان)یان بەعێراقەوە دا بەو مەرجەی خۆیان خۆیان بەڕێوەبەرن.کەتائێستاش بۆ ئەو خۆبەڕێوەبردنە کورد تێ دەکۆشێ لەگشت ناوچەکانی خوارووی کوردستاندا.

لە1925/12/16کۆمەڵەی گەلان بڕیارێکیان دەرکرد کەتێدا پێشنیاری لکاندنی خوارووی کوردستان یان بەعێراقەوە پەسەندکرد.ئینگلیز لە1926/2/24دا کۆمەڵەی گەلانیان دڵنیاکردەوە کەئەو مافەی کورد مسۆگەر دەکات(103).

عێراق ناچاربوو وەکو پاداشتێك بەرامبەر بەوەی خوارووی کوردستانی پێشکەش کرا لە1926/1/18دا پەیمانێك لەگەڵ ئینگلیزدا مۆر بکات.

.......................................

*هیچ سەرچاوەیەك باسی نەکردووە،کریس کۆچێراش ئاماژەی نەداوە بەهیچ سەرچاوەیەك رەنگە ئەو کاتەی کەگەڕاوەتەوە بۆ ووتوێژ لەگەڵ حکومەتی ئێرانیدا چوویێتە شنۆ ئەویش ساڵی 1930بووە(نوسەر)

عەرەبەکان تەنیا بەو پەیمانە ڕازی بوون.چونکە ئەو دیاری یەی ئەم پەیمانەی سازکرد گەلێك پڕ بایەخ بوو وەك سەرەك وەزیرانی عێراق پێی لێنا.عێراق بێ کوردستان ناتوانێ بژی. چونکە کوردستان بۆ عێراق وەکو سەرە بۆ لاشەی مرۆڤ.ئەوکاتەش ڕژێمی عێراقی کوردی بەبەڵێنی بێ کاکڵە هێوردەکردەوە.سەرەك وەزیرانی عێراق لە1926/1/21دا لەبەردەم پەرلەماندا دەڵێ:

بەڕێزان(گەر هەموو توخم و تۆوەکانی عێراق مافی خۆیان نەدرێتێ،ئەم وڵاتە توانای ژین و بەردەوامی نابێت.دەبێت مافی کورد دەستەبەربکرێت.دەبێت فەرمانبەرانیان لەخۆیان بن،زمانەکەیان بکرێتە زمانی ڕەسمی یان.دەبێت منداڵانیان لەقوتابخانەدا بەزمانی زگماکی خۆیان فێرکرێن).

لە1927/6/2دا پاش ڕێکەوتن لەگەڵ ئینگلیز شێخ مەحمود ناچار بوو داوای پەنابەرێتی لەئێران بکات.لەساڵی 1929دا ئینگلیزەکان بەڵێنی دا بەئەندام بوونی عێراق لە کۆمەڵەی گەلان.بۆیە عێراق پەلەی بوو تازمانی کوردی بەڕەسمی بناسێ لەناوچەکوردنشینەکاندا ئەمەش وەك نیازچاکی بەرامبەر بەگەلی کورد.

لەساڵی 1930ئینگلیزەکان داوای بەستنی پەیمانیان لەگەڵ عێراق کرد ئەمەش بۆ بەستنەوەی عێراق بەخواستەکانی ئینگلیزەوە بۆ هەرکارو بۆ کاتێکی پێویست.

# ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی

لەدوای ڕێکەوتنامەی ساڵی 1930لەنێوان عێراق و بەریتانیا کەلەهیچ بەندێکی ڕێکەوتنامەکەدا مافەکانی کوردی مسۆگەر نەکردو خەڵکی شاری سلێمانی ناڕازی بوون لەڕۆژی 6ی ئەیلولدا لەبەردەرکی سەرای شاری سلێمانی ڕاپەڕینێکی جەماوەری هەڵگیرسا چونکە هەموو سیاسەتمەداران و ڕۆشنبیرانی عەرەب لەعێراقدا مافی دروست کردنی ڕێکخراوو پارت و کۆمەڵەی سیاسی یان هەبوو(105). بەڵام کورد لەو مافە بێ بەش کرابوو،هەروەها ئەو گفتە سەرزارەکیانەی حکومەتی عێراقی بۆ دابین کردنی خۆبەڕێوەبردنی خەڵکی کوردستان هیچی نەچووە بواری جێ بەجێ کردنەوە و کورد نائومێدبوون بەئاشکرا لەڕاپرسیەکەی پێشوتردا ناڕازی بوونی خۆیان لەلکاندنی خواروی کوردستان بەعێراقەوە نەشاردەوە بەڵام لەمەشدا هیچ حساب بۆ کوردنەکرا لەهەمان کاتیشدا متەسەریفی سلێمانی تۆفیق وەهبی بەگ لەسەرکارەکەی دوورخرایەوە کەلای خەڵکی شار پیاوێکی نیشتیمان پەروەرو خۆشەویست بوو ئەمانە هۆکاری سەرەکی هەڵگیرساندنی ڕاپەڕینەکە بوو.بۆ دیاری کردنی ڕۆژی 6ی ئەیلول کەڕۆژی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بوو وەك بەرپەرچ دانەوەیەك ڕاپەڕین دروست بوو.لەو ڕۆژەدا جەماوەر لەبەردەرکی سەرا کۆبوونەوە. فایەق بێکەسی شاعیریش ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لەهاندانی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگاو قوتابیان و کاسبکارو دوکاندارو بازاڕەکان داخران ژمارەی خۆپیشاندەران لەهەزاران کەس تێ پەڕی هەربۆیە حکومەت بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە هێزێکی زۆری ڕەوانەی ناوسەرای سلێمانی کرد بەسەریانەکاندا بڵاوبوونەوە.پاشان کەوتنە گوللەبارانکردنی خەڵکی بێ چەك وڕاپەڕیوو.خەڵکەکە لەسەرەتادا بەخوێندنەوەی شیعری نەتەوەیی وبزواندنی هەستی خەڵك و پۆلیسەکان کەوتنە تەقەو جەماوەریش بەدارو

بەبەرد لەبەرامبەریان وەستانەوە کاربەدەستانی ناو سەرا داوای هێزی زیاتریان کرد لەو کاتەدا 100سەربازی پڕ چەك هاتن بۆ یارمەتی پۆلیسەکان.ئەهلی شار کەئەمەیان بینی ئەوەندەی تر شێلگیرتربوون(106). ئیتر کار لەکارترازا بەتفەنگ و دەمانچە بەربوونە تەقەکردن لەخەڵك لەپەنجەرەکانی سەراوە.فەرماندەی سەرا کەبینی خوێن ڕژاوە داوای هێزێکی تری کرد خێرا فەوجێکی تر هات مەترە لۆزیان دامەزراندو کەوتنە تەقەکردن تالای نیوەڕۆ ئەم شەڕە درێژەی هەبوو پاشان بلآوە بەخەڵك کرا بەپێی بەیانێك کەحکومەت بلآوی کردەوە دەڵێ(لەکارەساتی 6ی ئەیلوولی سلێمانی دا 9پۆلیس بەدارو بەرد وخەنجەر برینداربوون و سەربازێك کوژراوە وسێ سەربازیش برینداربوون)بەلآم ڕاستیەکەی 45کەس کوژراو195کەسیش بریندار بوون هەربۆیەش بەو ڕۆژە ئەوترێ(ڕۆژی شەشی ڕەشی ئەیلول)پاشان حکومەت کەوتە گرتنی سەرانی خۆپشاندەران کەبریتی بوون{(1) عەزمی بەگی بابان 2-شێخ قادر شێخ سەعید 3-ئەوڕەحمان ئاغا 4-حمە صالح بەگ 5-حمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغا 6-عیزەت بەگی وەسمان پاشا 7-فایەق بەگ 8-شێخ محەمەد گولآوی 9-مجید ئەفەندی کانیسکانی 10-ڕەمزی فەتاح 11-تۆفیق قەزاز}

دەسەلآتدارانی عێراقی ئیتر ترس و خەمیان نەما.دەم و دەست شەڕ دژی شێخ مەحمود دەست پێ دەکاتەوە. لەسەرەتای شوباتی 1931شێخ مەحمود یەکەمین نامە بۆ کاپتن(هۆڵت)ی سکرتێری بەشی ڕۆژهەلآتی کۆمیسێری بالآی بەریتانیا لەبەغداد دەنێرێ و داوای لێ دەکات بەقازانجی ئەو بکەوێتە نێوانەوە بەلآم لەڕاستیدا پاش شەڕی ئاوباریك لە(1931/4/5)دا لە ناوچەی کفری شێخ تێدەگات هەوڵەکانی بێهودەیە لەم شەڕەدا دەرسێکی قورس بەلایەنگرانی شێخ مەحمود دەدرێ پاش ئەم شەڕە شێخ مەحمود دەگەڕێتەوە لەڕۆژهەلآتی پێنجوێن دەحەوێتەوە لە1931/4/24دا نامەیەکی تر بۆ کۆمیسێری بالآی بەریتانیا دەنوسێت و داوای لێدەکات کەنوێنەرێ بنێرێ بۆ گفتوگۆ لەسەر هەل و مەرجی تەسلیم بوونی شێخ مەحمود.شێخ لەپاش پێنج ڕۆژ گفتوگۆ لەگەڵ کاپتن هۆڵت دا لەپێنجوێن

بەوە قایل دەبێ کەخۆی تەسلیم بکات لە 1931/5/12لەهەر شوێنێك کەحکومەتی عێراقی دیاری بکات بژی بەمەرجێ موچەو خەرجی تەواوی بدرێتێ بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی پاشان لەگەڵ ژمارەیەك سوارە و پۆلیس دا دێت بۆ سلێمانی لە5/15بەفرۆکە بۆ(ئور)دەبرێ بۆماوەیەکی کاتی لەمیوانخانەی هێڵی ئاشتی عێراقدا دەمێنێتەوە پاشان دەینێرن بۆ (ناسریە).بەم جۆرە ژیانی سیاسی مەلیکی کوردستان کۆتایی دێت.

# شۆڕشی ئاگری داغ

دامرکاندنەوەی شۆڕشی شێخ سەعیدو بزوتنەوەی عەشیرەتەکان لەکوردستان و چەك دامالین و ڕێکاری عورفی و نیداری دژی بەشداربووان و بەرتیلدانی چەند سەرکردەیەکی کوردو سیاسەتی تواندنەوەی زۆرەملێ و بەتورکاندنی هەموو لایەنەکانی ئابوری و کۆمەلایەتی وسیاسی،ئەمانە هەموویان نەبوونە هۆی بنەبڕکردنی کێشەی کورد.ئەو هۆکارە بنەڕەتیانەی هەلگیرساندنی شۆڕشەکانی گەلی کورد هەروەکو خۆیان مانەوە،کەبریتی بوون لەبێبەشکردنی لەمافەکان و چەوساندنەوەی نەتەوەیی و هەژارکردنی جوتیاران کەلەژێر دەسەلاتی دەرەبەگەکانی کوردو شێخ وئاغاو سەرکردە ئاست کەمەکاندا ژیانیان بەسەردەبرد(107).

لەئەنجامی ئەم تۆلەسەندنەوەدا کە ئەنجام دران لەسالی 1928-1929ئەو کوردانەی کەهێزەکانی حکومەت ڕاوەدوی نابوون .سەرجەم هێزەکانیان کۆکردەوە لەناوچە شاخاوی یە سەختەکانی خۆرهەلآتی وولآتدا.چونکە شاخەکانی ئارارات بوبوە حەشارگەی سەرەکیان.لێرەدا جەنگاوەرە چاونەترسەکانی ڕێگای ئازادی نیشتیمان حەشارگەو پەناگای خۆیان دۆزی بووەوە لەتەنگەبەری شاخەکاندا.ئەوانە سەرکەوتونەبوون لەململانێ ئاشکراکەیان چونکە ململانێیەکی نابەرامبەربوو لەگەل هێزەکانی حکومەت.لیژنەی سەربازی و سیاسی (خۆیبوون- الاستقلال)خۆیان ئامادە کرد بۆ ڕاپەڕین لەناوچەی ئارارات.ئەم لیژنەیە ڕۆلێکی بەرچاوی بینی لەدروستکردنی هۆشیاری نەتەوەیی لەلای کورد(108).

کۆمەلەی (خۆیبوون)لەمانگی ئابی سالی 1927دا لەکۆنگرەی ڕێکخراوە کوردی یە سەرەکیەکان دامەزرا.(ڕێکخراوی تەعالی کوردستان،کۆمەلەی ڕێکخراوە کوردی یە کۆمەلایەتیەکان و کۆمەلەی سەربەخۆیی کوردستان).هەروەها ژمارەیەك لەسەرۆك خێلەکان و کەسانی تریش لەنیشتیمان پەروەرە کوردەکان ئامادەی کۆنگرەکەبوون.

(کۆمەڵەی خۆیبوون)پارتێکی سیاسی بوو خاوەنی پەیڕەو پرۆگرامی ناوخۆیی بوو هەریەکێك لەئەندامانی ئەم پارتە (سوێندی برایەتی)یان خواردبوو هەروەها بەڵێنیان دا بەبەردەوامی لەتێکۆشان و خەبات لەپێناو یەکخستنی هەموو کوردو هەروەها لەپێناو دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ.
بەپێی بەرنامەکانی ئەم حزبە کەلەکۆنگرەکەدا دانرابوو کۆمەڵێ ئەرکی بۆخۆی دیاری کردبوو. لەوانە(خەبات و تێکۆشان لەدژی تورکەکان)تاکو دەرکردن و ڕاونانی هەموو سەربازانی تورك لەخاکی پیرۆزی کوردستان وەگرنگی دابوو بە دروست کردن و پێکهێنانی چەند یەکە یەکی تایبەتی چەکداری و مەشق پێکردنیان و پرچەك کردنیان بەچەکی نوێ لەگەڵ دروست کردنی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ وولاتانی دراوسێ و لەوانەش حکومەتی ئێرانی و گەلی ئێران لەگەڵ گرنگیدان بەپروپاگەندەکردن بۆ کێشەی کورد لەدەرەوەی تورکیا بۆ ئەم مەبەستەش چەند لقێکیان لەدەرەوەی کوردستان کردەوەولەسوریاو لوبنان وژمارەیەك لەوولاتانی ئەوروپاو ویلایەتەگرتووەکانی ئەمەریکا.لەگەڵ ئەوەشدا (خۆیبوون)پەیوەندی یەکی تۆکمەی هەبوو لەگەڵ پارتی نەتەوەیی ئەرمەنی (تاشناق) ئەو پارتەش بەشداریکرد لە ئامادەسازی بۆ ڕاپەڕینی ئارارات.هەر لەو کۆنگرەیەدا کەلەناوچەی (بێحەمدون)ی لوبنان سازکرا بڕیاردرا کە ئیحسان نوری پاشا کە کەسایەتیەکی نیشتیمان پەروەرو فەرماندەیەکی بەتوانای سوپای عوسمانی بوو دوای ئەوەی لەتورکەکان دابڕا بەدڵسۆزی یەوە تێدەکۆشا بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی کوردستان.هەربۆیەش کۆنگرە بڕیاری دا بکرێتە سەرکردەی شۆڕشەکە.ئەویش توانی سەرلەنوێ هێزەکانی سەرۆك خێڵی جەلالی(ئیبراهیم حسکی)لەتیلۆ ڕێك بخاتەوە کەناسرابوو بەئیبراهیم پاشا.ئیحسان نوری پاشا توانی گشت کۆمەڵە چەکدارەکانی کورد پێك بهێنێتەوە بەپێی پێویست .هەروەها پەیوەندی کرد بەسمکۆوە.کەئەو کاتە سمکۆ سەرقاڵی خەبات و تێکۆشان بوو لەدژی دەسەڵاتدارانی ئێران جگە لەمانەش کۆمەڵەی (خۆیبوون)ڕۆژنامەیەکیان دەرکرد بەناوی(ئاگری)کۆمیتەی ناوەندی (خۆیبوون)لەناوچەی

حەڵەب بوو(109). تاهاوینی 1928کەلەلایەن فەرەنسیەکانەوە پەرتەوازەکران. گەلێك لەپیاو ماقوڵان و ناودارانی کورد لەکۆمیتەی ناوەندی دا ئەندام بوون کەسەرکردە دیارەکانیان بریتی بوون لە (قەدری جەمیل پاشا،جەلالەت عالی بەدرخان،حەسەن ئاغای حاجۆ،ئیحسان نوری پاشا، ئەکرەم جەمیل پاشا،مەمدوح سەلیم و عارف عەباس).سەرکردایەتی خۆیبوون بریار دەدەن کە دەرس و پەند لەشکستیەکانی رابردوو وەربگرن.بۆیە دەیانەوێ زۆر بەنهێنی و بەپارێزەوە کاربکەن،هەموو تیرەو تایەفە کوردەکان بەلای شۆڕشدا رابکێشن.کاری چەکداری خۆیان رێك بخەن.جەنگاوەرانی کورد بەچەك و تەقەمەنی هاوچەرخ چەکدار بکەن و بەرە بەرە فێری یاساو رێسای جەنگیان بکەن ئەم گروپە پێش پارتیزانەکانی ئەمەریکای لاتین رێسای شۆڕشگێڕی یان داهێنا، رێبەرانی (خۆیبوون) کەسوربوون لەسەر وەدەرنانی دوا سەربازی تورك لەکوردستان درێژە بەشەڕ بدەن و هەموو هەوڵێك دەخەنەگەڕ کە دوژمنایەتی وولآتانی دراوسێ نەکەن و رایدەگەیەنن کە خوازیاری ئەوەن باشترین پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵ دەوڵەت و میللەتی ئێراندا هەبێت سەبارەت بەعێراق و سوریا(خۆیبوون)دووپاتی دەکاتەوە کەڕازی و خۆشحاڵە بەو مافانەی کەبەپێی بریارەکان کە بەکوردی ئەم دوو ولآتە دراوە خوازیاری زیاتر نی یە بۆیان.سەرئەنجام (خۆیبوون)دێنە سەر باسی ئەو بەدحاڵی بوونەی نێوانی کوردو میللەتی ئەرمەنی و بەیەکجاری چارەسەری بکەن.هەروەها پەیوەندی یەکی بەهێز لەنێوان حزبی(خۆی بوون)و حزبی(داشناك)یاخود(تاشناق)دا هەبوو.

(خۆیبوون)دوای ئەوەی لەکۆنگرەی (بێحەمدون)دا کە45ڕۆژی خایاند زۆربە نهێنی کارەکانی ئەنجام ئەدا گشت کێشەکان و ئاستەنگی شۆڕشەکانی پێشوتری خستەڕوو ئەمان بەچارەسەرێکی کاتی کاریان لەسەر دەکرد تابەهەڵەی پێشودا نەڕۆن.نوسەری پێشکەوتووخوازی بیانی (س-هاڤان)لەنوسینێکدا ئاماژە بەبزوتنەوەی کوردی دەکات و دەڵێت(ئەم راپەرینە مایەی گرنگی دانی تایبەتی بوو لەڕووی ڕێکخستنی رێك و پێکەوە کەبەهۆی چەندین گروپی کوردی یەوە لەکۆنگرەدا هاتە ئاراوە لەهەمان کاتدا ئەم ڕێکخراوە

زیاتر لەڕێکخراوێکی یەکگرتووی جەماوەری یەوە نزیکە)(110). چوارچێوەی ڕاپەڕینەکە بەرە بەرە فراوان بوو لەو هەل و مەرجەدا دەسەلآتدارانی تورك هەروەك پیشەی بەردەوامیان ڕێگەی مانۆڕی گرتەبەرو پێشنیاریشی خستە بەردەم ئیحسان نوری پاشا بۆ ئەنجامدانی دانوسانی ئاشتیانە لەناوەڕاستی ئاياری 1928دا ئەنجومەنی تورکیا لیژنەیەکی ئەشتەوایی پێك هێنا کەلە (12)نوێنەرو ژمارەیەك بەرپرس لەولایەتەکانی ڕۆژهەلآت پێك هاتبوو.ئەم لیژنەیە چاوی بەشاندێکی کوردی کەوت بەسەرۆکایەتی ئیحسان نوری پاشا لەشارۆچکەی(شێخلی-کۆپری)(لەناوچەیەکی بێ لایەن کەشۆڕشگێڕان و هێزەکانی تورکیای لەیەکتری جیادەکردەوە)شاندی حکومەت ڕایگەیاندبوو کەلێبوردنی گشتی دەرئەکەنوو پێشنیاریشیان کردبوو کە پۆستی بالآ بە هەندێکیان دەبەخشن.
بەلآم شاندی کوردی هەموو داواکارییەکانی لایەنی تورکی یان ڕەتکردەوە. تا ئەو کاتەی کە حکومەت گشت مافە نەتەوەییەکانی بەفەرمی لەلایەن تورکەکانەوە دانی پیا دەنرێ.ئەمەش مەرجی شاندی کوردی بوو پاشان گفتوگۆکان بێ ئەنجام کۆتایی هات.
لەسەرەتای سالّی 1930زۆربەی ولایەتەکانی باکووری خۆرهەلآت لەژێر سەرپەرشتی کوردەکاندا بوو.حکومەتی ئەنقەرە ناچار بوو هێزێکی گەورە کۆبکاتەوە. بەسەرکردایەتی سالّح پاشا کە(40)هەزار سەربازو 10تۆپ و 550رەشاش و 50فرۆکەی جەنگی(111). بۆ شکستهێنان بەشۆڕشگێڕان دوای چەند شەڕێکی توندوتیژ کەنزیکەی مانگێکی خایاند لەمانگی 1930/1 ئیحسان نوری پاشا وتارێکی لەڕۆژنامەی(ئاگری)دا بلآوکردەوە کەداوای لەهەموو گەلی کورد کرد یارمەتی بە چەك و ئازوقە پێشکەش بەشۆڕشگێڕان بکەن هەروەها ئیدارەی ئارارات بانگەوازی بۆ کوردی سوریاو عێراق کرد کەیەکبگرن بۆخەبات دژی زولّم و زۆری تورك وێنەیەکی ئەم بانگەوازە نێردرا بۆ کۆمەلّەی گەلان شەڕ درێژەی هەبوو لەهەموو بەرەکانەوە لەمانگی نیسان دا شۆڕشگێڕان لەناوچەی (کیرێ)کەرتێکی سەربازی تورکیای تێکشکاند .حکومەتی تورك هێزی زیاتریان نارد بۆ ناوچەکان لەزنجیرە شەڕێکدا سوپای تورك زیانی زۆری

پێگەیشت(2000) سەربازی تورك بەدیل گیران و 60پەشاش کەوتە دەست کوردەکان(12) فرۆکەی جەنگی خرانە خوارەوە 45 ئامێری سەربازی دەسکەوت بوو.دەسەڵاتدارانی تورك توشی شۆك بوون ئیتر حکومەت ناچاربوو شەڕی یەکلاکەرەوە بکات لەگشت ناوچە دوورە دەستەکانی تورکیاوە هێز کۆکرایەوەو ڕەوانەی ناوچەکانی ئارارات کرا لەم کاتەدا شۆڕشگێڕەکان لەناوچە شاخاویەکاندا لەشەڕدابوون بەڵام حکومەتی ئێرانی خزمەتێکی گەورەی پێشکەش بەتورکەکان کردو ڕێگای دان لەپشتەوە بەناو خاکی ئێراندا سوپای تورك بۆ گەمارۆدانی شۆڕشگێڕان.هێرشی تورك لەپشتەوە کاریگەربوو زۆر دڕندانە پەلاماری ناوچەکەیان داو بەپێی زانیارییەکان دەسەڵاتدارانی تورك (1550)کوردیان سەربڕی (200)گوند سوتێنرا هەرچەندە کوردەکان توانیان لەهەندێ شوێندا پاشەکشەبکەن بەدوژمن بەڵام زۆری دوژمن و کاریگەری چەکی قورس کوردەکانی ناچار کرد پاشەکشەبکەن.ئیحسان نوری پاشا و ژمارەیەك لەسەرکردەکان توانیان بگەڕێنەوە ناوخاکی ئێران بەڵام ئیبراهیم پاشا لەگەڵ لایەنگرەکانیدا کەوتنە گەمارۆی دوژمنەوە لەشەڕێکی توندا شەهید کرا ئەوانەشی لەگەڵیابوون بەدیلی کەوتنە دەست تورکەکان لەم شەڕانەدا 3000لەکوردەکان کوژران هەرچی مەڕو ماڵاتی کوردەکان بوو لەناو گوندەکاندا هەموو بەتاڵان بران.هەندێك لەچەکدارانی کورد لەسوریاو عێراقەوە کەنزیکەی (1000)چەکدار دەبوون هاتنە ناوچەکانی ماردین و مەربادی سەر سنورو دۆڵی سۆراخ.بەڵام نەیانتوانی ڕەوشی شۆڕشگێڕانی ئارارات سوك بکەن بۆیە لەژێر گوشاری هێزەکانی تورکدا ناچاربوون ناوچەکە جێ بهێڵن.

لەو سەرو بەندەدا ژنێکی ئینگلیز بەنێوی(ڕۆزیتا فاربەن)ڕاپۆرتێکی کەم وێنە لەسەر شۆڕشی ئارارات دەخاتە بەر دەست.ئەم ژنە پاش ئەوەی بەبێ هودە هەوڵی دا بۆ ئەرمەنستانی سۆڤیەت بڕوات.سەرئەنجام گەیشتە کوردستان و یانزە ڕۆژ لەگەڵ شۆڕشگێڕانی کوردا مایەوە.لەو ماوەیەدا وێنەی یەکێك لەو فڕۆکانەی گرتووە کە کوردەکان خستبویانە خوارەوە یەك دوو تۆپی لەو تۆپانەش دیبوون کە کوردەکان گرتبوویان (112). (ڕۆزیتا فاربەن)لەسەر

کۆمەکی ئێران بۆ بزوتنەوەی کوردەکان ئەوە دەگێڕێتەوە کەچۆن کوردەکان نەیاندەزانی ئەو تۆپانە بەکاربهێنن کە دەستیانکەوتبوو داوایان لە(مزەفەرالدولە)ی فەرماندەی هێزەکانی ئێران لەئازەربایجان کرد کە تۆپچییان بۆ بنێرێ بەڵام ئەو ڕۆژنامەنووسە دەڵێ:(وا دیاربوو کوردەکان شەڕیان بەجۆرە سەرگەرمی یەك دەزانی هەر ژنێك منداڵێکی لەکۆڵ و تفەنگێکی بەدەستەوە بوو)(113). کە ئەمەش هێندەی تر بارگرانی یە بۆ کورد کەلەم کاتە ناسکەدا سەرکردەی شۆڕش ئیحسان نوری پاشا سەرکردایەتی چۆڵ بکات و ڕوو لەئێران بنێ و بەرەی شەڕەکانیش ئەگەر لەشکستیشدا بن دەکرێ سەرکردە پشتی تێ بکات؟ .کۆمەڵەی(خۆیبوون)کەکارەکانی ئیحسان نوری بوو بە مایەی شەرمەزاری بۆیان ئیتر ڕێگەیان بەخۆیان نەدا کەکەسێکی تر وەکو فەرماندە بسەپێنن بەسەر شۆڕشگێڕاندا کە هێشتا لەبەرەکاندا درێژەیان بەخەبات دەدا.کوردەکان هەڵەیەکی گەورەیان کرد کەشەڕی بەرەییان دامەزراند.

دەبوایە هەر لەسەرەتاوە شەڕی پارتیزانیان هەڵبژاردایە وحسابی زۆرتریان بکردایە کەدەوڵەتێك نەبێت هاوکاری بەردەوامیان پێشکەش بکات لەچەك و تەقەمەنی و خواردن و هەروەها گواستنەوەی کوژراوو بریندارەکان بۆ بەرەکانی دواوە. بەڵام کوردەکان لەسەر سکی ڕووتی پەلاماری دەوڵەتێکیان دەدا کە تا ئەو کاتەش زۆر ناوچەی دەرەوەی وڵاتەکەی خۆیان لەژێر چنگدا بوو.خاوەنی پێگەی نێودەوڵەتی بوون و ناوچەکەیان بۆ هەندێك وڵات وای دەخواست کەبەناچاری ڕێز لەتورکیا بگرێ چونکە هەڵکەوتەی ناوچەکە گرنگی خۆی هەبوو جگە لەزۆری سەربازو جۆری چەك و کردنەوەی ڕێگای پشتەوەی ئێران کە هاوکارییەکی ڕاستەوخۆو کاریگەربوو بۆلێدانی کوردەکان ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە دوژمنایەتی هەمیشەیی لەسیاسەتدا نی یە و دۆستی هەمیشەیش نیە.کەدەڵێن10کیلۆمەتر تورکەکان بەقوڵایی خاکی ئێراندا هاتوون بۆ لێدانی کوردکان.دامرکاندنەوەی ئەم شۆڕشەش دەبێتە بەشێك لەتراژیدیای نەتەوەیەك بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەرگە ساتی ڕاستەقینە بێ ئەوەی کۆمەڵەی گەلان هەربونیان هەبێ لەو کاتەدا یاخوود خۆیان بە بەرپرسیاری مێژوویی و ئەخلاقی و ئینسانی

بزانن کە لە بەر چاویان نەتەوەیەك قەلاچۆ دەکرا ئەوانیش بیٚ دەنگ بوون. پاش کۆتایی هاتنی شۆڕشـی ڕەوای خـەڵکی بـاکوری کوردسـتان کەچـوار سـاڵی خایانـد و هیـوای هەڵچـنراوی نەتەوەیـەکی تینـوی ئـازادی و سـەربەخۆیی خـامۆش بـوو لـە باشـوریش شـێخ محمـود دوور خرابۆوە بۆ شاری (ناسریە)ی خواروی عێراق. لە ڕۆژهەڵاتیش بزووتنەوەکەی سمکۆی ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ بیٚ هێز دەبوو ڕەزاشا ئەستێرەی بەختی ئەدرەوشایەوە.ئەگەر گۆڕانکاری بکرایـە لـە کابینــەی حکومەتــدا مــەرجی کابینــەی نــویٚ دەبوایــە لــەناوبردنی سمکــۆ و بزوتنەوەکــەی لەپێشەنگی کارەکانیدابووایە بەتایبەت وەزیری جـەنگ دەبـوو ئـەو بەڵێنـە بـدات کـە لەتوانایـدا هەیە سمکۆو شۆڕشەکەی تەفرو و توونا بکات .سمکـۆش لەلاوازیـدا بـوو ڕەزا شـای ئێـران ئـەو هەلەی قۆستەوە کە سمکۆ لاوازە بۆیە پلانی کوشتنی بۆ داڕشت .

# چۆنیەتی رووداوی شەهیدکردنی سمکۆی شکاک 1930/6/21

کاتێك سمکۆ چووە شنۆ لەلایەن (سادق خانی نەورۆزی)یەوە پێشوازی یەکی گەرمی لێ کرا(117) (سادق خانی نەورۆزی) حاکمی شنۆ بوو.بەرواڵەت رێزی زۆری گرت.بۆ ئەوەی سمکۆ زیاتر لەحکومەتی ئێران دڵنیابکات کەمەبەستیان ئاشتی و گفتوگۆی رێکەوتنە .بەلآم پێشتر پیلان دانرابوو بۆ کوشتنی سمکۆ. (ئیگلتن)لەکتێبەکەیدا (جمهوریەتی مهاباد)دەڵێ سەرکردەی لەشکری ئێران (عەبدوللآی تهماسپی)بوو. دیارە پێش دەستپێکردنی شەڕ سمکۆ چاوەڕوانی (عەبدوللآی تهماسپی)بووە بەبۆچوونی (نوسەر)رەنگە سمکۆ لەچاوەڕوانی و گۆڕینی کات دەکەوێتە گومانەوە.بۆیە دەیەوێت شوێن بگۆڕێ و تابۆی دەکرێ ئەم پێشتر دەست بووەشێنێ.رەنگە هەرواش بووبێ هەواڵی نەهاتنی (تهماسپ)بۆ شنۆ بەهۆی تێکچوونی ئوتومبێلەکەیەوە وا لەسمکۆ دەکات بگەڕێتەوە بۆ ناوشار دوای ئەوەی کە دوو سوار بەپەلە دێنە لای سەرهەنگ سادق نەورۆزی و هەواڵی دەدەنێ کەسەر لەشکر بەیانی دەگاتە لاتان. دوای ئەوە سادق خانی نەورۆزی سەرکردەی سەربازگەی (شنۆ)بەبیانووی ئەوەی ئەیەوێ لەرێگای سەردانێك بکا بۆیەکێك لەبنکەکانی سەربازی لەسمکۆ جیائەبێتەوە سمکۆو هاورێکانی بەرەو شنۆ دەگەڕێنەوە کەلەو کاتەدا دەیان سەربازی چەکدار لەناوچەند سەنگەرێکی ئامادەکراوی ئەمبەرو ئەوبەری سەرە رێگاکە خۆیان حەشاردابوو بۆسەیان بۆ سمکۆ نابووەوە.سمکۆش کەبالآبەرزو چوارشانەبوو سێ ریز فیشەك لفی بەقەدیەوە و دوو ریزیش راست و چەپ لەسەر شانیەوە بۆ سنگی تاناوقەدی سەربەستەکەی بەدەستوری کوردانە گەورەو ئاوریشمین بوو هەروەك قارەمانێکی ئەو ناوچانە دەهاتە بەرچاو بەهەیبەتەوە لەسەر زینی

ئەسپەکەی دانیشتبوو لەناکاودا وێنەگرێکی لێ پەیدابوو. وێنەگرەکە بەکامێراو سێپاکەیەوە هاتەبەر دەم سمکۆو کڕنوشێکی بۆبردو تکای کرد کەڕێگای بدا وێنەیەکی ئەو سەردارە ئازاو بەجەرگە بگرێت هەربەو شێوەیە کەبەسەر ئەسپەکەیەوە بوو سمکۆ لەوەدا دوو دڵ بوو بەلآم لەئەنجام دا لەبەر زۆر پێداگرتنی کابرای وێنەگر ڕازی بوو بێ ئەوەی هیچ بیر لەوە بکاتەوە کە ئەو وێنەگرە لەو ڕۆژەدا بەکامێراو سێ پا لەو دەشتەدا چی دەکاو لەکوێوە لەو کاتەدا سەری دەرهێنا.سمکۆ بۆ گرتنی وێنەکە لغاوی ئەسپەکەی توند کردو ڕایوەستان و خۆشی زۆر بەڕێك و پێکی و بەهەیبەتەوە لەسەر زینی ئەسپەکەی دانیشتبوو سواران و یارانی سمکۆش هەموو سەرنجیان لای ئەو وێنەگرەبوو هەر لەو چاوتروکاندنی کامێرەیەدا کە وێنەگر لەپشت سێپاو کامێرەکەوە بوو سەری کردبوو بەژێر پەردە ڕەشەکەی کامێرەکەدا وای کردبوو کە هەمووان تەنها هەر سەرنج بدەنە ئەو لەناکاو لەسەنگەرەکانی قەراغی جادەکەوە سەدان گوللە ئاڕاستەی سمکۆ کرا خورشید ئاغاو سیانزە کەسی تر لەسوارەکانی سمکۆ دەست بەجێ کوژران و باسك و ڕانی سمکۆ گوللەی بەرکەوتبوو بریندار‌بوو بەلآم هێشتا لەسەر زینی ئەسپەکەی مابووەوە هاتبووە دەست و تەقەی دەکرد بەلآم پاش نیو سەعات شەڕکردن و بەربەرەکانی خوێنێکی زۆر لەلەشی ڕژابوو لەسەر ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە.لەگەڵ دەستپێکردنی تەقەکە وێنەگرەکە وون بوو بەلآم کامێراو سێپاکەی هەر لەشوێنی خۆیدا مابوو.کوڕەکەی سمکۆ(خەسرەو) دەرئەکەن و ژمارەیەکی زۆر لەسوارەکانی تر بۆی دەرچوون هەر لەوێوە خۆیان گەیاندە ئەودیوو سنوری ئێران چەند کەسێکی تریش لەچەکدارەکانی سمکۆ چ پیادەو چ سوارە کەلەشنۆ بوون ئاگاداری ئەم ڕووداوە نەبوون بەدەستی سەربازەکانی( گاردی شنۆ) لەپاش نەختێك بەرگری کردنێ چەك کران کەدیارە ژمارەیەکیش لــەسەربازەکانی دەوڵەت کوژران و برینداربوون . پاشان تەرمی پیرۆزی سمکۆ نیشانی خەڵك ئەدەن و دەیبەنەوە بۆ ورمێ و لەوێشەوە گۆڕ بزری دەکەن.ئەم هەواڵەش بەزوویی لە ئەوروپادا بلآو بۆوە لەڕێگەی ڕۆژنامەی تایمزی بەریتانیەوە .

ڕۆژی 1930/6/22بەم شێوە یە نووسیویەتی کە دەڵێت (دوێنێ هەواڵنێرمان لەتارانەوە پێی ڕاگەیاندین کە سمکۆی سەرکردەی کوردەکانی ئێران لە شاری شنۆبەدەستی هێزەکانی ئێران کوژراوە ) بەمەش کۆتایی هات بە درێژترین شۆڕشی چەکداری کوردستان و سمکۆش بووە سومبولی بەرگری و سەربەخۆیی کوردستان.

شێخ سەلامی شاعیر دەڵێ:

**قەد بەبێ باکی مەچۆ ناو لەشکری دوژمنتەوە**
**شێری بێباکی شوکاکت چوو بە دوو ڕێوی شکا**






**ئارمی بزووتنەوەکەی سمکۆی شکاک**




**جەعفەر ئاغای شکاک**

## پۆلێک لەو خێزانە شکاکیانەی ئاوارەبوون و لە باشووری کوردستاندا گیرسانەوە

### بنەماڵەی سابیر ئەحمەد شکاک



سابیر ئەحمەد شکاک

ئامینە سەعید دایکی سابیر ئەحمەد شکاك
لەکارەساتی ورمێدا شەهید کرا





خوشکی سابیر ئەحمەد شکاك لە چیای
قەندیل رەق بووەوە



ئیسماعیل سەرهەنگ



شەوکەتی تەیمور ئاغای شکاک



نوری مەعروف شکاک باوکی
مێژوونووس کەمال نوری مەعروف



عەبدولڕەحمان تەها شکاک



عەبدولا محەمەد سدیق نوعمان شکاك



محەمەد تاهیر شكاك ناسراو بە حەمە تەوریزی



**بەحری حەمە ئەمین شکاک**



**تۆفیق سەرهەنگ شکاک**



تەیمور ئاغای شکاک



خێزانی خورشیدە فەنی



کوڕەکانی سمکۆی شکاك



سمکۆ و چەکدارەکانی



سمکۆ و چەکدارەکانی



ماڵی سمکۆ- قەڵای چەهریق



سمکۆی شکاک پاش شەهید کردنی



سمکۆی شکاك و خێزانەکەی



سمکۆ و خەسرەوی کوڕی



گوڵێزار خانمی جەعفەر ئاغای شکاک



کۆمەڵێك لە عەشایەرەکانی پشدەر



جەعفەر ئاغای شکاك و گوڵیزاری کچی



سمکۆ و ئەحمەد ئاغاو عەلی ئاغای برای



عەبدوڵا خانی تەهماسی فەرماندەی لەشکری ئێران لەگەڵ کۆمەڵێک ئاوداری کوردا،
ناوبراو دەستی سوورە بە شەهیدکردنی سمکۆی شکاک



جەعفەر ئاغای شکاک و دووان لە هاوەڵانی بەهەڵواسراوی لە تەورێز



بابەکر سەلیم ئاغای پشدەر



لەراستەوە جەعفەر ئاغای شکاک-غولام رەزا والی پشتکوی لوڕستان-سمکۆی شکاک



ژەنەراڵ ئیحسان نوری پاشا



لازاریف خاوەنی کتێبی کوردو کوردستان



چەند کەسایەتییەکی عەشیرەتی مەنگوڕ



خێوەتی بابەکر ئاغا سەرۆکی پشدەرییەکان لە نێوان سنووری ئێران و عێراق



شوێنی شەهیدکردنی سمکۆی شکاک- شنۆ



لەڕاستەوە تاهیر خان کوڕی سمکۆ-عەبدوڵا میر سوڵتان-بابا خان کوڕی سمکۆ- خاڵۆ بەگی هەرکی



لەراستەوە قەرەنی ئاغای مامش و کۆمەڵێک عەشایەری کورد



شێخ سەعیدی پیران پێش لەسێدارەدانی



مەلیکی کوردستان شێخ مەحمودی حەفید



ژەنەراڵ شەریف پاشای خەندان



**حەپسەخانی نەقیب**



رەفیق حیلمی



سورمێ خان کچی سمکۆی شکاک



**پاسەوانەکانی سمکۆی شکاک لە سلێمانی**



شێخ مەحمودی حەفیدو هاوەلأنی



مەحمود خانی دزلی



شێخ عوبەیدوڵای نەهری



**یەکەمین سوپای نیشتیمانی کوردستان لەسەردەمی شێخ مەحمود ساڵی 1922**



حەپسە خانی نەقیب و شێخ قادری حەفید هاوسەری



شێخ عەبدولسەلام بارزانی و هاوەڵانی -1908




بەشێك لەسنووری جوگرافی بزووتنەوەکەی سمکۆی شکاك



**سمکۆی شکاک – سادق نەورۆزی – خورشید ئاغای هەرکی**
**دوای چەند چرکەیەك لەم وێنە گرتنە 13 کەس لەوانەی لەم وێنەدا**
**دەرکەوتوون لەم جێگایەدا شەهیدکراون**



کەمال ئەتاتورك و دیاب ئاغای دەرسیم
دوای ئەوەی بەڵێنی ئۆتۆنۆمییاندا بۆ کوردستان،
کەدەسەڵاتیان گرتە دەست پەشیمان بوونەوە




**شەهید سمکۆی شکاك لەبەردەم بکوژەکانیدا- شنۆ-1930**




**لای راستەوە: سمكۆی شكاك-خەسرەوی كوڕی سمكۆ-سلێمان شەفیق پاشا**




باخچەی سمکۆی شکاک لە شاری سلێمانی، کە لەلایەن شارەوانی سلێمانییەوە لەساڵی 2010 دا دروستکراوە




**گوڵیزار خانم کچی جەعفەر ئاغای شکاك**

# پەراوێز :

1. دلاوەرانی کوردی گومناو ، حەبیب الله ی تابانی ، و : بورهان قانع ، چاپی یەکەم ، 2004 ، ل 121 .
2. سەدەیەك لە تێکۆشانی کورد ئێران و بزوتنەوەی سمایل ئاغای شکاك ، کەمال نوری مەعروف ، چاپخانەی ڕاز ، ل 74 .
3. ، گفتوگۆی تایبەت ، علی خان تایەر خانی سمکۆ ، هەولێر ، 2012 .
4. سمکۆ ( ئیسماعیل ئاغای شکاك ) و بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد ، محەمەد رسول هاوار ، چاپخانەی شڤان ، چاپی دووەم ، 2005 ، ل 256 .
5. سەدەیەك تێکۆشانی کورد ئێران و بزوتنەوەی سمایل ئاغای شکاك ، کەمال نوری مەعروف ، چاپخانەی ڕاز ، چاپی یەکەم ، 2002 ، ل 76 .
6. بزاڤی ڕزگاری خوازی کورد لە کوردستانی ڕۆژهەلآت ، د. سەعدی عوسمان هەروتی ،چاپخانەی دەزگای ئاراس ، چاپی یەکەم ، 2007 ، ل 28 .
7. تاريخ مشروطة، أحمد كيسروى .
8. ، دراسات فی تاريخ ايران الحديث والمعاصر ، د. کەمال مەزهەر ، ص 241 .
9. کوردستان و کورد ، د. عبدالرحمان قاسملۆ ، ل 55 .
10. كوردستان الشرقيه ، ياسين خاليد ، ص 24 .
11. کورد لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانیدا ، جەلیلی جەلیل ، ل 130 .
12. كردستان فى سنوات الحرب العالمية ،. كمال مەزهەر ، ص 103 – 104 .
13. یادەوەریە سیاسیەکانم ، سوڵتان عبدالحمیدی دووەم وەرگێڕانی ئاوات احمد ، چاپی یەکەم ، 2010 ، ل 141 .
14. سەدەیەك لە تێکۆشانی کوردی ئێران و بزوتنەوی سمایل اغای شکاك ، کمال نوری معروف چاپی یەکەم ، 2002 ، ل 92 .
15. مجله كاروان ، ن/ عبدالفتاح علی يحيا ، ت . عبدالرزاق بدرخان البوتانی ، ، ص 134 – 135 .

16.بیرەوەریەکانی عبدالرزاق بدرخان ، ل 35 .
17. کردستان فی سنوات الحرب العالمیه الأولی ، د. کمال مەزهەر ، ص 164 .
18. کوردو عەجەم ، نەوشیروان مستەفا چاپخانەی ڕوون ، چاپی سێیەم ، 2007 ، ل 240 .
19. ، کێشەی کورد ، ن. لازاریف.
20. ، مێژووی کوردو کورستان، محمد ئەمین زەکی بەگ ، ل 259 .
21. ڕێبەری مێژووی نوێ و هاوچەرخ ،ئا . م: جمال مجید فرج ، ل 82 .
22. کوردستانەو مەسەلەی کورد ، لازاریف ، ل 298 .
23. مجله / شمس کردستان ، الاکراد ، حسن ارفع ، ترجمه : د. أحمد عوسمان ، 57 ، ص12 .
24. کوردستان و مەسەلەی کورد ،لازاریف ، 297 – 298 .
25. دراسات فی تاریخ ایران الحدیث والمعاصر ، د. کمال مەزهەر ، ص 245 .
26. سەدەیەك لە تێکۆشانی کورد ئێران و بزوتنەوەی سمایل ئاغای شکاك ، کەمال نوری مەعروف ، چاپی راز ،ل 98 – 99 – 100 .
27. بزاڤی ڕزگاری خوازی کورد لە کوردستانی ڕۆژهەلأت ، د. سەعدی عوسمان هەروتی ، چاپی یەکەم ، 2007 ، ل 44 .
28. گوردو عەجەم ، نەوشیروان مستەفا ، چاپخانەی ڕوون ، چاپی سێیەم ، 2007 ، ل 242 .
29. مێژووی کوردستان ، ن . لارزیف ، وەرگێڕانی وشیار عبدالله سەنگاوی ، چاپخانەی ڕۆژهەلأت ، هەولێر ، چاپی دووەم ، ل 296 .
30. کورد لە ئەرشیفی ڕووسیاو سۆڤێتدا ، د. ئەفراسیاو هەورامی ، وەرگێڕان : د. افراسیاو ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، چاپی یەکەم ، 2006 ، ل 389 .
31. کێشەی کورد ، ن. لازاریف ، ، وەرگێرانی وشیار عبدالله سنگاوی ، چاپخانی ڕۆژهەلأت ، هەولێر ، چاپی دووەم ، ل 296 .
32. کوردو عەجەم ، نەوشیروان مستەفا چاپخانەی ڕوون ، چاپی سێیەم ، 2007 ، ل 244 .
33. ، کوردستان و مەسەلەی کورد ، لازاریف ،298 – 305 .
34. سەدەیەك لە تێکۆشانی کورد ئێران و بزوتنەوەی سمایل ئاغای شکاك ، کمال نوری معروف ، چاپی ڕاز ،ل 102 .

35. بزاڤی ڕزگاری خوازی کورد لە کوردستانی ڕۆژهەلأت ، د. سەعدی عوسمان هەڕوتی چاپخانەی دەزگای ئاراس ، چاپی یەکەم ، 2007 ، ل 52-53 .

36. کوردستان و مەسەلەی کورد ، لازاریف ، بە زمانی ڕووسی ، 338 .

37. کردستان فی سنوات الحرب العالمیه الاولی ، د. کمال مەزهەر ، ص 167 .

38. سمکۆ ( ئیسماعیل ئاغای شکاك ) و بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد ، محمد رسول هاوار ، چاپخانەی شڤان ، چاپی دووەم ، 2005 ، ل 16 .

39. کورد لە ئەرشیفی ڕووسیاو سۆڤیێتدا ، د. ئەفراسیاو هەورامی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، چاپی یەکەم ، 2006 ، ل 116 .

40. کوردو عەجەم مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران ، نەوشیروان مستەفا ، چاپی سێهەم ، ل 260-261 .

41.. کێشەی کورد ، ن. لازاریف ، چاپخانی ڕۆژهەلأت ، وەرگێڕانی ووشیار عبدالله سنگاوی هەولێر ، چاپی دووەم ، ل 623 .

42. م.س ، فوزی خلف شویل ، ص 78 .

43. کوردەکان ،حسن أرفع ، وەرگێرانی ، حامید گەوهەری .

44. کوردو عەجەم ، نەوشیروان مستەفا ، چاپخانەی ڕوون ، چاپی سێهەم ، 2007 ، ل 256 .

45. کوردستان و کورد ، بەلگە نامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیا – د. کەمال مەزهەر ، بەرگی یەکەم .

46. یادەوەری یە سیاسیەکانم ، سولتان عبدالحمیدی دووەم ، وەرگێڕانی: ئاوات أحمد ، چاپی یەکەم ، 2010 ، ل127 .

47. مێژووی کوردستان ، ن . لازاریف ، وەرگێرانی ووشیار عبدالله سنگاوی ، ل 300 .

48. مێژووی کوردستان ، ن . لازاریف ، وەرگێرانی ووشیار عبدالله سنگاوی ، ل 300 .

49. جمهوریەتی مهاباد ، جونێر ئیگلتن ، ل 108 .

50. سەدەیەك لە تێکۆشانی کورد ئێران و بزوتنەوەی سمایل ئاغای شکاك ، کمال نوری معروف ، چاپی ڕاز ،ل 155 .

51.گۆڤاری هەرێمی کوردستان ، ژمارە ، 392 ، سالی 2006 .

52. یاداشتەکان ،رەفیق حیلمی ، بەشی یەکەم ، لاپەڕە 67 .
53. ، مەحمود خانی دزڵی شۆڕشگێڕی ڕۆژهەلأتی کوردستان . عومەر مەعروف بەرزنجی
54.یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید ، چاپی یەکەم ، 1995 ، ل 65 .
55. نور بەخشی ، عومەر مەعروف بەرزنجی ، چاپی یەکەم ، 2006 ، ل 27 .
56. کوردستان و کورد ، بەڵگە نامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیا –د. کمال مەزهەر ئامادەکردنی عبدالله زەنگەنە ، ل 198-199 .
57. یاداشتەکانی شێخ لەتیف ، ئامادەکردنی کمال نوری معروف ، ل 60 .
58. گەنجینەی زێڕینی زێوەر ، ئامادەکردنی محمود زێوەر ، ، ل 330 .
59. یاداشتەکانی شێخ لەتیف ، ئامادەکردنی کمال نوری معروف ، ل 70 .
60. کوردستان و بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد ، جەلال تالەبانی ، چاپی یەکەم ، بەیروت ، 1970 ، ل 63 .
61. ، اوضاع ایران در جنگ اولی یا تاریخ رضائیة ، تمدن ، محمد رسول هاوار ، ل 269-271 .
62. کوردەکان ، حسن ارفع ، وەرگێڕانی : حەمید گەوهەری ،ل 102-103 .
63. . کوردوعەجەم ،نەوشیروان مستەفا ، ل 444 .
64. شمس کردستان العدد ، 57 حسن أرفع ، الاکراد ، ترجمە : د. عوسمان ابوبکر ، ، کانون الثاني ، 1980 ، ص 13 .
65.مارتن ڤان برونس ، ترجمه سعید یحیی ، ص 146 .
66.ڕۆژنامەی کوەردستان ژمارە 81 ، کانونی دووەم ، 1982 ، ل 17 .
67.ئەحمەد ی شەریفی ، ص 29 .
68. مێژووی کوردستان ، ن . لازاریف ، وەرگێرانی ووشیار عبدالله سنگاوی ، ل 314.
69. یاداشتەکان ، رەفیق حیلمی ، بەشی یەکەم ، لاپەڕە 202-203 .
70. . ، کوردوعەجەم ، نەوشیروان مستەفا ، ل 454.
71. . فصول من تاریخ العراق الحدیث ، مس .بیل ، ترجمة جعفر خیاط ، ل 319 .
72. . یادی قارەمانێکی کوردو سمکۆ شکاك ، کەریمی حسامی ، گۆڤاری بەریانگ ،ژمارە 70-73 ، ساڵی 1991 .

